


ژمارە (٣٤) ساڵی ٢٠١٥

**باس و توێژینەوە بڵاوکــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کــوردی دەربـــڕی بیـــر و بۆچوونـــی توێژەرانـــن نەک دەستەی نووســـەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەسازی: عیسام موحسین.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
  شیلان جەلال.
- چاپ: چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.
- تیراژ: ٧٥٠ دانە.

# لەم ژمارەیەدا

## بەشی کوردی


* دۆخ و ئەرکی بەشەکانی ڕستە ٧
پ. د. وریا عومەر ئەمین
* پۆلێنکردنی چاوگەکان لەڕووی واتاوە ١٩
کازم عەباس عەلی
* ڕۆڵی پاڵنەرەکان لە ئاراستەکردنی ناوەڕۆکی دەقی شیعری بەنموونەی شیعری (سالم) ٧١
مامۆستای یاریدەدەر: ڕێبوار محەمەد ئیسماعیل
* ئیرۆتیک لە شیعری (حەمام)ی شێرکۆ بێکەسدا ١٠٩
د. دەریا جەمال حەوێزی – د. هاوژین صلیوە عیسا
* یەکەمین ژمارەی (خەبات)ی نهێنی لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ ١٧٣
پ. ی. د. ئازاد عوبێد ساڵح
* غەنی بلوریان ژیان و تێکۆشانی سیاسی (١٩٢٤–٢٠١١) ١٩٥
د. هۆشمەند عەلی مەحمود – م. ئیسماعیل عەبدولڕەحمان سەعید
* (ابن أبي الهيجاء)ی هەزبانی و ڕێبازی لە نووسینی مێژوودا ٢٤١
د.مەهدی عوسمان هەروتی
* ڕۆڵی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی خێزان و قوتابخانە لە سەرهەڵدانی نەخۆشییە دەروونییەکان لەلای قوتابیانی پۆلی یانزەمی ئامادەیی ٢٨١
د. ڕۆزە عەبدوڵڵا شەریف
* ئایا «کوێر ئۆغڵی» کورد بووە؟ ٣٢٥
ئەنوەر سوڵتانی


## بەشی عەرەبی – القسم العربي


* موقف برلمان كوردستان من التطورات السياسية في العراق (٢٠٠٣ – ٢٠٠٩ ) ٣٥٧
فريدون عبدالرحيم عبدالله – ا.د. عماد عبدالسلام – لمى عبدالعزيز
* رحلة بنيامين التطيلي (٥٦١–٥٦٩هـ/١١٦٥–١١٧٣م) وخط سيرها في كردستان ٣٨٣
أ.م.د. خطاب إسماعيل أحمد – م. توفيق رشيد يوسف
* التحليل الجغرافي لظاهرة الاستقطاب الحضري في مدينة أربيل ٤٠٧
أ.د. خليل اسماعيل محمد – م.م كامران ولي محمود
* تصنيف الغطاء الارضي في قضاء كويسنجق باستخدام دليل الغطاء النباتي NDVI وNDBI ٤٥٧
د. روستم سلام عزيز
* تقييم جغرافي لتطور وتوزيع الحدائق العامة في مدينة اربيل ٤٧٥
م. عمر حسن حسين الرواندزي
* الاخفاقات المعرفية وعلاقته بادراك الذات لدى الشباب الجامعي (من مستخدمي الفيسبوك وغيرهم) في محافظة اربيل في اقليم كوردستان – العراق ٥٢٥
أ.د. عمر ابراهيم عزيز – داليا دەشتی بایز دزەیی

# ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوە
# لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

١- گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی، گۆڤارێكی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی كورد و كوردستان، بڵاودەكاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێكی دیكە بڵاو نەكرابێتەوە یان بۆ بڵاوكردنەوە وەرنەگیرابێت.
٢- زمانی كوردی زمانی سەرەكی بڵاوكردنەوەیە لە گۆڤارەكە، بەڵام لێكۆڵینەوەی زانستی بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاودەكاتەوە.
٣- هەر بابەتێك كە بۆ گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی دەنێردرێت، دەبێت ناوونیشانی باسەكە، ناوی نووسەر، شوێنی كارەكەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەكەی لە سەر لاپەڕەی یەكەمی لێكۆڵینەوەكە نووسرابێت.
٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەكەی بە هەردوو زمانەكەی دیكە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەكە لە كۆتایی توێژینەوەكە بنووسێت، كە نابێت لە یەك پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەكییەكانی توێژینەوەكە بخرێنەڕوو.
٥- لە دوای پەسەندكردنی باسەكە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستیەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوكردنەوەی بە توێژەر دەدات.
٦- بۆ ئەوەی بابەتەكە لەگەڵ ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوەی گۆڤارەكەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێك بیرۆكەی سەرەكی توێژینەوەكە نەگۆڕێت.
٧- ئەگەر باسەكە لە بارەی ساخكردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەكە بە پێی بنەما زانستییەكان بێت و چەند لاپەڕەی كۆپیكراوی دەستنووسەكە و شوێنی وەرگرتنی، كۆد و جۆری دەستنووسەكە (دەستنووس، چاپ، مایكرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.
٨- ئەگەر ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باسەكە،

تویژینـەوەی بابـەت، شـێوازی بەکارهێنانـی سـەرچاوە و ڕێکخسـتنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێتن، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێتن فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێـت باسـەکە دانەیەکـی لەسـەر (CD) لەگـەڵ (٣) دانـەی چاپکـراوی سـەر کاغـەز (A4) بـە فۆنتـی (١٥) ی یۆنیکورد بێت، بـە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانـی بـە لیسـتی پەراوێـز و سـەرچاوەکانەوە لـە (٢٥) لاپـەڕە زیاتر نەبێت و پەراوێزەکانیشی لە کۆتایی باسەکە دابندرێت.

١٠- ئەگـەر بابەتەکـە وەرگێـڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵییەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرا بێت.

١١- گۆڤـاری ئەکادیمیای کوردی ناسـاندن و هەڵسـەنگاندنی ئـەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# دۆخ و ئەرکی بەشەکانی ڕستە

پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین

ئەکادیمیای کوردی

ڕستە دانەیێکی ڕێزمـانییە لە وشـەیێک یـا زیـاتر پێـک دێـت. بیرۆکەیێکـی تەواوی کاتدار دەردەبڕێ و بە شێوەیێکی گشتی کارێکی تێدا دەبێ. بیـرۆکەکە شێوەی (بـاس، پرسـیار، سەرسـوڕمان، داواکـاری، پێشـنیاز، داخـوازی.. هتـد) دەگرێتەخۆ.

لە ڕووی داڕشتن و پێکهاتنەوە ڕسـتە گەورەتـرین دانەی ڕێزمـانیی زمـانە. ئامـانجی هەرە سـەرەکیی ڕێزمـان لە ئاسـتی ڕستەسـازیدا دەستنیشـانکردنی یاسـاکانی داڕشـتنی ئەو کەرسـتانەی دروسـتی دەکەن و جـۆری پەیوەنـدیی نێوانیان لە ناو چوارچێوەی ڕستەدا.

ڕستە لە چەن بەشێك پێك دێت (بکەر — بـەرکار — بـەرکاری ناڕاسـتەوخۆ — ئاوەڵکار ...هتد)

ڕێزمانی چاولێکەری بۆ هەر یەکە لەمانە پێناسـینی خـۆی هەیـە ... ( بکـەر ئەو ناوە یا ڕاناوەیە، لە ڕستەدا، کە هێمایە بۆ ئەو کەسەی یا ئەو شـتەی کارەکـە ئەنجام دەدات . لە زمانی کوردیدا لە سەرەتای ڕسـتەدا دەردەکـەوێ) و (بـەرکار ئەو دانە زمانییەیە کە کاری ڕستەکەی بە سـەردا تێدەپـەڕێ ..لـە ڕسـتەی زمـانی کوردی دووەم کەرەسەیە) . دەسپێشخەری لە لایەن بکەرەوەیە. واتـا گـەر بکـەر کار نەکا بەرکار نابێ. کوردی زمانێکی SOV یە و ڕیز بوونیان لە ڕستەی زمـانی کوردیدا بەم جۆرەیە (بکەر ــ بەرکار ــ کار) . وەك لە ڕستەی:

**منداڵەکان بەرخەکە دەشۆن.**

(منداڵەکان) کارەکەیان ئەنجام داوە — بکەرە

(بەرخەکە) کارەکەی بەسەردا تێپەڕیوە — بەرکارە

شیکردنەوە و لێکۆڵینەوە دەریدەخات کە ئەم پێناسینە لە کەموکوڕی بەدەر نییە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە ، لەم ڕستەیە ڕامینێ:

**سێوەكە دزرا .**

بەپێی شیكردنەوەی ڕێزمانی (سێوەكە) بكەرە . بەڵام گەر لەڕووی واتاوە لێی بكۆڵرێتەوە دەردەكەوێ كە (سێوەكە) بەر چەمكی (بەركاری) دەكەوێت. چونكە دەبێ كەسێ دزیبێتی. ئەو كەسە بكەرەكەیە.

لەڕستەی

**ڕزگار دەنگی ئازاد دەبیستێن.**

بەپێی شیكردنەوەی ڕێزمانی (ڕزگار) بكەرە و (ئازاد ) بەركارە. بەڵام گەر لەڕووی واتاوە ئەم ڕستەیە شیبكرێتەوە ، دەردەكەوێ كە بە پێچەوانەوەیە. (ڕزگار) بەر چەمكی بەركاری دەكەوێت.و (ئازاد) بەر بكەری. چونكە (ئازادە) یەكەم قسە دەكات و دەسپێشخەرییەكە لەمەوەیە و دەنگەكەی كار لە (ڕزگار) دەكات و دەیبیستێ. ئەگەر (ئازاد) قسە نەكات (ڕزگار) نایبیستێ.

بە هەزاران نموونەی لەم جۆرە لە هەر زمانێكدا بە دەستەوەی بگریت بەرچاو دەكەوێ. ئەمە بووە هۆی ئەوەی زمانناسان (دوو جۆر بكەر و دوو جۆر بەركار) لێك جیا بكەنەوە:

١ – بكەر و بەركاری ڕێزمانی : ئەو بەشانەی ڕستەن كە لەڕووی ڕێزمانییەوە لە شوێنی چەسپیوی خۆیان لە ڕستەدا دەردەكەون.

٢ – بكەر و بەركاری لۆژیكی : ئەو بەشانەن كە واتاكانیان ئەركەكانیان دەستنیشان دەكەن و لە شوێنی ڕێزمانیی خۆیان دەرناكەون.

لەو ڕستەیەی سەرەوە ( **سێوەكە دزرا**) ، (**سێوەكە**) بكەرێكی ڕێزمانییە و بەركارێكی لۆژیكییە.

لە ڕستەی (**ڕزگار دەنگی ئازاد دەبیستێت.**) ، (**ڕزگار**) بكەرێكی ڕێزمانییە و بەركارێكی لۆژیكییە. و ( **ئازاد**) بكەرێكی لۆژیكی و بەركارێكی ڕێزمانییە.

لە ڕستەی ( **ئازاد ڕۆژنامەكە دەخوێنێتەوە**) ، (**ئازاد**) بكەرێكی ڕێزمانی چونكە زمانی كوردی لە ڕووی تایپۆلۆجییەوە زمانێكی SOV یە ، شوێنی بكەریی گرتووە . لە هەمان كاتدا بكەرێكی لۆژیكییە چونكە كارەكە ئەنجام دەدات .

(**ڕۆژنامـــە**) بـــەركارێكی ڕێزمانییـــە چـــونكە زمـــانی كـــوردی لـــە ڕووی تایپۆلۆجییەوە زمانێكی SOV یە لە ناو ڕستەكەدا شوێنی بەركایی گرتووە . لـە هەمان كاتدا بەركارێكی لۆژیكییە چونكە كارەكەی بەسەردا تێپەڕیوە

لەڕستەی (**ڕۆژنامەكە خوێنرایەوە**) ، (**ڕۆژنامەكە**) بكەرێكی ڕێزمانییە چونكە شوێنی ڕێزمانیی بكەری گرتووە لە ڕستەكەدا. بەلاَم (بەركارێكی لۆژیكییە) چونكە لەڕووی واتاوە (**ڕۆژنامەكە**) بەركارە و كەسیَ خوێندوویەتییەوە..

لەم ڕستانەدا:

**١ – ئازاد دەرگاكەی بە كلیلەكە كردەوە.**

**٢ – كلیلەكە دەرگاكەی كردەوە**

**٣ – دەرگاكە كرایەوە**

لە ڕستەی (١) دا

**ئـــازاد**: بكـــەری ڕێزمـــانی و لۆژیكییـــە. چـــونكە زمـــانی كـــوردی لـــە ڕووی تایپۆلۆجییەوە زمانێكی SOV یـە لـە نـاو ڕسـتەكەدا شـوێنی خـۆی گرتـووە . لـە هەمان كاتدا بكەرێكی لۆژیكییە چونكە كارەكەی ئەنجام داوە .

**دەرگاكە** : بەركارێكی ڕێزمانی و لۆژیكییە. ڕێزمانییە چونكە زمانی كـوردی لـە ڕووی تایپۆلۆجییـەوە زمـانێكی SOV یـە لـە نـاو ڕسـتەكەدا شـوێنی خـۆی گرتـووە . لـە هـەمان كاتـدا بـەركارێكی لۆژیكییـە چـونكە كارەكـەی بەسـەردا تێپەڕیوە .

**بە كلیل**: بەركاری ناڕاستەوخۆیە.

لـە ڕسـتەی (٢) دا (**كلیلەكـە**) بكـەری ڕێزمانییـە و بـەركاری ڕاسـتەوخۆی لۆژیكییە. (**دەرگاكە**) بـەركاری ڕاسـتەوخۆی ڕێزمانییـە و بـەركاری ناڕاسـتەوخۆی لۆژیكییە.

لە ڕستەی (٣) دا:

**دەرگاكە** : بكەری ڕێزمانییە و بەركاری ناڕاستەوخۆی لۆژیكییە.

**بەم جۆرە دەردەكەویَ كە :**

بکـەری ڕێزمـانی ئـەو دانـە ڕێزمانییەیـە کـە  بـەپێی یاسـا سینتاکسـییەکانی زمانەکە لە ڕستەدا شوێنی بکەر دەگرێ. بکەری لۆژیکی ئەو دانە ڕێزمانییەیـە کـە کاری ڕستەکە ئەنجام دەدات و مەرج نییە شوێنی ڕێزمانیی خۆی بگرێ.

بـەرکاری  ڕێزمـانی ئـەو دانـە ڕێزمانییەیـە کـە لـە ڕسـتەدا بـەپێی یاسـا سینتاکسییەکانی زمانەکە لە ڕستەدا شوێنی بەرکار دەگرێ. بەرکاری لۆژیکی ئـەو دانە ڕێزمانییەیە کە کاری بە سەردا تێدەپـەڕێ  مـەرج نییـە لـە شـوێنی ڕێزمـانیی خۆی دەرکەوێ.

**دۆخ**

ڕسـتە لـە هـەموو زمانانـدا لـە ( کـار) و چـەن بەشـێکی تـری وەك ( بکـەر — بەرکار — بەرکاری ناڕاستەوخۆ — ئاوەڵکار — و ...هتد.) پێك دێت . هەریەکە لـەم بەشانە ئەرکێك پێشان دەدا و  هەر یێکێ لەم ئەرکانـە دۆخێکـە Case. دۆخـەکان پەیوەندییە سینتاکسییەکان دەسنیشان دەکەن.




ژمارەی دۆخەکان لە هەموو زمانەکاندا لە بنجدا deep structure وەك یـێکن. لە ڕووی تایپۆلۆجییەوە لە سیمادا  surface structure  جیاوازییـەکی زۆر پێشـان دەدەن لە چۆنیەتی داڕشتنی ڕێزمانییـان. هـەر دۆخـێ نیشـانەی تایبـەتیی خـۆی هەیە. ئەم نیشانەیە ناسنامەی ئەرکەکەیەتی. نیشانەکانی دۆخ  (پێشبەند) ن ..یا (پاشـبەند) ن ، یـا (پێشـبەند و پاشـگرێکی دۆخـی) ن، یـا (شـوێنی بەشـەکە لـە ڕستەکەدا  word order دۆخەکەی دەسنیشان دەکات.

هەر کارە دەسەڵاتی بەسەر ژمارەیێك دۆخ هەیە. بۆ نموونـە دۆخـی (دێـتف) تەنها لەگەڵ ئەو کارانە دەردەکەوێ کە جووڵەی بەرەو هێروەی بکـەر هەیـە (دوور کەوتنەوە لـە بکـەر). وەك ( چـوون بـۆ — هاویشـت — فڕێـدان — ..هتـد). دۆخـی

(ئەبلەتڤ) تەنها لەگەڵ ئەو كارانە دەردەكەوێ كە جووڵەی بەرەو بكەر دەبێ، وەك ( هاتن لە — وەرگرتن — ..). دۆخی (نۆمینەتیڤ) لەگەڵ هەموو كارەكانـدا دەردەكەوێ. دۆخی (ئـەكیوزەتیڤ) تەنها لەگەڵ كـارە تێپەڕەكانـدا دەردەكەوێ...و بەم جۆرە.ئەم جۆرە پۆلكردنە بە Subcategorization ناو دەبرێ.

**دۆخەكان**

١ — **دۆخی بكەری (Nominative)** :

هەر كارێ بە هۆی كەسێ یا شتێ دێتە ئەنجام .. ئەو ناوەی لە ڕستەدا هێمایە بۆ ئەو كەسە یا شتە لە ڕێزمانا (بكەر) ـە.

ئازاد هات. ( ئازاد ئیشەكەی ئەنجام داوە — بكەرە)

رزگار و ئاواز و ئاهەنگ چوون. (رزگار و ئاواز و ئاهەنگ ئیشەكەیان ئەنجام داوە — بكەرن).

لە هەندێ زماندا بكەر نیشانەیێكی لەگەڵدا دەردەكەوێ هێمایە بۆ ئەركەكەی لەناو چوارچێوەی ڕستەكەدا. واتا بارو دۆخی ئەو بەشەی ڕستە دەخاتە ڕوو و ناسنامەكەیێتی لە ناو ڕستەكەدا. وەك لە زمانی عەرەبیدا زەممەی دەكەوێتە سەر. زەممە لەم زمانەدا نیشانەی بكەرییە.واتا (دۆخی بكەری).

لە زمانە ئێرگەتیڤیتییەكاندا بەركار و كار لە كەس و ژمارەدا ڕێك دەكەون .. بكەر نیشانەیێك وەردەگرێ بە ئێرگەتیف ناو دەبرێ وەك لە شێوەزاری كرمانجیی ژووروودا.

ئازاد — ی هوون دیتن

بكەر دوو جۆرە ( ڕێزمانی و لۆژیكی) .. بكەری ڕێزمانی ئەو دانە ڕێزمانییەیە كە لە ڕستەدا بەپێی یاسا سینتاكسییەكانی زمانەكە لە ڕستەی ئاساییدا شوێنی بكەر دەگرێ. بكەری لۆژیكی ئەو دانە ڕێزمانییەیە كە كاری ڕستەكە ئەنجام دەدات و مەرج نییە شوێنی ڕێزمانی بگرێ.

لە ڕستەی ( **ئازاد ڕۆژنامەكە دەخوێنێتەوە)**

(**ئـازاد**) بكـەرێكی ڕێزمـانی و لۆژیكییـە. چـونكە زمـانی كـوردی لـە ڕووی تایپۆلۆجییەوە زمانێكی SOV یە لە ناو ڕستەكەدا شـوێنی خـۆی گرتـووە . لـە هەمان كاتدا بكەرێكی لۆژیكییە چونكە كارەكە ئەنجام دەدات .

(**ڕۆژنامە**) بەركارێكی ڕێزمانی و لۆژیكییە. ڕێزمانییە چونكە زمـانی كـوردی لـە ڕووی تایپۆلۆجییـەوە زمـانێكی SOV یـە لـە نـاو ڕسـتەكەدا شـوێنی خـۆی گرتـووە . لـە هـەمان كاتـدا بـەركارێكی لۆژیكییـە چـونكە كارەكـەی بەسـەردا تێپەڕیوە .

لە ڕستەی (**ڕۆژنامەكە خوێنرایەوە**) ، (**ڕۆژنامەكە**) بكەرێكی ڕێزمانییە چونكە شوێنی ڕێزمانیی خۆی گرتووە لە ڕستەكەدا. بەڵام (بەركارێكی لۆژیكییـە) چـونكە لەڕووی واتاوە (**ڕۆژنامەكە**) بەركارە.

لەم ڕستانەدا:

**١ – ئازاد دەرگاكەی كردەوە.**

**٢ – دەرگاكە كرایەوە**

لە ڕستەی (١) دا

**ئـازاد** : بكـەری ڕێزمـانی و لۆژیكییـە. چـونكە زمـانی كـوردی لـە ڕووی تایپۆلۆجییەوە زمانێكی SOV یە لە ناو ڕستەكەدا شـوێنی خـۆی گرتـووە . لـە هەمان كاتدا بكەرێكی لۆژیكییە چونكە كارەكەی ئەنجام داوە .

**دەرگاكە**: بەركارێكی ڕێزمانی و لۆژیكییە.ڕێزمانییە چـونكە زمـانی كـوردی لـە ڕووی تایپۆلۆجییـەوە زمـانێكی SOV یـە لـە نـاو ڕسـتەكەدا شـوێنی خـۆی گرتـووە . لـە هـەمان كاتـدا بـەركارێكی لۆژیكییـە چـونكە كارەكـەی بەسـەردا تێپەڕیوە .

لە ڕستەی (٢) دا:

دەرگا : بكەرێكی ڕێزمانییە و بەركارێكی لۆژیكییە.

**٢ – <u>دۆخی بەركاری (Accusative)</u>:**

دەشێ كارەكە بەسەر كەسـێ یـا شـتێ تێپـەڕێ بـە شـێوەیێكی ڕاسـتەوخۆ كاری تێبكات . ئەو ناوەی لە ڕستەدا هێمایـە بـۆ ئـەو كەسـە یـا شـتە لـە ڕێزمانـا (بەركار) ـە.

ئـازاد سـێو دەخـوات ( ئـازاد كارەكـە ئـەنجام دەدات — بكـەرە / كارەكـە تێدەپەڕێتە سەر شتێكی تر و دوخورێت — سێو بەركارە)

لە هەندێ زماندا بەركار نیشانەیێكی لەگەڵدا دەردەكەوێ هێمایە بۆ سروشتی ئەركەكەی لەناو چوارچێوەی ڕستەدا. واتا بارو دۆخی ئەو بەشەی رسـتە دەخاتـە ڕوو و (ناسنامەكەیێتی) لە ناو رسـتەكەدا لـە ڕێزمانـدا. وەك لـە زمـانی عەرەبیـدا (فتحـە) ی دەكەوێتـە سـەر . (فەتحـە) لـەم زمانـەدا نیشـانەی (بەركارییـە).واتا (دۆخی بەركاری).

زمان هەیە بكەرو بەركار هیچ نیشانەیێكیان لەگەڵدا دەرناكەوێ. لـەم بـارەدا (شوێنیان لە ناو ڕسـتەكەدا ئەركـەكانیان دەستنیشـان دەكـەن). لـە كوردیـدا كـە دەڵێی:

ئازاد رزگار دەبینێ.

ئازاد ( بكەر ) ـە، رزگار ( بەركار )ـە.

(ئازاد و رزگار هیچ نیشانەیێكیان پێـوە نەلكاوە.سروشـتی ریزبوونیـان لـەناو رستەكەدا ئەركەكانیان دەسنیشان دەكەن. ئەگـەر شـوێنەكانیان ئـاڵوگۆڕ كـران ، ئەركەكانیشیان ئاڵوگۆڕ دەبن.

رزگار ئازاد دەبینێ.

ئەمـە ئـەوە دەگـەیێنێ كـە نیشـانەی دۆخـی بكـەری و بـەركاری لـە زمـانی كوردیدا ( ریز بوونی وشەكانە).

لەڕووی تایپۆلۆجییەوە زمانانی جیهان دەبنە سێ جۆر.

١ — ئەو زمانانەی بە نیشانە ئەركی بەشەكانی رستە دەسنیشان دەكرێن.

٢ — ئەو زمانانەی بە ریزبوونی وشەكان ئەركەكانیان دەستنیشان دەكرێن.

٣ — ئەو زمانانەی تێكەڵن و بە تەواوی بەر یەك لەو دوو جۆرە ناكەون.

تێكـەڵی و چـوونە ناویـەك و ئاڵۆزییـەكی زۆر لـە زۆربـەی زمانەكانـدا بـەدی دەكرێ وەك ئەوەی لە زمانی كوردی .

## دۆخەكانی ناراستەو خۆیی

ئەگەر كاری بكەر تێپەڕێتە سەر زیاتر لە یەك كەس یـا شـت بـە دوو قۆنـاغی جیا .ئەو ناوەی هێمایە بۆ كارتێكراوی دووەم بـە (بـەركاری دووەم) یـا (بـەركاری ناڕاستەو خۆ) ناو دەبرێ

بـەرکاری دووەم لــە زمانــە پێشــبەندییەکاندا بــە پێشــبەند دەستنیشــان دەکرێت.

**ئازاد نامە بۆ ئاواز دەنێرێت.**

لێـرە (ئـازاد) بکـەرە ، (نامـە) بـەرکاری یەکەمـە (ڕاسـتەوخۆیە) و (ئـاواز) بەرکاری دووەمە (ناڕاستەوخۆیە). پێشبەندی (بۆ) ئەرکەکەی دەستنیشان کرد.

لە زمانی عەرەبیدا لەگەڵ هـەبوونی پێشـبەنددا نـاوی بـەرکاری ناڕاسـتەوخۆ نیشانەییێکیش وەردەگرێ ، کە (کسرە) یە.

**ارسل محمد الكتاب الى الولد**

لە زمانە پاشبەندییەکادا نیشـانەی ( بـەرکاری) و (بـەرکاری ناڕاسـتەوخۆیی) بـە پاشـبەند خۆیـان دەردەخـەن. وەك لـە زمـانی تورکیدا.لـە زمـانی کوردیـدا بـە پێشبەند ئەم دۆخە دەردەبڕێ.

**من گوڵەکەم دا بە کچەکە.**

ئەمە گەلێ جۆر دۆخی لێ دەبێتەوە (دێتڤ – ئەبلـەتڤ ...) وەك ئەبلـەتڤ و دێتڤ و.....

٣ – <u>**دۆخی لەیی** ( Ablative)</u>

ئــەو کارانــەی کــە چــەمکی گوێزانــەوەیان هەیە..بــەرەوەی direction گوێزانەوەکە چەمکی دۆخەکە دەسنیشان دەکات.

ئەگـەر بـەرەو شـتەکە یـا بکەرەکـە هـات ئـەوە دەبێتـە دۆخـی ئەبلـەتڤ Ablative . نیشانەی ئەم دۆخە لە زمانی کوردیـدا (لـە – ئاوەڵکـار – ەوە) وەك لە:

ئازاد لە کەرکوکەوە هات.

من لە پارەوە لێرە دەژیم

٤ – <u>دۆخی بۆیی ( Dative):</u>

ئەگەر بەرەوەکە بە پێچەوانەوە بوو دەبێتە دۆخی Dative . ئەم دۆخە لـە زمانی کوردیدا بە پێشبەندی ( بۆ – بە ) دادەڕێژرێت بێ هـیچ نیشـانەیێك بچـێتە سەر ئاوەڵکارەکە.

ئازاد چوو بۆ بازاڕ.

لەگەڵ ئەو کارانەی چەمکی گوێزانەوە دەگەیێنن دەشێ پێشبەندی (بۆ) بە پاشبەندی ( ـە ) جێگیر بکرێ.

ئازاد چووە بازاڕ.

**٥ – دۆخی ئاوەڵکاری شوێنی و کاتی (Locative) :**

هەر کارە لەشوێن و کاتێکدا ڕوو دەدات. ئەو بەشەی ئەم لایەنە دەردەبڕن (ئاوەڵکار) ن. ئەوەی شوێنەکە دەستنیشان دەکات (ئاوەڵکاری شوێنییە) و ئەوەی کاتەکە دەستنیشان دەکات (ئاوەڵکاری کاتییە).

زمان هەیە تیایدا ئەم چەمکە تەنها به پێشبەند دەبڕێ وەك ئینگلیزی:

He lives in Kirkuk

He was born in Hawler

زمان هەیە تەنها بە پاشبەند دەریدەبڕێ وەك تورکی:

زمان هەیە بە پێشبەند و پاشبەند ئەم لایەنە خۆی دەردەخات وەك زمانی کوردی. لە زمانی کوردیدا ئەم بەشەی ڕستە بە پێشبەندی (لـە) و پاشبەندی (ــدا) دەردەکەوێ.

لە + ناوی شوێن/کات + دا

لە + سلێمانی + دا

لە ساڵی ( ١٩٩٣) دا لە دایك بوو

**٦ – دۆخی ئامێری (Instrumental):**

لە ئەنجامدانی هەر کارێك بەهۆی ( ئامێرێ یا شتێ یا کەسێ) ، ئەو دۆخە بە (ئامێری) Instrumental ناو دەبرێت. ئەم دۆخە لە زمانی کوردیدا بە پێشبەندی (بە) دادەڕێژرێت. وەك لە:

ئازاد بە بەرد گوێز دەشکێنێ

ئیشەکەی بە ئێمە جێبەجێ کرد.

....هتد

ئەرکی لۆژیکییە دۆخەکە لە بنجدا دەسنیشان دەکات. لە هەندێ زماندا هەندێ لەو دۆخانە لە سیمادا نیشانەیان دەبیت. تێکەڵی و چووە ناویەك و ئاڵۆزی لە زمانەکاندا لەم ڕووەوە بەدی دەکرێ.

واتا ژمارەی دۆخە ڕێزمانییەکان لە سیمادا جیاوازە لە زمانە جیاوازەکاندا . بۆ نموونە:

١ – زمانی فنلندی ١٦ دۆخی ڕێزمانیی هەیە:

nominative - accusative - genitive - partitive - essive - translative - inessive - elative - illative - adessive - ablative - allative - abessive - comitative - instructive.(

٢ – زمانی ڕووسی ٦ دۆخی هەیە:

Nominative - Genitive – Dative – Accusative – Instrumental - Prepositional

٣ – زمانی عەرەبی ٣ دۆخی هەیە:

مرفوعیە – منصوبیە – مجروریە

٤ – زمانی ئینگلیزی ٣ دۆخی هەیە. تەنها لە ڕاناودا دەردەکەون:

Subjective. - Objective - Possessive

٥ – زمانی تامیل ٨ دۆخی هەیە:

Nominative – Accusative – Instrumental – Dative – Ablative – Genitive – Locative – Vocative

....هتد

وەك دەردەکەوێ لە سیمادا Surface Structur جیاوازییەکی زۆر پێشان دەدەن لە ژمارەی دۆخەکان بەڵام لە بنجدا Deep Structure هەموو هاوژمارە و دەقاودەقن.

## سەرچاوەکان

- Brown, E.K. and Miller, J. E. (1991) A linguistic Introduction to Sentence Structure. 2nd ed. Harper Collins. London.
- Cook, V.J. and M, Newson (1996) Chomsky's Universal Grammar , 2nd ed. Blackwell.
- Palmer, F. (1994) Grammatical Rules and Relations. Cambridge University Press.
- Radford, A.(1997) Syntax – A minimalist introduction. Cambridge University Press.
- **وریا عومەر ئەمین** (١٩٨٥) ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی دۆخەوە، گ. نووسەری نوێ. ژ (٢) و (٣).
- ---------- (٢٠١٥) ئەرکی ڕێزمانی و لۆژیکی، ڕ. بەدرخان ژ (١٧٢) ی ٢٠١٥/٢/٢٢.
- ---------- (٢٠١٥) زاراوەی دۆخ، ڕ. بەدرخان ژ (١٧٤) ی ٢٠١٥/٤/٢٢.

## المستخلص

### الحالة الاعرابية و وظيفة اجزاء الجملة

أ.د. وريا عمر أمين
ألاكاديمية الكردية

الجملة تعبير لغوي تتكون من كلمة او اكثر وتعبر عن فكرة تامة تحتوي على الفاعل والمفعول تعبر خبرا او سؤالا او تعجبا او امرا..الخ.

تتكون الجملة من عدة اجزاء ترتبط ببعضها بقواعد وقوانين ثابتة. لكل جزء من هذه الاجزاء وظيفة معينة تسمى بالـ (حالة – Case )، كالحالة الفاعلية او المفعولية والمحلية واداة والتملك..الخ حيث يصل عددها في بعض اللغات الى ستة عشر حالة في البنية السطحية ... لبعض هذه الحالات علامات تدل على وظائفها وعلاقتها ببقية اجزاء الجملة في البنية السطحية.

نمط تلك الوظائف والعلاقات تختلف في البنيتين (السطحية والعميقة). عدد الحالات في البنية التحتية متطابقة في جميع اللغات ، اما في البنية السطحية فهي متباينة. ..

هذا البحث محاولة لالقاء الضوء على هذا الجانب في اللغة الكردية.

## ABSTRACT

### Case and the function of the parts of the sentence

Professor Dr. Waria Omar Amin
Kurdish Academy

The sentence is defined as a word or group of words that expresses a complete idea, typically containing a subject and predicate, conveying a statement, question, exclamation, or command, and consisting of a main clause and sometimes one or more subordinate clauses.

Structurally a sentence consists of a verb and one or more NPs. Each NP bears some grammatical and semantic relations to the rest of the sentence. Some of these NP are overtly marked to indicate their function. i.e. their cases.

This paper is an attempt to distinguish between grammatical and logical function of the NPs , and to specify the cases they specify.

# پۆلێنکردنی چاوگەکان لەڕووی واتاوە

**کازم عەباس عەلی**
قوتابخانەی شادی بنەڕەتی

## پێشەکی

ئەم توێژینەوەیە بەناونیشانی (پـۆلێنکردنی چـاوگەکان لـەڕووی واتاوە)یـە، هۆکاری هەڵبژاردنم بـۆ ئـەم بابەتـە، ئـەو جیاوازییانەیـە کـە لـەنێوان پـۆلێنکردنی سەرچـاوەکان و پرۆگرامـەکانی خوێندنـدا هەیـە، چـونکە شـێوەی پۆلێنکردنـەکان لەئێسـتادا هـەروەك دیـارە نەبۆتـە شـێوە پـۆلێنکردنێکی یەکلاکـەرەوە، بـەڵکو تایبەتمەنـدیی شـێوەزار و بـیر و بۆچـوونی زمانـەوان و سـەردەمی نووسـینەکان، ئاست و شێوەی پۆلێنکردنەکانی دەستنیشان کردووە.

– ئامانج لەم توێژینەوەیەدا شێوە پۆلێنکردنێکی گشتگیرە بۆ چاوگەکان، تا جێگـەی شـێوە پۆلێنکردنـەکانی تـر بگرێتـەوە، چـونکە ڕەچـاوی تایبەتمەنـدی و جیاوازیی شێوەزارەکان و ئـەرکی پێشـگرو پاشـگرەکانی تیـاداکراوە، لەڕوانگـەی داهێنـانی واتـای تـازەو گـۆڕینی واتـا لەسـەر چـاوگە سـادەکان، چـونکە بەبەراوردکردنی ئەو ئەرکانەی کە پێشگر و پاشـگرەکان دەیبیـنن لەدروسـتکردنی چاوگدا، داهێنان و گۆڕینی واتا دەبنە دووچەمکی جیاواز بۆ دوو مەبەسـتی جـودا، بەجیاکردنەوەی ئـەم دوو چـەمکەش جۆرەکـانی چـاوگ دەستنیشـان دەکرێـت، چـونکە بەدەردەکـەوێت کـە پێشـگر و پاشـگرەکان لـەڕووی ئەرکـەوە وەك دوو تاخمی جیا بەدەردەکەون، هەر تاخمێکیان ئەرکێکی تایبـەت جێبـەجێ دەکـەن، هەنـدێکیان مەبەسـت لـەدانانیان داهێنـانی واتایـەکی تازەیـە یـا بزووتنەوەیـەکی جیاواز بەچاوگە سادەکان دەدەن، هەندێکی تریان واتاگۆڕی بە چـاوگە سـادەکان دەکـەن، بـۆ چـەند مەبەسـتێکی دیـاریکراو، مەبەسـتەکانیش دووبارەکردنـەوەو بـەردەوامی و گەڕانـەوەو پێچـەوانەیی و تێپەڕکردنـە یـا گونجـان و تایبەتمەنـدی شێوەزارە، ئەم مەبەستانەش لەواتای چـاوگە سـادەکان دوور ناکەونـەوە، چـونکە

واتایەکی تازەو جیاواز بەچاوگە سادەکان نادەن تا ببنە چاوگی ناسادە، بەلاّم لەبەر ئەوەی تا ئێستا جیاوازی لەنێوان داهێنان و گۆڕینی واتادا نەکراوە، پێناسەو ئەرك و دەورو ڕۆڵی پێشگرو پاشگرەکانیش لەیەکتر جیانەبۆتەوەو هەر بەتێکەڵی ماونەتەوە، بۆیە ئێمە لەڕوانگەی ئەم جیاوازییەدا و لەڕووی واتاوە شێوە پۆلێنکردنێکی جیاوازمان ئەنجام داوە.

بەگشتی توێژینەوەکە دابەش دەبێت بۆ دوو تەوەری سەرەکی:

**یەکەم** : بەراوردکردن و بەدەرخستنی جیاوازی و هۆکارەکانە لەنێوان پۆلێنکردنەکانی ڕابوردوو لەگەڵ ئەم شێوە پۆلێنکردنەی کەئێمە دەیکەین لەڕووی واتاوە.

**دووەم** : جیاکردنەوە و بەدەرخستنی مەبەست و ئەرك و دەورو ڕۆڵی ئەو پێشگر و پاشگرانەیە کە دەچنە سەرچاوگە سادەکان و جۆرەکانی تری چاوگ دروست دەکەن.

لەکۆتاییدا لیستی پەراوێزەکان و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە لەگەڵ پوختەی باسەکە بەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراوەتە ڕوو.

**دابەشکردنی چاوگەکان لە سەرچاوەکاندا:**

– مامۆستا نووری عەلی ئەمین دەڵێ، چاوگ ئێسکی فرمانە و تام و بۆی ناو ئەدا، تەماشای کاتی تیاناکرێ، چاوگەکانی دابەشکردووە بۆ سادە و لێکدراو، (سادە) ئەو چاوگەیە کە ڕیشەیەکی هەیە و کۆتایی بە یەکێ لەم پیتە پاشگرانە دێ (ان، ین، تن، دن، وون) وەك (کێلان، پژمین، نووسین، بردن، جوون) (لێکدراو)یش ئەو چاوگەیە کە لەڕیشەیەك پتری هەیە وەك (سەربڕین، ڕێ پێ گرتن، دا گرتن، لەدایك بوون) هەروەها دەلوێ لە (ناوێك، ئاوەڵناوێك، ئاوەڵکارێك، ئامرازێکی پەیوەندی سادە یا لێکدراو و چاوگێکی سادە)، پێك بێت[1].

– ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی کۆڕی زانیاری کورد دەڵێ: چاوگ ئەو وشەیەیە، کە واتای کاری کاری تێدا بێت بە بێ کات لەڕستەدا، دەشێت بەشێوەیەك دەربڕێت کە جێگەی کار بگرێتەوە، لەو ڕووەوە کە ئەویش وەك کار بکەر و بەرکاری هەبێت، ئەم یەك خێزانییە و پێوەندی چاوگ و کار وای کردووە چی دەربارەی کار گوتراوە لەڕووی فۆڕم و واتاوە سەرلەبەری بۆ چاوگ بگوترێت،

ئەویش وەك كار سادە و ناسادە و بەهێز و بێ هێزی هەیە[٢] لەڕووی فۆرمەوە دەكرێ بە دوو بەش، سادە و ناسادە، (سادە) ئەو چاوگەیە كە لە وشەیەك پێكهاتووە و چ زیادەیەكی وەك پێشگر و پاشگری تێدا نییە وەك (خواردن، نووستن، وەرین، برژان، چوون) چاوگی (ناسادە)ش هەروەك كاری ناسادە دابەشكراوە بۆ چاوگی (داڕێژراو، دروستكراو)- لێكدراو- ئاوێتە)، (داڕێژراو) بریتییە لە چاوگ و پێشگر یا پاشگر یا پێشگر و پاشگر بەمەرجێ واتایەكی تازە پێك بهێنێت وەك (هەڵكردن، تێهەڵچوونەوە، خواردنەوە، ڤەخارن، كردنەوە، ڤەكرن.....تاد)، (لێكدراو)یش بریتییە لە چاوگ و وشەیەكی واتادار كە لەپێشەوە بێت وەك (سەربڕین، دەستكەوتن)، (ئاوێتە)ش ئەو چاوگەیە كەوا سەرەڕای كار وشەی واتادار و پێشگر یا پاشگری تێدا بێت وەك (دەست پێ كردن، دوور كەوتنەوە، پێ لێ هەڵ بڕین، ڕوون كردنەوە، تێ بەربوون)[٣].

- دكتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف دەڵێ: چاوگ یان فۆرمی دیارنەخراو ئەگەرچی پێكهاتن و تایبەتیی خۆی هەیە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا سەر بەفۆرمە گەردان نەكراوەكانی كردارەو واتای ڕوودان ڕادەگەیەنێ، بێ ئەوەی ئیشارەت بۆ پێوەندیی بەڕێژە یان كات یان كەس یان ژمارەوە بكات، لەم ڕووەوە چاوگ وەك ناوی مەعنەوی لەكاردایە، بەلاّم ئەم پرۆتسێس (كردەوە) نیشاندەدا و هەرچی ناویشە شت دیاری دەكا[٤] كردار (چاوگ) وەك ناو و ئاوەڵناوە لەڕووی ڕۆنانەوە دابەش دەبێ بەسەر سادە و ناسادە، ناسادەش بەسەر داڕێژراو و لێكدراو، كرداری (سادە) وەك (بوون، چوون، دان، نان، جوون، دروون، سوون، مان، كردن، بردن، هاتن)، بۆ ڕۆنانی كرداری (داڕێژراو) هەندێ پێشگر و پاشگر هەن دەچنە سەر كرداری سادە و دەیكەنە كرداری داڕێژراو، لە پەراوێزەكەیشدا دەڵێ هەرچەندە كرداری داڕێژراو بە یارمەتیی پێشگر و پاشگر پێك دێ، بەلاّم لەم كارەدا پێشگر دەوری گرنگترە[٥] كرداری (لێكدراو)یش بە یاریدەی ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵكردار و ژمارە و ئامراز پێك دێ[٦].

- د. تارا عەبدوڵلا چاوگی لە ڕووی ڕۆنانەوە بۆ دوو بەش دابەشكردووە (سادە و ناسادە)،(سادە) وەك (شكان، بردن، كەفتن، كردن) (ناسادە)ش بۆ داڕێژراو وەك (هەلكردن، تێكردن، هاتنەوە، نیشتنەوە) (لێكدراو) وەك

(سەرکردن، باڵدان، سەرگرتن) (ئاوێتە) وەك (دەسپێکردن، چەو لەچەوبڕین، پڕکردنەوە)[7].

– لەکتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی دەڵێ چاوگ لە رووی داڕشتنەوە دەکرێت بە دوو جۆر، سادەو نادسادە، (سادە) ئەو چاوگەیە کە تەنیا لە یەك وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکهاتووە وەك (نووسین، خوێندن، نووستن، کێلان، بوون، کردن)، (ناسادە)ش دەکرێت بەدوو جۆر، چاوگی (داڕێژراو) ئەو چاوگەیە کە لە چاوگی سادە لەگەڵ پێشگرێك یا پاشگرێك یا لەگەڵ هەردووکیان پێکهاتووە وەك (هەڵبوون، ڕاکردن، بەرکەوتن، لێدان، خواردنەوە، خوێندنەوە، هەڵبوونەوە، ڕاکردنەوە، لێدانەوە)، چاوگی (لێکدراو) ئەو چاوگەیە لەچاوگێکی سادە یا داڕێژراو لەگەڵ وشەیەکی واتاداری تر یا پتر پێکهاتووە هەروەها گرێی ناوی و هاوەڵناوی و هاوەڵکاری لەگەڵ چاوگی داڕێژراویش چاوگی لێکدراو پێك دەهێنن وەك (یارمەتی دان، دەست گرتن، گەورەکردن، گەرم بوون، دەست هەڵ گرتن، سەر هەڵ بڕین، ڕاستکردنەوە، چاکبوونەوە، بەخێوکردن، بەهێزکردن، لەناڤ چوون، لەناوبردن)[8].

**بەراوردی دابەشکردنەکان:**

**یەکەم** / سادەیی و ناسادەیی چاوگەکان خاڵێکی لەیەکچووە.

**دووەم** / دابەشکردنی چاوگە ناسادەکان و هەژمارکردنی پێشگرە داڕێژەرەکان خاڵێکی جیاوازییە.

**سێیەم**/ ئەگەر بەراوردی پێناسەی چاوگە ناسادەکان بکەین، هەندێك لایەنی نادیار و تێکاڵاومان بۆ بەدەردەکەوێت، چونکە هیچ جیاوازییەك لەنێوان داهێنانی واتای تازەو گۆڕینی واتادا نەکراوە لەسەر چاوگە سادەکان.

**داهێنانی واتا:**

بەواتای ئەوە دێت کە پێشگرە داڕێژەر و لێکدەرەکان لەسەر چاوگە سادەکان، واتایەکی جیاواز و تازە دادەهێنن و لەواتای چاوگە سادەکان دووردەکەونەوە.

**گۆڕینی واتا:**

بەواتای ئەوە دێت کە پێشگر و پاشگرەکان لەسەر چاوگە سادەکان، نابنە هۆی داهێنانی واتای تازە و بزووتنەوەی جیا بەپێچەوانەی پێشگرە دارێژەر و لێکدەرەکان، بەڵکو واتاگۆڕی بەواتای چاوگە سادەکان دەکەن بۆ چەند مەبەستێکی دیاریکراو، مەبەستەکانیش (دووبارە بوونەوە و بەردەوامی — گەڕانەوە و پێچەوانەیی – تێپەڕاندنە ) یا پێشگرو پاشگرەکە تایبەتمەندی و گونجانی شێوەزارە یا بنچ و بناغەی ڕەگی چاوگەکەیە، ئەم مەبەستانەش هەرگیز لەواتای چاوگە سادەکان دوور ناکەونەوە، چونکە هەر هەمان کارە بەهەمان مەبەست و واتا، بەڵام جارێکی تر و بەشێوازێکی تر ئەنجامی دەدەیتەوە.

**پێشگر و پاشگرەکان:**

بەگوێرەی ئەو ئەرکانەی کە لەدروستکردنی چاوگدا دەیبینن، دابەش دەبن بۆ دوو تاخمی سەرەکی، هەندێکیان واتای تازە دادەهێنن، هەندێکی تریان بۆ چەند مەبەستێك واتاگۆڕی بە چاوگەکان دەکەن.

**تاخمی یەکەم :**

ئەو پێشگرانەن کە دەبنە هۆی داهێنانی واتای تازە لەسەر چاوگە سادەکان یا بزووتنەوەی جیا بەچاوگە ناسادەکان دەکەن.

**ا– پێشگرە دارێژەرەکان:**

ئەو پێشگرانەن کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەبەکارهێنان و دەربڕینـدا واتایەکی سەربەخۆیان نییە، بەڵام لەگەڵ چاوگە سادەکاندا واتایەکی تازە دادەهێنن و چاوگی دارێژراو دروست دەکەن وەك (**دا، ڕا، بەر، وەر، هەڵ، وێ – وێك، ڤێ – ڤێك، پێ – پێك، ژێ – ژێك، لێ – لێك، تێ – تێك**) + (**چاوگی سادە**)= **چاوگی ناسادەی دارێژراو**

– جێگای گومان نییە کە پێشگرە دارێژەرەکان لەبنەڕەتدا مەبەست و واتایەکی تایبەتییان هەبووە، بەڵام بە تێپەڕینی کات و لەئەنجامی کورتبوونەوە و دوورکەوتنەوەی پێشگرەکان لەدەستەواژە بنەڕەتییەکانیان، لەئێستادا پەیوەستی ئەو مەبەست و واتایانە نابنەوە، بۆیە وەك دەستەواژەیەکی بێ واتای

تایبەت بەدەردەکەون، ئەگەرچی لەهەندێ حاڵەتدا مەبەستە بنەڕەتییەکانیان لەشێوەی بزووتنەوەیەکی تایبەت بەدەردەخەنەوە.

– لە ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی کۆڕی زانیاری کورد ئەم پێشگرانە دەستنیشانکراون کە چاوگی داڕێژراو دروست دەکەن وەك (هەڵ (هل)، دا، ڕا، تێ، پێ، لێ (ژێ))، (ڤە – وە) – ڤێ، وەر، پێك، لێك، تێك) پاشگریش ( ەوە، اندن)

بەکارهێنانی ئەم پێشگرانە (هەڵ) بۆ بزووتنەوەی سەرەو ژوورە، (دا) بۆ بزووتنەوەی بەرەو خوارە،(ڕا) بۆ بزووتنەوەی ئاسۆیی، (تێ) بۆ بزووتنەوەی ناوەوە،(وەر) بزووتنەوەیەکی کەوانەیی و بازنەیی تێدایە، بەڵام لەگەڵ هەریەکێك لەم واتا تایبەتییانەدا بۆ مەبەستی تریش بەکار دێن[٩].

– دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف پێشگرەکانی بۆ سادە و ناسادە دابەش کردووە، پێشگرە سادەکان وەك (ڕا، هەڵ، دا، ڕۆ، وەر، ڕێ، پێ، تێ، لێ، ژێ، وێ، ڤێ، ڤە) پێشگرە ناسادەکان وەك (پێدا، پێوە، تێوە، تێڤا، پێڕا، لێڕا، پێك، تێك، لێك، وێك، ڕێك ) پاشگریش وەك (ەوە، اندن).

(ڕا) بزووتنەوەی بەرەو پێشەوە، (هەڵ) بۆ بزووتنەوەی بەرەو ژوورە، (وەر) پێچکردنەوەو هەڵگێڕانەوەو گۆڕین و گوێزانەوەی تێدایە، (پێ) بزووتنەوەی ڕوودانێك بەرەو بەرکارێك ڕادەگەیەنێ، (تێ) بزووتنەوەی ڕوودان بەرەو شوێنێکی دیاریکراو نیشان دەدا (ڕۆ، ڕوو) بەگشتی بزووتنەوەی بەرەوخوار یاخود ناوەوە نیشان دەدا، (لێ، ژێ) لە( کرمانجی ژووروو – خواروو) وەك یەکن، بزووتنەوەی ڕوودان بەرەو کەسێك یان شتێك دەدات[١٠].

– لەکتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پێشگرەکان (هەڵ، دا، ڕا، پێ، تێ، دەر، بەر، ڤە، لێ) پاشگرەکان (ەوە، اندن)[١١].

**تایبەتمەندی:**

ا– مەبەست لەدانانیان بەخشینی واتایەکی تازە بێت بەچاوگە سادەکان.

ب– دەستەواژەیەکی بێ واتابێ لەو کاتەی کە دەبێتە پێشگر بۆ دروستکردنی چاوگی ناسادەی داڕێژراو.

ج– لە سێ پیت زیاتر نەبێت.

د- واتـای پێچـەوانەی نـەبێت وەك (دەرەوە × نـاوەوە / سـەر× ژێـر، بـن، خوارەوە / ڕاست × خوار، چەوت، چەپ / پاش، دواوە × پێش / جوان× ناشرین، کرێت / تاریك × ڕووناك......تاد.

**ب- پێشگرە لێکدەرەکان :**

ئـەو پێشـگرانەن کـە بەشـێوەیەکی سـەربەخۆ لەبـەکارهێنان و دەربڕینـدا واتایەکی سەربەخۆ دەدەن، بەشێوەی سادەو ناسادە لەگـەڵ چاوگە سادەکاندا واتایەکی تازە دەبەخشن و چاوگی لێکدراو دروست دەکـەن وەك ( ڕزگـاربوون / سەر بڕین / کاول کردن / سەر شۆڕکردن / دڵشاد بوون / پشت گوێ خستن / پێ شێلکردن....تاد

**بەراوردی پێشگرە داڕێژەرەکان و لێکدەرەکان:**

١- (هەڵ، دا، ڕا، وەر، لێ، لێك، تـێ، تێـك، پـێ، پێـك) لـە هـەژمارکردنیان بەپێشگری داڕێژەر بەبێ جیاوازی بەدەردەکەون لەنێو سەرچاوەکاندا.

٢- (ە وە، اندن) بەبێ جیاوازی بەپاشگری داڕێژەر هەژمار کراون.

٣- هەندێ پێشگری تر جیاوازییان لەنێواندایە لە هەژمارکردنیان بەپێشـگری داڕێژەر یا لێکدەر:

ا- (بـەر) دەکەوێتـە بـەر پێناسـەی پێشـگرە داڕێـژەرەکان و لێکـدەرەکان لەیـەك کاتـدا، چـونکە وەك دەسـتەواژەیەکی سـەربەخۆی واتـادار و بـێ واتـا بەدەردەکەوێت، بۆ نموونە لە (ماڵمان ئەو بەر ئەو بەرە - کێ منی کوشت ئەو دل بـەرە) لە(ئەوبـەر) (ئاوەڵکـاری شـوێنییە ) لـە (دلبـەر) ڕەگـی چـاوگی (بـردن)ە هەروەك لە(بەڕێوەبردن، کڕنۆش بردن....تاد).

-بـەر، بـەر چـاو، بـەر پـێ، بـەر دەرگـا، بـەر و پشـت....تـاد وەك دەستەواژەیەکی فەرهەنگی واتادارە، بەڵام لە (بەرکەوتن، بـەردان، تـێ بـەر دان، بـەربوون، تـێ بـەر بـوون، بـەرگرتن، لەبـەر چـوون، لـە بـەرکردن....تـاد) وەك پێشگرێکی داڕێژەری بێ واتایـە، چـونکە هـەمان ئـەو واتایـە نـادات کـە لـە وشـە فەرهەنگییەکاندا هەیەتی(١٢) .

کەواتـــە بـــەگوێرەی واتـــاداری و بـــێ واتـــایی لەبەکارهێنانیـــدا لەیـــەکتر جیادەکرێتەوە.

ب– (ڕێ، ڕێك) لەهەموو حاڵەتێکدا واتای سەربەخۆی خۆیان هەیە، چونکە واتای چاوگ و کارەکان بەدوای واتای خۆیاندا ڕادەکێشن، (ڕێ) بەواتاو کورتکراوەی (ڕێگا) یا (ڕێك) دێت، ئەم دوو دەستەواژەیەش دوو وشەی واتاداری سەربەخۆن لەئاخاوتندا،(ڕێك) وەك ئاوەڵناو (ڕێ، ڕێگا) وەك دەستەواژەیەکی فەرهەنگی.

– (ڕێ خشاندن)[١٣] بەکورتکراوەو واتای (ڕێك خشاندن) دێت وەك (ڕێ کەوتن (ڕێك کەوتن) – ڕێخستن (ڕێك خستن) یان بەکورتکراوەو واتای ڕێگا دێت هەروەك ( ڕێ پێ دان (ڕێگا پێ دان)– ڕێ گرتن (ڕێگا گرتن)...تاد.

کەواتە ئەم دوو پێشگرە، پێشگری لێکدەرن، چونکە لەهەموو حاڵەتێکدا واتای سەربەخۆی خۆیان هەیە.

ج– (پێ) ئەم پێشگرەش هەروەك پێشگری (بەر) وەك دەستەواژەیەکی واتادار و بێ واتا بەدەردەکەوێت.

– ئەگەر بەواتای (لینگ، لاق، پا – پێ) هات پێشگرێکی لێکدەرە وەك (پێ لێ خشاندن، پێ دا گرتن، بەپێ هاتن، پێ شێل کردن، پێ هەڵ هێنان....تاد، ئەگەر بەکورتکراوەی (پێك) هات پێشگرێکی داڕێژەرە وەك (پێ کەوتن، پێك کەوتن/ پێ چوون، پێك چوون / پێ گرتن، پێك گرتن / پێ دان، پێك دان.....تاد، ئەگەر بەبێ واتا چاوگێکی داڕێژراوی دروستکرد پێشگرێکی داڕێژەرە وەك (پێ کەنین، پێ زانین، پێ وەر کردن، پێ بوون، پێ وەر بوون، پێ داکردن....تاد).

کەواتە ئەم پێشگرە بەگوێرەی واتای بەکارهێنانی دەستنیشان دەکرێت کە ئایا پێشگرێکی داڕێژەرە یا لێکدەرە، بەهەمان شێوە پێشگری (ڕا) ش لەهەندێ حاڵەتدا وەك پێشگرێکی لێکدەر بەدەردەکەوێت، چونکە وەك کورتکراوەی (ڕەئی) دێت هەروەك (ڕا پرسین، ڕا وەرگرتن، ڕا لێ بوون، ڕا دەربڕین ) بەلام لە (ڕا هاتن، ڕا خستن، ڕا بوون، ڕا وەشاندن، ڕا وەستان، ڕاگرتن، ڕا کێشان، ڕا هێنان...تاد) پێشگرێکی داڕێژەرە، هەروەها پێشگری (ڕوو)ش هەمان سیفەتی هەیە، چونکە لەهەندێ حالەتدا بەکورتکراوەی (ڕووخسار) دێت وەك (ڕوو گرژ کردن، ڕوو وەرگێڕان، ڕوو شکاندن، ڕوو هەڵ ماڵین، ڕووکەنین، (ئاو)ئاب ڕووچوون....تاد، بەلام لە (ڕوودان، ڕووکردن، ڕۆ(ڕوو) نان، ڕوو نیشتن...تاد وەك پێشگرێکی داڕێژەرە.

د– (دەر) لەهەمموو حاڵەتێکدا واتای چاوگەکە بەدوای واتای خۆیدا ڕادەکێشێ، وەك دەستەواژەیەکی سەربەخۆی واتادار دەور دەبینێ هەروەك دکتۆر ئەورەحمان دەڵێ: گومان لەوە ناکرێ کە (دەر) وشەیەکی چالاکی سەربەخۆیە بە هیچ جۆرێك و لەهیچ شوێنێك نەبووەتە پێشگر و دەوری پێشگر نابینێ، چونکە هەموو ئەو وشانەی (دەر) بەپێشیانەوە دەلکێ (دەربردن، دەربڕین، دەربوون، دەرپەڕاندن، دەرچوون، دەرخستن، دەردان، دەرکردن، دەرکەوتن، دەرکێشان، دەرهاتن / دەرلنگ، دەربەست، دەربەند، دەربەدەر ) وشەی لێکدراون نەك داڕێژراو، لەتێکڕای ئەو نموونانەدا (دەر) هەر ئەو واتایە دەبەخشێ کە سەربەخۆ بەکاردەهێنرێ[١٤].

**تێبینی :**

١– (سەر، ژێر، دەر، لا، بن، دوا....تاد ) هەندێك لە زمانەوانان بە پێشگریان دادەنێن، هەروەك پێشگری (هەڵ – دا) یان هەژمار دەکەن کە واتای خۆیان دۆڕاندبێت[١٥] لەڕاستیدا ئەم دەستەواژانە بە پێشگری داڕێژەر هەژمار ناکرێن، بەڵکو پێشگری لێکدەرن و چاوگی لێکدراو دروست دەکەن، چونکە لەواتاداریدا هەروەك پێشگرە لێکدەرەکانن، واتایەکی تایبەتییان هەیەو هەردەم واتای چاوگەکە بە دوای واتای خۆیاندا ڕادەکێشن هەروەك دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف دەڵێ بەباوەڕی من بەر لەهەر شت ئەمانە وشەی واتادارن[١٦].

٢– هەندێ پێشگری تر هەیە لەبێ واتاییدا هەروەك پێشگرە داڕێژەرەکانن، بەڵام لێیان جیادەبنەوە لەڕووی دروستکردنی چاوگی داڕێژراودا، چونکە ناتوانن بە ڕێژەی پێشگرە داڕێژەرەکان لەگەڵ چاوگە سادەکان یەك بگرن و چاوگی ناسادە دروست بکەن، بەڵکو تایبەتن بەواتای چەند چاوگێکی دیاریکراو و لەگەردانکردندا واتای تازە دەبەخشن هەروەك (نقووم، پاڵ، پەرە، ڕەت، تووش، فێر،، واز، پەك، ڕوو...تاد وەك (نقووم بوون، نقووم کردن / پاڵ کەوتن، پاڵ دان / پەرە سەندن / ڕەت بوون، ڕەت کردن، ڕەت بردن/ تووش بوون، تووش هاتن، تووش کردن / فێربوون، فێرکردن / وازهێنان / پەك خستن، پەك کەوتن / ڕوونان(ڕۆنان)، ڕوونیشتن، ڕوودان، ڕووکردن...تاد.

ئـەم پێشـگرانە لـە ڕواڵەتـدا وەك پێشـگرێکی ئاسـایی خۆیـان دەنـوێنن لەدروستکردنی چاوگی سادەدا، بەڵام ناکەونە بەر پێناسەی پێشگرەکان، چونکە لـەڕووی واتــاو پێناســەو مەرجــەکانی پێوەرییــەوە جیادەبنــەوە، هەنــدێکیان لەشـێوەی پێشـگرە دارێـژەرەکانن وەك (واز، پـەك، ڕوو ) هەنـدێکی تریـان وەك پێشگرە لێکدەرەکانن وەك (نقووم، تووش، فێر، پاڵ، غار، پەرە، ڕەت).

**پێشنیاز:**

– ئەم جۆرە پێشگرانەی کە هەموو سیفەتێکی پێشگریان تێدایە بەپێشـگری چـالاك نـاوبنرێن، ئـەو پێشـگرانەی کـە لـە هەنـدێ سـیفەتدا هـەروەکو پێشـگرە دارێژەرەکانن و لەهەندێ سیفەتی تـردا لێیـان جیادەبنـەوە نـاو بنـرێن ناچـالاك، بـەواتای ئـەوەی ئـەو حەڤـدە پێشـگرە دارێـژەرەی کـە لەپێشـدا نووسـیومانن بەپێشـگری دارێـژەری چـالاك بناسـرێن، ئەوانـەش بـە ناچـالاك، چـونکە تایبـەتن بەواتای چەند چاوگێکی دیاریکراو.

**تاخمی دووەم :**

ئــەو پێشـگرو پاشـگرانەن کــە لــەڕووی ئەرکــەوە جیادەبنــەوە لەپێشـگرە دارێژەرەکان و لێکدەرەکان، چونکە نابنە هۆی داهێنانی واتای تازە لەسەر چاوگە سادەکان، بەڵکو هەر پێشگرێك یا پاشـگرێك واتـاگۆڕی بـە چـاوگەکان دەکـات بـۆ مەبەستێکی دیاریکراو لەسەر هەمان واتا، ئەو پێشگر و پاشگرانەش بریتین لە:

**ا– پێشگری (هە، ئە، ئا)**

لێکدانەوە و بەدواداچوون لەم پێشگرانەدا زۆر لەپێشگرەکانی تـر ئـاڵۆزترە، چونکە هیچ نیشانەیەکی داهێنـان و گـۆڕینی واتـا لـەم چـاوگانەدا بەدەرناکـەوێت، هــەروەك لــەم نموونانــەدا بەدەردەکــەوێت، کــە بــەکارهێنان و بەکارنــەهێنانیان بـەجیاوازیی شـێوەزارەکان بـەکاردەهێنرێت وەك (نـاردن – هـەناردن، هنـارتن / سپاردن، ئەسپاردن / لێسین، لێسان – ئالێسـتن، ئالاسـتن/ شـاردن – ئاشـاریان، ئاشــاردن/ (گفــتن – خفــتن – گــوتن – خڤــین) ئــاخڤین، ئــاخفتن، ئاخــافتن، ئاخڤاندن، ئاخـاوتن / خـنین، ئـاخنین/ ژمـاردن – هـەژماردن، هـژمارتن / ژەنـین، ئـاژەنین.....تـاد، بیجگـە لـە (بـوون – هـەبوون) کـە دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی

واتایەکی تازە، چونکە ئەم پێشگرە لەم چاوگەدا و لەگەردانکردندا بەدوو واتا دێت، یەك (بوون – وجود) دوو (خاوەنێتی)[١٧] هەروەها وەك چاوگێکی لێکدراو لەدوو مۆرفیمی ڕیشەیی (morpheme root) (هە) (بوون) پێکدێت[١٨] (هەبوون) چۆن لەدیالیکتی خوارووی کوردییدا دوو جۆرە گەردانکردنی هەیە (تێپەڕ و تێنەپەڕ) لەکرمانجی سەرووشدا بەهەمان چەشنە[١٩] لەگەڵ ڕاناوی لکاویشدا چەمکی هەیی دەگەیەنێت[٢٠].

– لەبەر ئەوەی چاوگی دروستبوو بەم پێشگرانە لەپۆلێنکردندا نەخراونەتە باری تایبەتی و جیاواز، هەردەم لەگەڵ چاوگە سادەو سەربەخۆیەکان هەژمارکراون، هەر لەبەرئەمەشە زۆربەی زمانەوانان گرنگییان پێ نەداون، بەدەگمەن خستوویانەتە بەر باس و لێکدانەوە، ئەویش وەك تایبەتمەندییەکی چاوگەکە لە شێوەزارێکدا باسیان لێوەکردوون یا بەهەمان جۆری چاوگە سادە سەربەخۆیەکانیان داناون. دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف دەڵێ مامۆستایان (ق. کوردۆ – ر. ل. تسابۆلۆف) وێڕای ئەو پێشگرە سادانەی کە ئێمە لێیان دواوین، دەستەیەك پێشگری دییان باسکردووە کە کەم بەرهەمن و لەگەڵ کرداردا پێگەیشتوون و تێکەڵ بەڕەگی بوون و تەنانەت لەگەردانکردنیشدا لێی جیانابنەوە، ئەو جۆرە پێشگرانەش تەنیا لەڕێی لێکۆڵینەوەی مێژووییەوە دەتوانرێ دیاری بکرێن وەك ( ئا نین، ئا ژووتن، ئا ڤێتن، ئا وێشتن، ئا لاستن، ئا لێستن)[٢١].

– لەڕاستیدا ئەم پێشگرانە هەروەك دکتۆر ئەورەحمان دەڵێ: لێکۆڵینەوەی مێژوویی دەوێت، بەڵام هەروەك دەزانین مێژووی ئێمە لەگەشە و گۆڕانی زمانەکەماندا هەروەك مێژووی نەتەوەکەمان پڕە لە گرێ کوێرە و نادیاری، بۆیە زەحمەتە بتوانین ئەو ڕاستییە بەدەربخەین، کە ئایا ئەم پێشگرانە ڕەسەن و بنج و بناغەی ڕەگی ئەم چاوگانەن، یا لەلاوە هاتوون بۆ مەبەستی گونجان لە شێوەزارێکدا تێکەڵی چاوگ و پێکهاتەکان بووینە یا پێشگرن و دەبێت هەروەك پێشگرەکانی تر هەژماریان بکەین، بەڵام ئەوەی جێگەی بایەخی ئێمە بێت لێرەدا ئەوەیە کە نابێت ئەم پێشگرانە لەباسی بابەت و بەدواداچوونە ڕێزمانییەکاندا بخرێنە دەرەوە، چونکە لە هەندێ شێوەزاری کوردیدا بەکارهێنانیان هەیە.

**لێکدانەوە:**

**هۆکاری جیابوونەوەی ئەم پێشگرانە لەپێشگرەکانی تر، دانەهێنانی واتای تازەو لەهەمان کاتدا نەگۆڕینی واتای چاوگە سادەکانیانە، ئەم دوو مەبەستەش مەبەستی سەرەکییە لەدانانی پێشگرەکان، بەلاَم دانانی ئەم پێشگرانە زیاتر گونجانیانە لەگەلْ واتای چەند چاوگێك بەتایبەتمەندی شێوەزارەکان بۆ تێگەیشتن و تێگەیاندن یا بەهێزکردنی واتای چاوگ و کارەکەیە یاخود لەوانەیە لەهەندێ چاوگدا بنج و بناغەی شێوەی بنەڕەتیی چاوگەکە بن یا پێشگرێك بن بەتایبەتمەندی شێوەزارێك یاخود لەوانەیە لەهەندێ چاوگی تردا بەهەردوو شێوە بەدەربکەون، بەلاَم لەهەموو حالَەتەکاندا مەبەست لەدانانی ئەم پێشگرانە وەکو یەك بەدیارناکەوێت، چونکە بەدانان و دانەنانی ئەم پێشگرانە ئەوەمان بۆ ڕوون نابێتەوە کەئایا پێشگرێکن هەروەك پێشگرەکانی تر کەبوونەتە هۆی داهێنان وگۆڕینی واتا لەچاوگەکاندا، لەهەمان کاتدا ناتوانین ئەوە دەستنیشان بکەین کە ئایا کامە پێشگر بنەڕەتییەو کامەی تر تێکەلْ بەڕەگ و چاوگ و گەردانکردنی کارەکان بووە.**

**– بۆ زانینی بنج و بناغە و ڕەسەنی لەوەرگرتنی ئەم پێشگرانەدا، دەبێت چاوگەکە لە سەرچاوە ئاڤێستاییەکە بەراوردی شێوەزارە کۆنەکان بکەین پاشان هەمان چاوگ بەراوردی شێوەزارەکانی کرمانجی ژێری و ژووروو بکەین تاوەکو بوون و نەبوونی ئەم پێشگرانە بەدەردەکەوێت.**

**– ئەم پێشگرانە هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر داهێنانی واتای تازەدا نییە، بەلاَم دەتوانین وەك ئاستێکی تر بۆ چاوگە سادەکان دایان بنێین، تاوەکو ببێتە ئەو دەستوورەی کە جێگای جیاوازیی شێوەزارەکانی تێدا ببێتەوە.**

**تایبەتمەندی :**

**– لە شێوەزارەکانی ژووروودا وا بەدەردەکەوێت، کە ئەم پێشگرە تێکەلَی هەندێ چاوگیش دەبێ وەك (بیستن، بهیستن/ گۆڕین – گوهۆڕین، گوهاڕتن، گهواڕتن/ گۆزین– گهوزین، گوهاستن، گهواستن/ نێڕین، نهێڕین / گەیین، گهێشتن / گەیاندن، گەهاندن / بوورین –بوهرین...تاد).**

– لـە وشـە فەرهەنگییەکانیشـدا ئـەم پێشـگرانە بـەجیاوازیی شـێوەزارەکان بەدەردەکەون وەك (ستێر، ستێرك – ئەستێرە / ستوور، ئەسـتور / ژار، هـەژار / شکەفت، ئەشکەفت...تاد).

– جێنـــاوە ســـەربەخۆیەکانیش ئـــەم پێشـــگرە وەردەگـــرن بـــەجیاوازیی شێوەزارەکان وەك (من، ئەمن/ مە، ئێمە / تۆ، ئەتوو/ وە، ئێـوە/ وی، ئـەو/ وان، ئەوان ).

**ب– پێشگرەکانی (وە، ڤـە) پاشگرەکانی ( ە و، ۆ، ە وە، ە ڤــە)**

پێشــگر و پاشــگرێکی ڕەســەنی کوردییــە، لەبنەڕەتــدا هەریــەکن، بــەلاّم بـەجیاوازی شـێوەزارەکان بـۆ چـەند مەبەسـتێکی جـوودا، شـوێن و شـێوەکانیان ئاڵوگۆڕ دەبێت.

– بەشێوەیەکی گشتی بەکارهێنانی تایبەت نییە بـەهیچ شـێوەزارێك، بـەڵکو هەموو شێوەزارەکان لەکۆنەوە بۆ نویێ ئەم پێشگرە وەك پاشگر بـەکار دەهێـنن و بەپێچەوانەوەش وەك (وە خواردن، ڤەخواردن، ڤەخارن، خواردنـەوە، خوارنەڤـە / وەکردن، ڤەکرن، کردنەوە، کرنەڤە / وەخوندن (وەندن)، ڤەخوندن، خوێندنەوە، خوندنەڤە / وەبوون، بوونەوە، ڤەبوون / وە کۆڵین، لێ کۆڵینەوە، لـێ ڤـەکۆڵین / وە شاردن، شێرینەوە، شاردنەوە، ڤەشارتن.....تاد).

– لـــە زاری لوڕییـــدا مـــۆرفیمی (ەو) ئـــەرکی دووپاتکردنـــەوە دەبینێـــت (گەڕیامـــەو)[22] لـــە زاری هەورامیشـــدا مـــۆرفیمی (ۆ) ئـــەرکی دووبارەکردنـــەوەی ڕووداوی کارەکـە دەگرێتـە ئەسـتۆ کـە هەنـدێ جـار بـەناوبڕی (ب) دوو بزوێنەکـە لەیـەك جیادەکرێتـەوە وەك (کـەردەبۆ – بردەبـۆ)[23] مـۆڕفیمی (ەڤـە) ئـەرکی دووبارەکردنـەوەی ڕووداوی کارەکـە دەگرێتـە ئەسـتۆ کـە مـۆرفیمی (ە) نـاوبڕەو مۆڕفیمی (و) نیمچە بزوێنە کە لە زاری ژووروودا دەبێتە (ڤـ) ئـەرکی ڕابردوویـی و مۆرفیمی (ە) ئەرکی نزیکی دەبینێت بەسەرەتای کارەوە دەلکێت (ڤەکرن) [24] لە زاری ناوەڕاسـتدا مـۆرفیمی (ەوە) ئـەرکی دووبارەبوونـەوەی ڕووداوی کارەکـە دەگرێتـە ئەسـتۆ کـە مـۆرفیمی (ە) نـاوبڕە و مـۆرفیمی (و) ئـەرکی ڕابـوردوویی و مۆرفیمی (ە) ئەرکی نزیکـی دەبینێـت وەك(هاتمـەوە، دەتبینمـەوە)[25] بـەلاّم لـە

هەندێ بنەزاردا بەشێوەی پاشگری (وە) بەکاردێت دەڵێن (هاتموە، دێموە) هەروەك عەشیرەتی برادۆستەکان.

– مامۆستا نووری عەلی ئەمین پاشگری (ە وە)ی بەچەند شێوەیەك خستۆتە ڕوو، (ە وە) وەك ( نووست + ەوە / (یەوە) وەك (کێلا + یەوە / (تەوە) وەك (فرۆشراوە + تەوە – ئەشوا + تەوە) / (ۆتەوە) وەك (چاند + ۆتەوە)[٢٦].

– ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی کۆڕی زانیاری کورد دەڵێ پێشگری (وە، ڤە) لە شێوەی کرمانجی سەروودا بە گشتی، لە هەندێ شێوەی کرمانجی خوارووداا بۆ مەبەستی داهێنانی واتای تازە بەکار دێت وەك (کوشتن، ڤەکوشتن / خارن، ڤەخارن)[٢٧] هەروەها دەڵێ لەزاری کرمانجی سەرووداا پاشگری (ەوە)کە دەبێتە پێشگری (ڤە) لەزۆربەی شێوەکاندا واتای کارەکە دەگۆڕێت، بەلاَم لەشێوەی بۆتانیدا وا دەبێت دووبارە کردنەوەش دەگەیەنێت وەك (ڤەگەڕان) بە واتای (گەڕانەوە)، هەروەها (ڤەمان) بەواتای (مانەوە) دێت[٢٨].

– مامۆستا مەسعوود محەممەد دەڵێ: لەکرمانجی سەرووداا بە پێشگر دێت، ناگونجێ (ە)کەی بەرایی دەربکەوێت، هەندێ عەشیرەتی کوردستانی خوارووش ناوناوە بە پێشگر بەکاری دەهێنن وەك کە دەڵێن ئاوەکە وەخۆ، دەرگاکەم لێ وەکە، پاشان دەڵێ ئەم پاشگرە گەلێك واتاگۆڕی بەکاردەکات واتا گۆڕینەکانیش بەردەوامی و پێچەوانەیی و دووبارە بوونەوەیە[٢٩].

– دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف دەڵێ: پێشگری (ڤە) لە دیالیکتی کرمانجی ژووروودا بەکاردەهێنرێ و لەباری واتا و ئەرکی وشە ڕۆنانەوە بەرانبەر پاشگری (ەوە)ی کرمانجی خواروو دەوەستێ، ئەم پێشگرە ڕێچکەی ڕوودان بۆ دواوە بۆ لایەنی جیاواز نیشان دەدا ودووبارە بوونەوەی ڕوودان ڕادەگەیەنێ، وەك (ڤەگرتن، ڤەخارن، ڤەکشان، ڤەگەڕین، ڤەکرن)[٣٠]، هەروەها دەڵێ: ئەم پاشگرە دەورێکی گەورەو گرنگ دەبینێ و گەلێك واتا دەگەیەنێ و دەیان وشەی نوێ پێك دێنێ، واتا سەرەکییەکانی، دووبارە بوونەوە، گۆڕینی واتای وشە، گەڕانەوە، گۆڕینی مەفهوومی وشە[٣١].

**تێبینی :**

توێـژەران و زمانـەوانانی کـورد زیـاتر باسـی (ڤــە) دەکـەن وەکـو پێشـگر و پاشگر، نەوەکو (وە) وەکو پێشگر، بەڵام پاشـگری (ەوە، ەڤــە) ئاشـنایە بـەلای هەموو خوێنەران و زمانەوانان، چونکە لەنێو شێوەزارە جیاوازەکـان و لـە هـەردوو زاراوە سـەرەکییەکەی کـوردی (کرمـانجی ژێـری – ژووروو) بۆهـەمان مەبەسـت، چالاك و کارایە لەبەکارهێناندا، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە شێوەزارە کۆنـەکانی زمانی کوردیدا لەشێوەی پێشگری (وە) پاشگری (ە و، ۆ) بـەکاردێت، لـەکرمانجی ژووروودا وەك پێشگر و پاشگر، لەکرمانجی خوارووداوەك پاشگری (ە وە)، بـەڵام لەشێوەی بادینی و سۆرانی زیاتر وەك پاشگری (ەوە، ەڤـە) لەشـێوەی بۆتـانی و هەکاری وەك پێشگری(ڤە).

**تایبەتمەندی:**

١– گرنگترین سیفەتی ئەم پاشگرە دووبارە کردنەوەیە، دووبارە بوونـەوەش بە واتای داهێنانی واتای تازە ناهێت لەسەر چاوگە سادەو سەربەخۆیەکان، بـەڵکو هەر هەمان کارە، بەڵام جارێکی تر ئەنجامی دەدەیتەوە، چ واتایەکی تازە و نوێ بە چاوگ و کارە سادەکان نابەخشێت هەروەك پێشـگرە داڕێـژەر و لێکـدەرەکان، چونکە بەشێوەیەکی گشتی واتای بنەڕەتیی چاوگەکە خـۆی دەگـونجێنی لەگـەڵ مەبەست لە بەکارهێنانی ئەم پاشگرەدا، مەبەستەکانیش زیاتر دووبارە بوونـەوە و بـەردەوامی و گەڕانـەوە و پێچـەوانەیە یـا تایبەتمەنـدی شـێوەزارییە لەشـێوەی بـەکارهێنانی، ئـەم مەبەسـتانەش داهێنــەری واتــای تــازە نییــە، بــەڵکو چــەند مەبەستێك بەدیاردەخەن لەلای ئاخێوەر لەسەر هەر هەمان واتای چاوگە سادەکە.

ا– بەشێوەیەکی گشتی لە چاوگە تێپەڕ و تێپـەڕکراوەکان دووبـارە بوونـەوە دەگەیەنێ وەك (فرۆشتن، فرۆشـتنەوە / سـووڕاندن، سـووڕاندنەوە...تـاد)، بـەڵام بـەگوێرەی سروشـت و واتــای چــاوگە ســادەکان، لــە هەنــدێ چــاوگدا دووبــارە بوونــەوەی کارەکــە شــێوەیەکی بــەردەوامی وەردەگــرێ و بەتایبــەتی لەچــاوگە تێنەپــەڕەکان وەك (ســووڕان، ســووڕانەوە/ لــەرین، لەرینــەوە/ شــکان، شــکانەوە، شەکانەوە...تاد).

ب– بەگوێرەی واتای چاوگەکە واتای گەڕانەوە دەگەیەنێ وەك (بردن، بردنەوە / ڕۆیشتن، ڕۆیشتنەوە / چوون، چوونەوە / ناردن، ناردنەوە.....تاد).

٢– ئەو چاوگانەی کە بەبێ ئەم پاشگر و پێشگرە واتا نابەخشن وەك (پاڕان، پاڕانەوە/ شێرین، شێرینەوە، شاردنەوە، ڤەشارتن / گۆزین، گۆزینەوە، ڤەگۆزین، گواستنەوە، ڤەگواستن / بووژان، بووژانەوە / حەوان، حەوانەوە / حەسان، حەسانەوە / گەشان، گەشانەوە...تاد). لێرەدا دەتوانین ئەو پرسیارە بپرسین، کە ئایا ئەم چاوگانە بەبێ پاشگری (ەوە) چ واتایەکی تر و جیاوازییان هەبووە ؟ تابڵێین بەپاشگری (ەوە) واتایەکی تازەیان داهێناوە ! بێگومان ئەم چاوگانە بەبێ پاشگری (ەوە) واتایەکی جیاوازیان نییە، بەڵکو هەر هەمان واتایە، بەیاریدەی پاشگری (ەوە) بەتایبەتمەندی هەندێ شێوەزار و بەتایبەتی لە شێوەزارەکانی خوارووداا، ئەم شێوە زیندووەی وەرگرتووە لە بەکارهێناندا، چونکە لەڕاستیدا بەکارهێنانی ئەم چاوگانە لەشێوەزارە کۆنەکانی کوردی لەشێوەی پێشگری (وە) دایە نەوەکو پاشگر وەك ( وەپاڕان، وەشێران، وەگەڕان، وەکۆزین، وەدۆزین...تاد)*.

٣– لە هەندێ چاوگی دەگمەندا ئەم پاشگر و پێشگرە واتایەکی تازە دەبەخشن، بەتایبەتیش لەچاوگە ناوازەکان و ئەو چاوگانەی کە چاوگە ناوازەکان دەبنە کەرتێك لە دروستبوونیان وەك (کردن، ڤەکرن، کردنەوە/ بردن، ڤەبرن، بردنەوە / لێکدان، لێکدانەوە / هەڵ دان،هەڵ دانەوە /بەربوون، بەربوونەوە/ بەردان، بەردانەوە/گێڕان،گێڕانەوە/ بوورین،بووران، بوورانەوە/ پاڵ دان،پاڵ دانەوە...تاد).

– لەگەڵ ئەوەی چاوگە ڕەسەنەکانی کوردی زۆر نین، ژمارەیان لە دەوروبەری (٤٠٠) دەبێ بەشێکیان تێپەڕن بەشێکیان تێنەپەڕن[٣٢] بەلأم لەسەر ئەم چاوگە ڕەسەن و سادانە نزیکەی (٥٠٠٠) چاوگی ناسادە و زیاتریش دروست دەبێ، لەم ژمارەیەشدا ئەو چاوگانەی کە بەپاشگر و پێشگری (ەوە، ڤە) واتای تازە دەبەخشن، ژمارەیان ئەوەندە کەمە، بەو ڕادەیە نییە تا بکرێ بە پێوەر بۆ دەرخستنی مەبەست لە بەکارهێنانیدا، چونکە ڕێژەکەیان ناگاتە لەسەدا یەکی چاوگەکان کە واتای تازە دەبەخشن، ئەم ڕێژەیەش ناشێ و لەجێگای خۆیدا

نییە تا بکرێ بە یاسایەکی گشتگیر و مەبەستی ئەم پێشگرو پاشگرەی پێ دەربخرێت.

**لێکدانەوە :**

– هەروەك دیارە ئەو چاوگانەی کە بەپاشگری (ەوە) واتای تازە دەبەخشن زیاتر چاوگە ناوازەکانن، لە هەمان کاتدا ناتوانین بە شێوەیەکی ڕەها بڵێین، کە ئەم پاشگرە واتایەکی تازەی بەخشیوە، چونکە لەگەڵ بەخشینی واتای تازەشدا بەگوێرەی مەبەستی ئاخێوەر هەردەم بۆ مەبەستە بنەڕەتییەکەی خۆی دەگەڕێتەوە کە ئەویش واتای دووبارەکردنەوەیە، چونکە پاشگری (ەوە) بەگوێرەی واتای چاوگ و مەبەستی کار و پێشگرە داڕێژەر و لێکدەرەکان لەڕستەدا مەبەست لە بەکارهێنانی روون دەبێتەوە بۆ نموونە لە:

– (دەرگا دروست کردنەوە) واتای دووبارەیە (دەرگا کردنەوە) واتایەکی تازەیە، پێچەوانەی (دەرگا داخستن)ە.

– (کتێبەکەم بردەوە) واتای دووبارەیی و گەڕانەوەیە. (یارییەکەم بردەوە) واتایەکی تازەیە، پێچەوانەی (یاری دۆڕاندن)ە.

– (ئۆتۆمبیلەکەم پاڵ دایەوە) دووبارەیە. (لەسەر دۆشەکەکە پاڵم دایەوە) واتایەکی تازەیە.

– (بەردەکەم هەڵ دایەوە ) دووبارەیە. (لاپەڕەی کتێبەکەم هەڵ دایەوە ) واتایەکی تازەیە.

– (دوو ئۆتۆمبیلەکە لێکیان دایەوە ) دووبارەیە.( بابەتە ئالۆزەکەم لێك دایەوە / لێکدانەوەم بۆ بابەتە ئالۆزەکە کرد) واتایەکی تازەیە

– (تاوان بارەکان بەربوونەوە) واتە (دیسان بەربوون) بەگوێرەی مەبەستی ئاخێوەر دووبارە یا واتایەکی تازە دەگەیەنێ. (منداڵەکان لەسەر خانووەکە بەربوونەوە) تەنها واتایەکی تازەیە.

– (ئاهەنگیان گێڕایەوە) واتای دووبارەیە. (قسەیان گێڕایەوە) واتای تازەیە.

٤– لە وشە فەرهەنگییەکانیشدا ئەم پاشگرە هیچ واتایەکی تازە و دوور لەواتا بنەڕەتییەکەی بە وشەکان نادات.

ا- (خوارەوە، سەرەوە، ژوورەوە، ماڵەوە، دەرەوە...تاد) هیچ داهێنانێکی تازەی بەواتای بنەڕەتیی (خوارو سەر و ژوورو ماڵ و دەر) نەداوە.

ب- لە هەندێ کاتیشدا بە بێ مەبەست و هۆ بەکاردەهێنرێت (لە هەولێرەوە، لە دوورەوە، لە دوێنێوە....تاد). بەبێ پاشگرەکەش هیچ جیاوازییەك لەدەربڕینی واتاکە ڕوونادات.(لە هەولێرەوە هاتمەوە / لە هەولێر هاتمەوە) (لەدوورەوە تۆم دی /لەدوورترم دی).

ج- ئەگەر بڵێیت (بەداخەوە، بە ڕێزەوە، بەبێزارییەوە....تاد وەك ئاوەڵناوێك واتای (لەگەڵ) دەدات، بەڵام بەهەمان شێوە واتایەکی تازە بە (داخ - ڕێز - بێزاری ) نادات .

٥- لەڕووی هێزەوە (تێپەڕی - تێنەپەڕی) هیچ کاریگەرییەکی لەسەر چاوگەکاندا نییە، بەپێچەوانەی پێشگرە داڕێژەرەکان کە لەهەندێ حاڵەتدا پێشگرەکە دەبێتە هۆی دروستبوونی چاوگێکی تێنەپەڕی داڕێژراو لەسەر چاوگێکی سادەی تێپەڕ وەك (کەنین، کەندن) تێپەڕن، بەڵام (پێ کەنین ) تێنەپەڕە .

٦- لێکدانەوە بۆ بەدەرخستنی مەبەست لە بەکارهێنانی ئەم پاشگرەدا بابەتێکی ئاڵۆزە لەزمانی کوردیدا، چونکە لەگەڵ ئەو مەبەستانەی کە لەپێشدا باسمان کرد، لەهەندێ حاڵەتدا تایبەتمەندیی شێوەزارەکانیش مەبەست و بەکارهێنانی ئەم پێشگرو پاشگرە دەسەپێنن بۆ نموونە : (بەرسڤ دان، بەلاڤ کرن، هاڤر دان، کۆم بوون ) لەکرمانجی ژوورووردا بەبێ ئەم پاشگرە یا پێشگرە بەکاردەهێنرێ، بەڵام لەکرمانجی خوارووردا هەر هەمان چاوگ بەهەمان واتا لەشێوەی (وەڵام دانەوە، بڵاو کردنەوە، ئاوڕدانەوە، کۆبوونەوە ) بەپاشگری (ەوە) بەکاردەهێنرێن.

**ج- پاشگری (اندن):**

ئەم پاشگرە ئەوەندە بەرچاوە کە باسکردن و مەبەستی بەکارهێنانی زۆر ڕوون و ئاشکرایە، لەهەردوو زارە سەرەکییەکەی زمانی کوردی (کرمانجی ژێری - ژووروو) وەکو یەك و بۆ یەك مەبەست بەکاردێ، چونکە تاکە مەبەست لە

بەکارهێنانیدا گۆڕینی چەمك و واتای چاوگەکەیە لەتێنەپەڕەوە بۆ تێپەڕ، نەوەکو داهێنانی واتای تازە لەسەر چاوگە سادەو تێنەپەڕەکان هەروەکو پێشگرە داڕێژەرەکان، بەلاّم شیکردنەوەو هەلّوەشاندنەوەی پێکهاتەکانی ئەم پاشگرە بیرو بۆچوون و خوێندنەوەی جیاوازی بۆ دەکرێت.

– دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف دەلّێ ئەم پاشگرە (ند، اند، دن) نییە وەك هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی دایان ناوە، بەلّکو (اندن)ە، چونکە لەباری ئاساییدا بەباشی دەردەکەوێ، بەلاّم وەك زۆر دیاردەی دی زمانی کوردی لەهەندێ حالّەتدا بەشێوەیەکی دیکە دەبینرێ و ئەمە بووەتە هۆی گۆڕینی شێوەی، کاتێ بەیاریدەی پاشگری (اندن) کرداری تێنەپەڕ دەکرێ بەتێپەڕ، بەشێوەیەکی سەرەکی نیشانەی (ان، ین، تن، دن) لادەدرێ (اندن) دەخرێتە سەر بناغەی چاوگ، بێ ئەوەی ڕوودانێکی فۆنەتیکی بێتە گۆڕێ [٣٣] .

– دکتۆر یوسف شەریف دەلّێ لەزمانی فارسیدا بەهەمان شێوە ئەم پاشگرە بەرچاو دەکەوێت کە وەکو کوردی دەچێتە سەر ڕەگی ڕانەبوردووی کارە تێنەپەڕەکان و دەیانکات بە تێپەڕ[٣٤].

– ڕۆژان نووری دەلّێ کە کاری تێنەپەڕ دەکات بە تێپەڕ، وەك مۆرفیمێکی ڕێزمانی کاردەکات / (ا)– مۆرفیمی کات / (ن)– مۆرفیمی تێپەڕاندن / (د)– مۆرفیمی کات / (ن)– (ن)ی چاوگ[٣٥].

**ڕوونکردنەوە:**

ئەگەر بۆ بنج و بناوانی ئەم پاشگرە شۆڕ ببینەوە، لە شێوەزارە کۆن و ڕەسەنەکانی زمانی کوردیدا وەك پاشگری (انن) بەدەردەکەوێت، شێوەزمانی کۆنی کوردیش ئەو شێوەزارانە دەگرێتەوە، کە دەکەونە نێوان سەرچاوە ئاڤێستاییەکەو شێوەزارەکانی کرمانجی ژووروو – خواروو، وەك لوڕ و کەلهوڕ و لەك و فەیلی و مامەسەنی و هەورامی و زازاکی لەگەلّ هەموو ئەو شێوەزارە ناوچەیی و عەشیرەتیانەی کە لەم شێوەزارانە نزیکن، چونکە بەگوێرەی بەلّگە مێژووییەکان لەدەق و نووسراوە کوردییەکان ئەم شێوەزارانە کۆنترن لە شێوەکانی ژووروو –خواروو، لەم حالّەتەشداو بەلێکدانەوەیەکی لۆژیکی شێوەزارە

کۆنەکان دەبنە بناغە بۆ شێوەزارە نوێیەکان لە هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکان و شێوەی بنەڕەتی دەستەواژەکان[٣٦]، بەلاَم لەبەر ئەوەی ئێمەی کورد وا ڕاهاتووینە کە توێژینەوە زمانەوانییەکانمان لەبنەمایەکی ئامادە بەدەستی فارسی یا لەڕواڵەت و دوا شێوە گۆڕانی دەستەواژەکاندا بکەین بەبێ ئەوەی دەستەواژەکان بگەڕێنینەوە بۆ شێوە بنەڕەتییەکەی لە شێوەزارە کۆنەکانی زمانی کوردی، لەهەمان کاتدا هەردەم لە لێکدانەوەکانماندا پشت بە تایبەتمەندیی شێوەزارەکان دەبەستین و هەر شێوەزارێکیش دەستەواژەکانی بەراوردی بنچینە ئاڤێستاییەکە دەکات، بێگومان لەم حاڵەتەشدا گۆڕانی دەستەواژەکان زۆر زیاترە لە گۆڕانی بەبەراورد لەگەڵ شێوە کۆنەکان، بۆیە لەزۆر حاڵەتدا لەڕاستیی لێکدانەوەکاندا دوورکەوتووینەتەوە.

– ئەم پاشگرە پاشگرێکی ڕەسەنی کوردییە، بەلاَم هاوبەشە لە بەکارهێناندا لەنێوان زمانی کوردی و فارسیدا، هەروەك ئاشکراشە کە زمانی کوردی و فارسی هاوڕیشەنە لەیەکگرتنەوەیان لە سەرچاوەیەکی کۆنی زماندا، ئەم هاوڕیشەییەش بۆتە هۆی تێکەڵی و نزیکی هەندێ دەستەواژە و بنەمای ڕێزمانی لەنێوان هەردوو زماندا، بەلاَم لەبەر ئەوەی بەدرێژایی مێژوو، لەم دوو هەزار ساڵەی دواییدا هەردەم حوکم و دەسەلاَت بەدەست فارسەوە بووە، ئەمەش وای کرد کە خوێندن و پەروەردە و توێژینەوە لە زمانی فارسی بەر لە زمانی کوردی دەست پێبکات، لە دەرئەنجامدا زمان و ڕێزمانی فارسی پێشکەوت و ناسرا بەبەراورد لەگەڵ زمانی کوردی و زمانە ئێرانییەکانی تردا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە (اندن) لەشێوەو ڕواڵەتە گۆڕاوەکەیدا زیاتر بکەوێتە بەر باس و لێکدانەوە نەوەکو شێوەی (انن).

**لێکدانەوە:**

١– لە کوردیدا پیتە بزوێنی (ا) نیشانەی بنەڕەتی چاوگە تێنەپەڕەکانە، (ن)ی چاوگیش هەمیشەییە، ئەم نیشانەیەش لەئەنجامی کورتبوونەوەی پاشگری (یان) دروست دەبێت وەك (شکیان، شکان / سووتیان، سووتان...تاد) * هەرلەبەر ئەمەشە چاوگە تێنەپەڕەکان لەزمانی کوردیدا بەهەر نیشانەیەك بن، بۆ تێپەڕکردن هەڵدەگەڕێنەوە بۆ نیشانە بنەڕەتییەکەی خۆیان کە دەبێتە (ان + دن) وەك (ترسان، ترساندن/ لەرزین، لەرزاندن / مردن، مراندن / کەوتن، کەواندن

/ نووستن، نواندن / گەیشتن، گەیاندن...تاد).[٣٧] بەلاّم لە فارسیدا پیتی نەبزوێنی (د، ت) نیشانەی چاوگی تێپەڕ و تێنەپەڕە وەك ( کشتن، گرفتن، شدن، بوودن....تاد).

٢– ئالۆگۆڕی پیتە بزوێنەکان لەنێوان خۆیانداو لەنێویشیاندا شکانەوەی (ا) و(ێ) وەك دەستوورێك، بووە بە هۆکارێك وا لەچاوگە تێنەپەڕەکان دەکات کە نیشانە بنەڕەتییەکە (ا) بشکێتەوە بۆ (ێ) ڕەگی تێپەڕکراوی پێدروست ببێت وەك (شکان، شکێن / فڕین، فڕێن / مردن، مرێن / کەوتن، کەوێن/ نووستن، نووێن / گەیشتن، گەیێن....تاد). بەهەمان شێوە ئەم شکانەوەیە لە وشە فەرهەنگییەکانیشدا ڕوو دەدات وەك (تۆپانێ، تۆپێن / ناوازە، ناوێزە / ناو، نێو / داوێن، دامێن، دامان / پا، پێ.....تاد).

٣– زمانی کوردی بە (ان) چاوگە دانراوەکان دروست دەکات بەتایبەتی لەشێوەکانی ژوورووی وەك ( جرب + ان + دن / مەش + ان + دن / خرج + ان + دن / نجح + ان + دن...تاد)، بەلاّم زمانی فارسی لەزۆربەی چاوگە دانراوەکان، پیتی (ی) دەخاتە نێوان ڕەگ و نیشانەی چاوگ، بە (یدن) چاوگەکان دروست دەکات، لەدەستەواژە عەرەبییەکاندا وەك (بلع + یدن / لمس + یدن / طلب + یدن....تاد)، بەهەمان شێوە لەدەستەواژە کوردییەکانیشدا وەك (پرس + یدن / پۆش + یدن / ترس + یدن / کۆش + یدن....تاد). هۆکاری ئەمەش لەوەدا ئەوەیە کە (دن) بۆ فارسی و(ان) بۆ کوردی نیشانەی بنەڕەتینە لەدروستکردنی چاوگەکاندا، ئەم نیشانە بنەڕەتییەش لەزمانی کوردیدا بۆتە بناغەی پاشگری (ان + دن) چونکە لەفارسیدا نیشانەی (ان) بەڕەگی چاوگی تێنەپەڕی سادەوە نالکێ تا ببێتە نیشانەی چاوگ و چاوگی تێنەپەڕ دروست بکات وەك زمانی کوردی، بەلّکو تەنیا بۆ تێپەڕکردن (ان) دەخاتە نێوان ڕەگ و نیشانەی چاوگ بەشێوەی زمانی کوردی وەك (خندیدن – خندان + یدن / پریدن – پران + یدن).[٣٨]

٤– زمانی کوردی و فارسی هاوشێوەنە لەدروستکردنی چاوگدا، چونکە لەهەردوو زماندا چاوگەکان بەڕەگ و نیشانە و(ن)ی چاوگ دروست دەبن، لەکوردیدا وەك (سووتان، فڕین، بڕین، کەوتن، شۆرین، شۆردن ) لە فارسیدا وەك (سوختن، خوردن)

**سەرنج :**

دروستبوونی نیشانەی چاوگ لەزمانی کوردیدا بەپێتی بزوێنی (ا، ی) هۆکارێکە وای کردووە کە نیشانەکانی چاوگ زیاتر بکەوێتە ژێر کاریگەرییەکانی گۆڕان بەپێچەوانەی زمانی فارسی، چونکە سووک و ئاسانی لەئاڵوگۆڕی پیتە بزوێنەکان وادەکات کە نیشانە بنەڕەتییەکانی چاوگ بگۆڕێن بۆ نیشانەکانی تر لەنێو شێوەزارەکاندا.

**شیکردنەوەی (اندن) :**

– مەکەنزی لەکتێبی لێکۆڵینەوەی زارەکانی کوردی ( kurdish dialect studies ) ساڵی ١٩٦١ لاپەڕە ١٤٩دا دەڵێ (تێپەڕ لە تێنەپەڕەوە بەم جۆرە دروست دەکرێت ( برژانن – کولأنن – سووتانن – شکانن – تۆقانن)[٣٩].

– لەزمانی کوردیدا (د) وەکو ناوبەند هاتۆتە نێوان (ن) ی چاوگ و(ن)ی تێپەڕکەر، (انن) بووە بە (اندن) وەك (برژانن، برژاندن / کولأنن– کولأندن / سووتانن – سووتاندن / شکانن – شکاندن / تۆقانن – تۆقاندن....تاد)، (کولأنم – کولأندم / کولأنت –کولأندت / کولأنی – کولأندی.....تاد).

– لە گەردانکردنیشدا بەدەردەکەوێت کە(د) بۆ جیاکردنەوەی هەردوو(ن) هاتۆتە نێوانیان بۆ مەبەستی گونجانی سەرزار، ئەمەش تایبەتمەندییەکی زمانی کوردییە، کە بۆ بەدواداهاتنی دوو پیتی وەك یەك یا یەکێکیان دەسوێ یا ناوبەندێك دادەنێ بۆ جیاکردنەوەو ئاسانی لەتێگەیشتن و تێگەیاندن هەروەك لە(گری + ین / ژی + ین / ڤی + ین / زای + ین ) پیتی (ی) دەسوێ و دەبێتە(گرین، ژین، ڤین، زاین ) یاپیتێکی ناوبەند دادەنێ وەك لە(دی + ین) دەبێتە (دیتین) هەروەها لەجیاکردنەوەی (ڕ)ی لاوازی کۆتایی ڕەگ و (ر)ی بکەری نادیاریش (د) دەکەوێتە نێوانیان وەك (نێر+را – نێر د را / هەڵ بژێر+ را – هەڵ بژێر د را / شۆر+ را – شۆر د را....تاد).

– ئەم (د)ە ناوبەندە لەکاری ڕانەبوردوو فرماندا بەکارهێنانی نامێنێ، چونکە بنج و بناغەی بنەڕەتی دروستبوونی چاوگەکە نییە، بەڵکو تەنیا لەکاری ڕابوردوودا بەدەردەکەوێت، پێداویستی دابینکردنی واتاش لەکاری ڕابوردوودا هۆکارێکە کە جیاوازی دەخاتە نێوان چاوگ و کارەکان لەگەردانکردندا لەهەمان

کاتدا و لەهەندێ حالەتدا گۆڕانی نیشانەی چاوگەکانیش دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەم پێداویستییە.

– لە چاوگی تێپەڕکراودا (ن)ی چاوگ دەبێتە بەشێك لەرەگی چاوگە تێپەڕکراوەکان، چونکە تێکەڵی گەردانکردن دەبێت، بەپێچەوانەی رەگە تێپەڕ و تێنەپەڕە بنەڕەتییەکان وەك (کڕین) – کڕی، دەکڕی، بکڕە / (شکان) –شکا، دەشکێ، بشکێ / (شکاندن) – شکاند، دەشکێنی، بشکێنە.....تاد.

– دەورو رۆڵی لەکاری رابوردووی (نزیك و تەواو و دوور و بەردەوام )ی تێپەڕکراودا هەروەك نیشانەی چاوگە لەکاری تێنەپەڕ و تێپەڕی ئاساییدا وەك: سووتاندن – (سووتاند، سووتاندووە، سووتاندبوو، دەسووتاند) تێپەڕکراوە، سووتان ( سووتا، سووتاوە، سووتابوو، دەسووتا) تێنەپەڕە، – هێنان ( هێنا، هێناوە، هێنابوو، دەهێنا) تێپەڕ .

**شیکردنەوەی (اندن) وەك مۆرفیمێکی رێزمانی لەزمانی کوردیدا:**

(ا) – نیشانەی چاوگی بنەڕەتییە، دەورو رۆڵی مۆرفیمی کاتی رابوردوو دەبینێ.

(ن) – (ن)ی چاوگی هەمیشەییە.

(د) – ناوبەندە، بەلأم هەمان دەور و رۆڵی مۆرفیمی کاتی رابوردوو دەبینێ لەگەردانکردنی کارە تێپەڕکراوەکاندا.

(ن)– (ن)ی تێپەڕکەرە.

**پوختە:**

– بەکارهێنانی (اندن) لەنێوان هەردوو زماندا لێکدانەوەکانیش تێکەڵی یەکتر دەکات، چونکە هەر زمانێك تایبەتمەندیی خۆی لکاندووە بە چاوگەکانەوە (ترسان، ترسانن، ترساندن/ ترسیدن، ترسانیدن(ترساندن)/ لەرزان،لەرزانن، لەرزاندن / لەرزیدن، لەرزانیدن (لەرزاندن) / چەسپان، چەسپانن، چەسپاندن / چسپیدن، چسپانیدن (چەسپاندن).....تاد).

– لەکوردیدا دەربڕین و گۆکردنی هەردوو شێوەی (دن) یا (اندن) گونجاوە، چونکە (ان) بنج و بناغەی نیشانەی چاوگی تێنەپەڕە، لەگەڵ زۆرترین چاوگی تێنەپەڕ بەشێوەی سادەیی بەکاردەهێنرێت، ئەم نیشانەیەش وادەکات کە هەموو چاوگە تێنەپەڕەکان بەهەر نیشانەیەك بن هەڵبگەڕێنەوە بۆ نیشانە بنەڕەتییەکەی خۆیان، (ن)ی تێپەڕکەر و(د)ی ناوبەند لەگەڵ (ا)ی نیشانەو (ن)ی چاوگ بەیەکەوە دەبێتە (انن، اندن).

**دەور و ڕۆڵی پاشگری (ەوە، اندن):**

هەریەکێکیان دەور و ڕۆڵێکی تایبەت دەبینن لە دروستکردنی چاوگدا بەگوێرەی واتای ئەو دەستەواژانەی کە نیشانەو (ن)ی چاوگ و پاشگرەکەی دەچێتە سەر.

– لە هەندێ حاڵەتدا ئەو دەستەواژانەی کە واتای سیفەتێك دەدەن بەڕەگ و نیشانەی (ان)ی تێنەپەڕی چاوگ و پاشگری (ەوە) کە دەبێتە (انەوە) دروست دەبن وەك (تروسکانەوە / درەوشانەوە / پووکانەوە / گەشانەوە / ڕووتانەوە / زرینگانەوە...تاد).

– لە هەندێ حاڵەتی تردا ئەو دەستەواژانەی کە واتای دەنگێکی سروشتی دەدەن بەڕەگ و نیشانەی (ان)ی تێنەپەڕی چاوگ و پاشگری (ن) کە دەبێتە (انن) (اندن) دروست دەبن هەروەك (قیژ انن، قیژ + اندن / زیڕ انن، زیڕ+ اندن / حیل انن – حیل + اندن......تاد).

– کە هەردوو پاشگر بەیەکەوە بەکاردەهێنی لەو چاوگانەی کە بە(ەوە) دروست دەبن، (انەوە) دەبێتە (اننەوە) پاشان (اندنەوە) هەر یەکێکیان بۆ ئەرکە

بنەڕەتییەکەی خۆی دەگەڕێتەوە (اندن) بۆ تێپەڕکردن، (ەوە)ش بۆ دووبارە بوونەوەو بەردەوامی وەك (تroووسکاننەوە، تrووسکاندنەوە/ درەوشاننەوە، درەوشاندنەوە / پووکاننەوە، پووکاندنەوە / ڕووتاننەوە، ڕووتاندنەوە / زرینگاننەوە، زرینگاندنەوە / ڕازاننەوە، ڕازاندنەوە / قیژاننەوە، قیژاندنەوە / زیڕاننەوە، زیڕاندنەوە / حیلاننەوە، حیلاندنەوە...تاد).

— (اندن) چەند تایبەتمەندییەکی ڕێزمانی هەیە، چونکە تێکەڵ بە پێکهاتەی کار دەبێت لە گەردانکردندا لەڕابوردووەوە بۆ ڕانەبوردوو شێوەیان دەگۆڕێت وەك (برژاندن — برژاندی — دەبرژێنێ....تاد). ئەگەر کارەکە پاشگری (ەوە)ی پێوە بێت ئەوە جێناو دەکەوێتە پێش پاشگرەکە وەك (دەنووسمەوە — ناردمانەوە....تاد).[٤٠]

**بەراوردێکی واتایی:**

— ئایا واتای ئەو چاوگانەی کە بەپێشگر و پاشگری (وە، ڤە، ەوە، ەڤە، هە، ئە، ئا ) + (ەوە + اندن) کە لەسەر چاوگە سادەکاندا دروست دەبن هەروەك واتای ئەو چاوگانەیە کە بەپێشگرە داڕێژەر و لێکدەرەکان دروست دەبن؟ وەك (ئەسپاردن، سپاردنەوە / هەناردن، ناردنەوە / ئالێسین، لێسینەوە / ڤەکوشتن، کوشتنەوە / وە خواردن، ڤەخارن، خواردنەوە، خوارنەڤە / وەگەڕان، ڤەگەڕیان، گەڕانەوە، گەڕاندنەوە / وەمان، ڤەمان، مانەوە / ڤەگرتن، گرتنەوە / ڤەکشان، کشانەوە، کشاندنەوە / نووساندن، نڤیساندن، نووسینەوە / خوێندنەوە، خوندنەڤە......تاد)، واتایەکی تازەیان داهێناوە؟ کە پەیوەندیی واتایی نەبێت لەگەڵ (سپاردن، ناردن، لێسین، کوشتن، خواردن، گەڕان، مان، گرتن، کشان، نووسین، خوێندن) تا ببێتە هۆی ئەوەی لەلیستی پێشگرە داڕێژەرەکان دابنرێن بۆ دروستکردنی چاوگ و کاری نासادە هەروەك ( کردن) — ڕاکردن، هەڵ کردن، تێ کردن، لێ کردن، پێ کردن، داکردن، ئازادکردن، ئاوارەکردن، دەست بەکارکردن....تاد / (گرتن) — ڕاگرتن، هەڵ گرتن، بەرگرتن، تێ گرتن، داگرتن، ڕۆژوو گرتن، یەك گرتن، ئارام گرتن......تاد (هێنان )— داهێنان، ڕاهێنان، هەڵ هێنان، هەرەس هێنان، پاساو هێنان......تاد).

هــەروەك دیــارە كــە چــاوگی بەپێشــگرە داڕێــژەرەكان و لێكــدەرەكان پەیوەندیی واتاییان لەگەڵ واتای چاوگە سادەکەدا نـەماوە بـە پێچـەوانەی ئـەو چاوگانەی کە بەپاشگرو پێشگری (ەوە، اندن....تاد) بەکارهاتوون.

بێجگە لە تایبەتمەندییە ڕێزمانییەکانی(ەوە، اندن) بەجیاواز لەگەڵ پێشـگرە داڕێژەرەکان بەدەردەکەوێت ئەگەر لەڕووی واتاوەش بەراوردی پێشـگرە داڕێـژەر و لێکدەرەکان بکەین هەردوو تاخم لەیەکتر جیادەبنەوە، چونکە هـەر تاخمێکیـان ئەرکێکی جیاواز جێبەجێ دەکەن، بەڵام زمانەوانانی کورد تـا ئێسـتا (ەوە، انـدن) بەپاشـگری داڕێـژەر دادەنـێن هـەروەك پێشـگرەکانی (دا، ڕا، هـەڵ، وەر....تـاد) هەژماریان دەکەن، بـەڵام بـەگوێرەی واتـای ئـەو چـاوگانەی کـە دەبنـە بناغـە بـۆ چاوگە ناسادەکان، دانانی ئەم پێشگرو پاشگرانە نابنە داهێنەری واتایـەکی تـازە، لەهەمان کاتدا بزووتنەوەی جیاوازیش بەچاوگە سادەکان نادەن هەروەك پێشگرە داڕێژەرەکان، ئەمەش گرنگترین جیاوازییە بـۆ لەیـەکتر جودابوونـەوەی مەبەسـتی بەکارهێنان و بەکار نەهێنانیان، چـونکە گـرنگترین مەبەسـت لەداڕشـتنی چـاوگدا بەهۆی پێشگرو پاشگرەکان داهێنانی واتایە، لەکاتێکدا کە پێشگرێك یـا پاشـگرێك واتایەکی نوێی دروست نەکرد وا لێك دەدرێتەوە کـە مەبەسـت لـەدانانیان هـەر بـۆ گـۆڕینی چـەمك و واتایـە لەسـەر واتـا بنەڕەتییەکـەی، گـۆڕینی چـەمك و واتـاش بـەواتای دروسـتکردنی واتایـەکی تـازە ناهێـت، چـونکە دوور ناکەوێتـەوە لـەواتا بنەڕەتییەکەی خۆی، بـەڵکو شـێوەیەکە لـەدەربڕین و مەبەسـتێك بـەدەردەخات، ئــەم مەبەســتانەش لەشــێوەی دووبــارە بوونــەوە و بــەردەوامی و پێچــەوانە و گەڕانەوەو تێپەڕاندنە یا گونجانی شێوەزارییە.

**هۆکاری تێکەڵبوون :**

لەڕاستیدا ئەو هۆکارەی کە بۆتە هۆی تێکـەڵبوونی ئـەم پاشـگر و پێشـگرانە (ەوە، اندن) لەگەڵ پێشگرە داڕێژەرەکاندا ئەمانەن.

**یەکەم** / بێ واتاییانە هەروەکو پێشـگرە داڕێـژەرەکان، چـونکە بەشـێوەی سەربەخۆ واتای تایبەتییان نییە .

**دووەم** / داهێنان و گۆڕینی واتا نەکراوە بەبنەما بۆ جیاکردنەوەی چاوگەکان تـا ئـەرکی پێشـگرو پاشـگرەکان بـەگوێرەی ئـەرك و بـەکارهێنانیان لەیـەکتر جیاببێتەوە، بۆیە هەر وەکو یەك و بەتێکەڵی ماونەتەوە.

**پێشنیاز:**

ئەم پێشگر و پاشگرانە (وە، ڤە، ەوە، ەڤە، ئە، ئا، هە) هەروەها (اندن)یش ناوبنرێن پێشگر و پاشگری (مەبەست ) گونجـاوترە، چـونکە مەبەسـت لـەدانانیان داهێنانی واتـای تـازەو دوورکەوتنـەوە لـەواتای بنـەڕەتیی چـاوگی سـادەدا نییـە. بـەڵکو هــەر یــەکێکیان بــۆ مەبەســتێکی دیــاریکراو بــەکاردەهێنرێن و هــەردەم پەیوەستی واتای چاوگە سادەکانیانن بەپێچەوانەی پێشگرە داڕێژەرەکان.

**پۆلێنکردنی چاوگەکان لەڕووی واتاوە:**

گرنگترین هۆکار بۆ پۆلێنکردن و دابەشکردنی چاوگەکان، داهێنان و گـۆڕینی واتایـە، چـونکە مەبەسـت و جیـاوازی لـەواتادا بناغـەی دروسـتبوونی جۆرەکـانی چاوگن، پێشگرەکانیش دەورو ڕۆڵی سەرەکی لـە جیابوونەوەکانـدا دەبیـنن، بۆیـە چاوگەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش دەکەین.

- چاوگی سادە

ا- چاوگی سادەی سەربەخۆ ب- چاوگی سادەی بەیاریدە

- چاوگی ناسادە

ا- چاوگی ناسادەی داڕێژراو ب- چاوگی ناسادەی لێکدراو

ج- چاوگی ناسادەی دروستکراو

**چاوگی سادە:**

**ا- چاوگی سادەی سەربەخۆ :**

ئەو چاوگانەن کە لەسەر ڕەگی تێپەڕ و تێنەپەڕ بەبێ یاریدەی هیچ پاشـگر و پێشگرێك بەنیشانەکانی چاوگ و(ن)ی چـاوگ دروسـت دەبـن، دەبنـە سەرچـاوەی دروسـتبوونی جۆرەکـانی چـاوگی ناسـادە وەك ( کـولآن، بـارین، مـردن، کـەوتن، چـوون، نووسـتن، ڕۆیشـتن، شـێلان، کـڕین، کوشـتن، خوێنـدن، دروون، ویسـتن، هێشتن...تاد).

**ب- چاوگی سادەی بەیاریدە:**

ئەم چاوگانە هەر چاوگی سادەی سەربەخۆن، بەڵام بەمەبەستی گۆڕینی واتا، یاریدە وەردەگرن، یاریدەدەرەکان دەشێ پێشگربن یا پاشگر، بەڵام نابنە هۆی بەخشینی واتای تازە بۆ چاوگە سادەکان، تێپەڕ و تێنەپەڕیان هەیە.

**مەبەستەکان:** دووبارە بوونەوە و بەردەوامی، گەڕانەوەو پێچەوانەیی، بەهێزکردن و گۆڕینی چەمکی واتا، گونجانی شسێوەزاری، تێپەڕکردن.

**پێشگرەکان:** (وە، ڤە، هە، ئە، ئا) وەك (وەگۆزین، ڤەگۆزین، ڤەگواستن، هەناردن، ئەسپاردن، ئاشاردن، ئاخڤین.....تاد).

**پاشگرەکان:** (ەوە، ەڤە، اندن) وەك ( سووتانەوە، سووتاندن، سووتاندنەوە، کڕینەوە، کڕینەڤە، هاتنەوە، هاتنەڤە.....تاد).

**چاوگی نادسادە:**

ئەم چاوگانەن کە تەنیا بەپێشگر واتای تازە بەچاوگی سادە دەبەخشن.

**ا-چاوگی نادسادەی داڕێژراو:**

ئەم چاوگانەن کە پێشگرێکی بێ واتا لەگەڵ چاوگێکی سادەی (سەربەخۆ - بەیاریدە) یەك دەگرن، واتایەکی تازە دەبەخشن، تێپەڕ و تێنەپەڕیان هەیە، **پێشگرەکان بریتین لە (دا، ڕا، بەر، وەر، هەڵ، وێ - وێك، ڤێ - ڤێك، ژێ - ژێك، لێ - لێك، تێ - تێك، پێ - پێك ) + چاوگی سادەی (سەربەخۆ - بەیاریدە)= چاوگی داڕێژراو** وەك (دا گرتن، داگرتنەوە، ڕا پەڕین، ڕا پەڕاندن،،ژێ ڤەبوون، ژێك کرن، لێ ستاندن، لێك دان، تێك کردن، پێ کەنین، تێ وەگلان، پێوە چوون، پێڤا گرێدان، تێڤا گوڤاشتن....تاد).

**تێبینی :**

دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف پێشگرەکانی داڕێژەری بۆ سادەو نادسادە دابەش کردووە، نادسادەش بۆ دوو جۆر:

١- ئەوانەی لەئەنجامی تێکەڵبوونی پێشگری سادەی (پێ، لێ، تێ، ژێ) لەگەڵ پاشبەندی (دا، ڕا، وە) دروست بوون کە دەبنە (پێدا، پێوە(پێڤا)، تێدا، تێوە (تێڤا)، پێڕا، تێڕا، لێڕا ) .

٢- (پێك، تێك، لێك، وێك، ڕێك)[٤١].

**لێکدانەوەیەکی تر بۆ پێشگری داڕێژەری (پێ، تێ ) لەگەڵ (وە) کە دەبێتە (پێوە، پێڤا / تێوە، تێڤا):**

ئێمە لەپێشتردا ئەوەمان ڕوونکردەوە کە ئەرکی (وە، ڤە) ئەگەر پێشگربێ یا پاشگر هەروەك پێشگرە داڕێژەرەکان واتای تازە دانـاهێنن، ئەگەرچـی لەهەنـدێ حاڵەتی دەگمەندا واتای تازەی بۆ هەندێ چاوگ دادەهێنا، واپێدەچـێت بەهـەمان شێوە، بەلأم ئەم جارەیان لەشێوەی پێشگردا و لەهەندێ چاوگی ناسادەدا هەمان دەور ببینن وەك (پێ وە کردن، پێ وە بوون، پـێ وە دان، تـێ وە گـلان، پـێ وە چوون، پێ ڤا گرێدان، تێ ڤاکرن، تێ ڤا گوڤاشتن........تاد).

ا- ئەگەر پێشـگرەکە بکەینـەوە بـە پاشـگر، مەبەسـتەکە دووبـارە کردنـەوە دەگەیـــەنێ وەك (پێـــوەکردن، پـــێ کردنـــەوە / تێڤـــا گوڤاشـــتن، تـــێ گوڤاشتنەڤە......تاد).

ب- پێشـگری (وە، ڤـە) لەگـەڵ پێشـگری (پـێ - تـێ) لەهەنـدێ حاڵـەتی دەگمەندا واتای تازە دەبەخشێت، لەبەر ئەمە هـەر بەچـاوگی داڕێـژراویان هـەژمار دەکەین، هەروەك یەکگرتنی پێشـگرێکی داڕێـژەر و چـاوگێکی سـادەی بەیاریـدە، چونکە ئەگەر (وە) وەك پێشگرێکی داڕێژەر هەژمار بکەین، دەبێت بەسـەربەخۆیی واتاو بزووتنەوەیەکی تازە دابهێنێ لەسەر چاوگە سادەو سەربەخۆیەکە، هـەروەك دیاریشە پێشگری (وە) بەشێوەیەکی گشتی واتای تـازە دانـاهێنێ، لەبـەر ئـەوە (وە) پێشگرێکی یاریـدەدەرە بـە گـۆڕانی (و) بـۆ (ڤـ) چـونکە لەهەنـدێ چـاوگدا بەگوێرەی واتاکەی و لەهەندێ شێوەزاردا لەبەکارهێناندا خۆی پاراستووە.

**لێکدانەوەیەکی تر بۆ پێشگرەکانی (پێك، تێك، لێك، وێك، ڕێك):**

ئـەم پێشـگرانە پێشـگری داڕێـژەرن بێجگـە لـە (ڕێـك) چـونکە لەهـەموو حاڵەتێکدا وەك وشەیەکی فەرهەنگی واتایەکی سەربەخۆی هەیە * .

دکتۆر ئەورەحمان دەڵێ: ئەم پێشگرانە لەئـەنجامی تێکـەڵبوونی پێشـبەندی (دە، بە، لە، وە، ڕە) لەگەڵ ژمارەی (یێـك، یـەك) پەیـدابوون (دە + یـەك) (لـە + یەك) (بە+ یەك) (وە + یەك) (ڕە + یەك)، بەرانبەر ( پەڤـ، تەڤـ، ژەڤـ، لەڤـ) لـە دیالیکتی کرمانجی ژووروودا کە بەیـەکگرتنی پێشـبەندی (ل، ب، د، ژ) و جێنـاوی (هەڤـ) دروست دەبن[٤٢].

– هەروەك ئاشکرایە گۆڕانی (و× ڤـ) لـەنێو شـێوەکانی ژووروو –خـواروودا هـەروەها ئـاڵوگۆڕی پیتـە بزوێنـەکان لـەنێو شـێوەزارەکاندا شـتێکی ئاسـایی و بەرچاوە، ئەگەر بەمەبەستی واتاگۆڕی بێ یـا بـەبێ هـیچ مەبەسـتێك بێـت، بـەڵام گۆڕینی پیتی بزوێن بە نەبزوێن کەمتر دەکەوێتە بەرباس و لێکدانەوە.

بەبەراوردکردنی دەستەواژەکان بەدەردەکەوێت کـە زۆرتـرین گـۆڕان لـەپیتی (و) دا دەکرێـت، چـونکە ئەگـەر بـەراوردی وشـە و چـاوگەکان بکـەین لـەنێوان شێوەزارە کۆنەکانی کوردی و شێوەزارەکانی ژووروو– خواروو ئەو ڕاسـتییە ڕوون دەبێتەوە وەك (وارین، بارین / وەخشین، بەخشین / وەهار، بـەهار/ ورچ، هـرچ / وروژاندن، هروژاندن / ورد هورد، هیر / وشك، هشك، حشك /بـووك، بیـك /سـووك، سڤك......تاد). بۆیە من وا گومان دەبـەم کـە هـەموو ئـەم پێشـگرانە لەئـەنجامی گۆڕانی (وە + یەك) پەیدا بووینە و پاشان گۆڕانەکانی تری بەدواداهاتووە.

– لەسـەرەتاوە (وە یـەك) کـورت بۆتـەوەو گـۆڕاوە بۆ(وێـك، وێ ) پاشـان لەکرمانجی ژووروودا بووە بە( ڤێك، ڤێ) کە (و) گۆڕاوە بۆ (ب) بووە بە (بە+یەك) بەهەمان شێوە کورت بۆتـەوە بـۆ (بێـك × پێـك) لەپاشـاندا هەرچـەند پێداویسـتی وشە و مەبەستی جیا لەزماندا زیادی کردووە، شێوەزارەکان بەتێپەڕینی سەردەم و کاریگەرییـەکانی، لەبناغـە و لەهـەمان کاتـدا لەیـەکتریش دوورکەوتوونەتـەوە، شێوەو شێوازی جیا لەیەکتریان وەرگرتووە، لەدەرئەنجامدا بەمەبەستی داهێنـانی واتای تازە لەچاوگە ڕەسەن و کارە سادەکاندا گۆڕانەکانی تری بـەدوادا هـاتووە، هەر گۆڕانێکیش بۆ مەبەست و شێوە بزووتنەوەیەکی تایبەت بەکارهاتووە، پیتـی ( و) (ڤـ) گۆڕاون بۆ نەبزوێنی (پ، ل، ت، ژ ) بوونە بە(پێ، پێك / لێ، لێك / تێ، تێك / ژێ، ژێك) چونکە هاوبەرانبەری لە بـەکارهێنانی ئـەم پێشـگرانە لەشـوێنی یـەکتر بـەجیاوازی شـێوەزارەکان لەئێستاشـدا بەرچـاوە وەك (لێ پرسـین = ژێ پرسین / لێ ڕا دیتن = تێ ڕا دیتن / وێ خسـتن = ڤـێ خسـتن= تـێ خسـتن / لێ ڕا خوڕین = تێ ڕاخوڕین ) هەروەها لەهەموو ئەو چاوگانەی کە (وێ، ڤێ ) دەکەونـە بەرانبەری یەکتر لەواتادا بەهەمان شێوە (پێ) دەکەوێتەوە بەرانبـەریان وەك (وێ دان، ڤێ دان، پێ دان / وێ چوون، وێـك چـوون، ڤـێ چـوون، پـێ چـوون، پێـك

چـوون / وێ کـەوتن، پـێ کـەوتن / وێـك کـەوتن، پێـك کـەوتن / وێ کـردن، پـێ کردن...تاد).

– ئەم پێشگرانە هاوڕیشەنە لەدروستبووندا، بەلاّم هەر زاراوەیەك بەیاساو ڕێسای تایبەتی خۆی شێوەی گۆڕانی لە کورتکردنەوەدا لەگەڵ شێوەزارەکەی خۆیدا گونجاندووە لە بەکارهێناندا.

**تایبەتمەندی:**

– بە تێڕوانین و بەراوردکردنی مەبەستی پێشگرو واتای چاوگەکان ئەو ڕاستییەمان بۆ بەدەردەکەوێت، کە پێشگرەکانی (لێ، تێ، پێ، ژێ ) بۆ کاری تاك لایەنییە، پێشگرەکانی (لێك، ژێك، تێك، پێك ) بۆکاری دووانەی بەرانبەرییە وەك:

– (لێ کردنەوە، ژێ ڤەکرن / تێ کردن / پێ دان / پێ چوون / تێ گرتن / پێ داکێشان / پێ داکردن / پێ دافسین / تێ گیر کردن / لێ خۆش بوون / لێ دان / لێ خشاندن / تێ ڕا خوڕین....تاد )، تاك لایەنییە.

– (لێك کردنەوە، ژێك ڤەکرن / تێك کردن / پێك دان، پێك دادان / پێك چوون / تێك گرتن / پێك داکێشان / پێك داکردن / پێك دافسین / تێك گیر کردن / لێك خۆش بوون / لێك دان / لێك خشاندن / تێك ڕا خوڕین......تاد) دوولایەنی و بەرانبەرییە.

**ب– چاوگی نادەی لێکدراو:**

ئەم چاوگانەن کە بەپێشگرێکی واتادار لەگەڵ چاوگێکی سادەی (سەربەخۆ– بەیاریدە) یەك دەگرن، واتایەکی تازە دەبەخشن، تێپەڕو تێنەپەڕیان هەیە.

**١- ناوی سادە + چاوگی سادە(سەربەخۆ- بەیاریدە) = چاوگی لێکدراو** وەك (شووکردن، پەنگ دانەوە، بێهن ڤەدان، دەست گووشین، نان خواردن، ئاوخواردنەوە، دڵ شکان، دڵ شکاندن......تاد).

**٢– ناوی لێکدراو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو** وەك (سەرخۆش بوون، پشت گوێ خستن، ماستاو خواردنەوە، پێ شێل کردن، دلشاد بوون، سەر شۆڕکردن....تاد).

٣- **دووبارە کردنەوەی ناو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو** وەك (پارچە پارچە کردن، تیف تیفەدان، هەنجن هەنجن کردن....تاد).

٤-**پێشگری نەرێنی (نا، بێ) + ناو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو** وەك (بێ) نا ئومێد بوون، (بێ) نا ئومێد کردن، بێ چارەکردن، نا چار کردن، بێ بایەخ کردن، بێ دەنگ کردن.....تاد.

**سەرنج :**

پێشگری نەرێنی لەگەڵ دەستەواژەیەکی واتادار لەشێوەی پێشگرە لێکدەرەکانن، چونکە بەشێوەیەکی سەربەخۆ هەروەك ناوێکی سادەو ناسادە بەکاردەهێنرێت و (ی) واتاییش وەردەگرێت وەك (بێ ئومێد ی، نائومێد ی، بێ چارە یی، ناچار ی، بێ دەنگی....تاد).

## ج-چاوگی ناسادەی دروستکراو:

ئەم چاوگانەن کە بەتێکەڵبوونی پێشگرێکی داڕێژەر و لێکدەری زیاتر دروست دەبن، هەردوو ئەرکی داهێنانی واتاو گۆڕینی واتای چاوگ بەیەکەوە جێبەجێ دەکەن، تێپەڕ و تێنەپەڕیان هەیە، لەهەندێ حاڵەتدا چاوگی ناسادەی داڕێژراو و لێکدراوی تێنەپەڕ دەکەن بە تێپەڕ، ئەم هۆکارانەش دەبێتە هۆی جیابوونەوەی چاوگی دروستکراو لەچاوگی داڕێژراو و لێکدراو.

١- **پێشگرێکی داڕێژەر و زیاتر + چاوگی سادە (سەربەخۆ - بەیاریدە)= چاوگی دروستکراو** وەك (تێ ڕا چوون، پێ دا هەڵ کاڵان، پێ دا ساوین، تێ وەر هێنان، پێ دا چوونەوە، پێ ڕا بواردن، لێ ڕا هاتن....تاد).

**سەرنج:**

دکتۆر ئەورەحمان پێشگرەکانی ( پێدا / پێڕا / تێدا / تێڕا / لێڕا) بەناسادە داناوە بۆ دروستکردنی چاوگی داڕێژراو، بەڵام بێجگە لە یەکگرتنی ئەم پێشگرانە، پێشگری تریش بەهەمان شێوە یەکتر دەگرن وەك (تێ وەر، تێ بەر، تێ هەڵ، پێ وەر، پێ هەڵ ) وەك (تێ وەرهاتن، تێ بەردان، تێ بەر بوون، تێ هەڵ کێشان، تێ هەڵ کردن، پێ وەرکردن، تێ هەڵ دان....تاد).

**هۆکاری جیابوونەوە:**

– بەکارهێنانی ئەم پێشگرانە ئەگەر بەتەنیا بێت واتایەکی تازە دەبەخشن، بەلاّم بەزیادکردنی پێشگرێکی تر واتایەکی جودا دادەهێنن، کە پەیوەندی لەگەلّ واتای پێشوودا نامێنیّ، ئەمەش هۆکارێکە بۆ جیابوونەوەی ئەم چاوگانە لە چاوگە داڕێژراوەکان، کە بەیەك پێشگری داڕێژەر دروست دەبوون وەك (تیّ کردن، ڕا کردن) دوو واتای جیاوازن، بەلاّم (تیّ ڕا کردن) واتایەکی جیاوازترە، بەهەمان شێوە (تیّ چوون، ڕاچوون (تیّ ڕا چوون) / (پیّ کردن، دا کردن(پیّ دا کردن) / (تیّ کردن، هەلّ کردن (تیّ هەلّ کردن)....تاد

٢- **گرێی بەند + چاوگی سادە و ناسادە = چاوگی دروستکراو** وەك (بە ڕادان دان، لەناوبردن، لەڕق ڕاچوون، دەست بەسەر دا گرتن، لەکۆلّ بوونەوە، لەناوکردن، بەبن کەوتن.....تاد).

**هۆکاری جیابوونەوە:**

ا– ئامڕازەکانی پەیوەندی واتای چاوگەکە تەواو دەکەن بۆ مەبەستی داهێنان و گۆڕینی واتا لەیەك کاتدا، چونکە ئەم چاوگانە بەبیّ ئامرازەکانی کات ناتەواون لە واتادا، لەوانەیە چاوگەکە بەسادەیی یا بەداڕێژراوی یا بەلێکدراوی واتایەکی تایبەتیان هەبێت، بەلاّم بەشێوەی گرێی بەند ئامڕازەکان، واتا و مەبەستەکان دەگۆڕێن وەك (ڕادان دان، ناوکردن، کۆلّ بوونەوە ) واتاکەیان ناتەواوە بەئامرازەکان تەواو دەبن (بەڕادان دان، لەناوکردن، بەناوکردن، لەکۆلّ بوونەوە.......تاد)، بەلاّم (ڕاچوون، داگرتن ) چاوگی داڕێژراوی سەربەخۆن لە واتادا، بەلاّم (لەڕق ڕاچوون، دەست بەسەر داگرتن ) واتایەکی جیاوازن.

ب – ئامرازەکان دەبنە هۆی جیاکردنەوەی جۆری چاوگەکان، بۆ نموونە (پیّ کەوتن ) چاوگی داڕێژراوە، بەلاّم ( لەپیّ کەوتن، بەپیّ کەوتن) دوو چاوگی دروستکراون، چونکە واتای پێشگرە داڕێژەرە بیّ واتایەکەی گۆڕیوە بۆ دەستەواژەیەکی واتاداری لێکدەر.

٣– **چاوگی سادە + ە + دەستەواژەیەکی واتادار و بیّ واتا = چاوگی دروستکراو** وەك (گرتن + ە + باوەش / خستن+ ە + ڕوو / کەوتن+ ە + کار / کردن + ە + بەر / خستنە سەر، هێنانە پێش، بردنە پێش، دانە بەر.......تاد).

**هۆکاری جیابوونەوە:**

ئەم جۆرە چاوگانە دەکرێ بە شێوەی گرێی ناویش دەربڕێن هەروەك (لە باوەش گرتن، بەدیار خستن، بەدەرخستن، بەکار کەوتن، لەبەر کردن ......تاد).

٤- **کۆڵەگەی دەنگدار+ چاوگی سادە = چاوگی دروستکراو** وەك (ناڵە ناڵ هاتن، ناڵە ناڵ کردن / قیژە قیژ هاتن، قیژەقیژ کردن...تاد).

**هۆکاری جیابوونەوە:**

کۆڵەگەی دەنگدار لەسەر دەنگە سروشتییەکان دروست دەبن، جیاوازن لەو ناوانەی کە دووبارەکردنەوە ڕادەگەیەنن و چاوگی لێکدراو دروست دەکەن وەك (پارچە پارچەکردن، تیف تیفەدان....تاد). چونکە ئەو ناوانە بکەرو بەرکارەکانیان لەیەکتر جیادەبێتەوە وەك (پارچەپارچەکەر، پارچەپارچەکراو / تیف تیفەدەر، تیف تیفەدراو.....تاد). بەلاَم ئەو چاوگانەی کە لەسەر دەنگە سروشتییەکان دروست دەبن، بکەرو بەرکارەکانیان لەیەکتر جیانابێتەوە وەك ( ناڵە ناڵ کەر، ناڵە ناڵ کراو/ قیژەفیژکەر، قیژەقیژکراو...تاد)، هەروەك دیارە کە واتاکەیان بۆ بەرکارەکە دەگەڕێتەوە لەهەمان کاتدا بەرکارەکە دەوری بکەریش دەبینێ و بەپێچەوانەش.

٥- **ناو + پێشگرێکی داڕێژەر و زیاتر + چاوگی سادە = چاوگی دروستکراو** وەك ( ڕەش دا هەڵ گەڕان، شەڕ پێ فرۆشتن، ئاگر تێ بەر دان، چاو پێ کەوتن، گلەیی لێ کردن، ئیرەیی پێ بردن....تاد).

**هۆکاری جیابوونەوە :**

ئەو پێشگرە واتادارەی کە دەکەوێتە پێش چاوگە ناسادەکە، واتای چاوگەکە بەدوای واتای خۆیدا ڕادەکێشێ، واتایەکی تازە دادەهێنێ و جیادەبێتەوە لەواتای چاوگە داڕێژراوەکەدا وەك ( هەڵ گەڕان ) واتایەکی تایبەتی هەیە، بەلاَم (ڕەش هەڵ گەڕان ) واتایەکی جیاوازە / (بەردان، تێ بەردان) دوو واتای جیاوازن، بەلاَم (ئاگر تێ بەردان) واتایەکی جیاوازترە......تاد ئەوانی تریش بەهەمان شێوە.

٦- **پێشگری داڕێژەر + ناو + چاوگی سادە = چاوگی دروستکراو** وەك (لێ خۆش هاتن، لێ خۆش بوون، پێ خۆش بوون، پێ ڕازی بوون، تێ گیر کردن، ڕا پێچ کردن، لێ دەر چوون، لێ دەرکردن، دا گیر کردن، ڕا دەست کردن، تێ گرێ دان....تاد).

**هۆکاری جیابوونەوە:**

چاوگی سادە بەپێشگری داڕێژەرو لێکدەر بەتەنیا، هەریەکە واتایەکی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام کە دەستەواژەیەکی واتادار دەکەوێتە نێوان پێشگرە داڕێژەرەکەو چاوگە سادەکە، واتایەکی تازە دادەهێنێ یا واتاگۆڕی بە چاوگەکە دەکا کە جیاوازە لەواتای چاوگە داڕێژراو و لێکدراوەکە هەروەك ( لێ هاتن، خۆش هاتن، لێ بوون، پێ بوون، خۆش بوون، ڕازی بوون، ڕاکردن) واتایەکی تایبەتە کە دەبێتە (لێ خۆش هاتن، لێ خۆش بوون، پێ خۆش بوون، لێ ڕازی بوون، ڕادەست کردن ) واتایەکی جیاواز دەدات، ئەوانی تریش بەهەمان شێوە.

**هۆکاری تری جیابوونەوە :**

١- بەشێوەیەکی گشتی ئەگەر لێکدانەوەیەکی واتایی بۆ چاوگە دروستکراوەکان بکەین، لەهەندێ حاڵەتدا وەك پێناسەی کاری چاوگی سادەی (سەربەخۆ و بەیاریدە) ناسادەی (داڕێژراو و لێکدراو) بەدەردەکەون بۆ نموونە ( کوشتنەوە، چاوگێکی سادەی بەیاریدەیە لەسەر واتای چاوگی سادەی سەربەخۆی(کوشتن) دروست بووە، بەڵام (سەربڕین) چاوگێکی ناسادەی لێکدراوە بەهەمان واتا، کەچی (سەر لێ کردنەوە، سەر ژێ کرن) چاوگێکی دروستکراوە، چونکە وەك پێناسەی واتای (کوشتن، کوشتنەوە، سەربڕین) بەدەردەکەوێت، بەهەمان شێوە (کارکردن، دەست بەکارکردن/ دیڤ‌ چوون، بەدواداچوون / ڕێڤە برن، بەڕێوە بردن.....تاد).

٢- بەراوردکردنی هێزی تێپەڕی و تێنەپەڕی چاوگە دروستکراوەکان لەسەر چاوگە داڕێژراوەکان، ئەم بابەتە بابەتێکی تایبەتە، چونکە بەگوێرەی واتای چاوگەکە حاڵەتەکان لەیەکتر جیادەکرێتەوە، هەندێ چاوگی ناسادە هەیە بەیاسا تێپەڕن، هەروەك چاوگە تێپەڕە تەواو و ئاساییەکان جێناوی (مان، تان، یان )

وەردەگرن، بەڵام بەپێچەوانەوە بەواتا تێنەپەڕن، چونكە بكەرو بەركارەكانیان نابنە دوو كاراكتەری كاركەرو كارلێكراو وەك (فرۆشەر، فرۆشراو / سووتێنەر، سووتێنراو)، بەڵكو بەتەنیا لەهەندێ چاوگدا دەوری بكەری دەبینن و بەركار بەبێ واتا دەمێنێتەوە، لەهەندێ چاوگی تردا بە پێچەوانەوەیە تەنیا دەوری بەركار بەدەردەكەوێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لەهەردوو حاڵەتەكەدا ئەم جۆرە چاوگانە وەك تێپەڕی یاسایی بەدەردەكەون بەو یاسایەی كە چاوگە تێپەڕەكانی پێ دەستنیشان دەكرێت، تایبەتمەندییەكی ناوازە بەخۆیان دەدەن لەشێوەی چاوگە خۆییەكان و ئەو چاوگانەی كە لەسەر دەنگە سروشتییەكان دروست دەبن، نموونە : (بەربوون) چاوگێكی داڕێژراوی تێنەپەڕە، بەڵام (تێ بەر بوون– تێمان بەربوو، تێیان بەربوو، تێتان بەربوو / ئاگر تێ بەر بوون، ئاگرمان تێ بەربوو، ئاگریان تێ بەربوو، ئاگرتان تێ بەر بوو ) چاوگی دروستكراون لەشێوەی تێپەڕی، بەهەمان شێوە (تێ چوون، تێك چوون ) –چاوگێكی داڕێژراوی تێنەپەڕە، بەڵام (تێ ڕا چوون، ڕێ تێ چوون، سەر تێ چوون، سەر تێ دا چوون، سەرلێ تێك چوون، بەسەر داچوون، دڵ تێ چوون، دڵ تێك چوون، بەدڵ داچوون....تاد) چاوگی دروستكراوی تێپەڕی یاساییە.

**تێبینی :**

– ئەم گۆڕانە لەنێوان چاوگە سادەكان و ناسادەی داڕێژراو و لێكدراویش ڕوودەدات وەك ( (دڵ شكان، دەست شكان، خەو هاتن، زگ سووتان، دڵ ڕەنجان، غاردان، ڕا كردن، بەر كەوتن، پێ كەوتن....تاد) هەروەك دیارە بەیاسا تێپەڕن، بەڵام بكەرو بەركارەكانیان وەك چاوگە تێپەڕە ئاسایی و یاساییەكان لەیەكتر جیانابێتەوە، بەڵكو پێویستییان بەیاریدەی تێپەڕكردنە.

– دەستنیشانی كردنی ئەم جۆرە حاڵەتانە باسێكی ئاڵۆزە، لێكدانەوەیەكی وردترو زیاتری دەوێت، چونكە بەگوێرەی واتای چاوگەكان، حاڵەتەكان لەیەكتر جیادەكرێتەوە، بەڵام بەشێوەیەكی گشتی چاوگە دروستكراوەكان ئەم تایبەتمەندییەیان هەیە.

**جیاوازی لەنێوان چاوگی سادەی بەیاریدەو ناسادەی داڕێژراو:**

١- پێشگر و پاشگرەکانی یاریدەدەر نابنە هۆی دروستکردنی چاوگی ناسادە، چونکە واتای تازە داناهێنن، بەڵکو خرم و نزیکی واتای چاوگە سادەکانن، واتاگۆڕی بەچاوگە سادەکان دەکەن بۆ چەند مەبەستێك، بەلاّم پێشگرە داڕێژەرەکان واتای تازە دادەهێنن و بزووتنەوەی جیا بەرهەم دەهێنن، لەواتای چاوگە سادەکان دووردەکەونەوە .

٢- پێشگرە یاریدەدەرەکان لەگەردانکردندا لەکاری (ڕانەبووردوو- فەرمان)دا بەشێوەی ئەرێنی و نەرێنی دەکەونە دوای نیشانەی کار یا دەسوێن لە گۆکردندا (دەهەنێرم- دێ هەنێرم - بهەنێرە) (ناهەنێرم-مەهەنێرە ) دەتوانرێ بگوترێ (دەنێرم- بنێرە) (مەنێرە) بەلاّم پێشگری (ڤە) بەدوو شێوە دەردەبڕێ (ڤە د گۆزم -دێ ڤەگۆزم - دێ ڤەدگۆزم - ڤە بگۆزە)(ناڤەگۆزم -ڤە نەگۆزە) بەلاّم پێشگری داڕێژەر لەگەردانکردندا هەردەم نیشانەی کاری (ڕانەبوردوو- فەرمان) لەشێوەی ئەرێنی و نەرێنی دەکەوێتە نێوان پێشگرەکە و چاوگە سادەکە ( ڕادەگرم - ڕا بگرە (ڕا نا گرم - ڕا نە گرە-ڕا مە گرە).

**جیاوازی لەنێوان دەستەواژەی (داڕێژراو - دروستکراو):**

پێویستە دەستەواژە و ناو بۆ ناولێنانی بابەتێك، ڕەنگدانەوەی مەبەست و ناوەڕۆکی بابەتەکە لەخۆی بگرێت، لە ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد، هەردوو دەستەواژەی (داڕێژراو و دروستکراو) بە هاوواتای یەکتر هەژمارکراون.[٤٣] بەلاّم هەروەك ئاشکرایە لەزمانی کوردیدا دەستەواژەی (داڕێژراو) بەواتای دروستکراوێك دێت کە سنوور و چوارچێوەیەکی بۆ دەستنیشان بکرێت و نەتوانێت لێی دەربچێت هەروەکو قالبێك کە شێوەیەکی دیاریکراوی تێدا دادەڕێژرێ، بەلاّم (دروستکراو) بەواتای دروستکردنێك دێت کە هەموو سنوور و چوارچێوەیەك لە دروستبوونیدا دەبەزێنێ، واتاکەی زۆر بەرفراوانترە لەداڕێشتن، بەهەمان شێوە و لێکدانەوە، پێشگرە داڕێژەرەکان هەروەها ( لێکدەرەکان) یش، دەور و ڕۆڵی ئەو قالبە دەبینن کە چاوگەکان سنووردار دەکەن لە دروستبوونیاندا، چونکە پێشگرە بێ واتایەکان چاوگە داڕێژراوەکان سنوردار دەکەن، پێشگرە واتادارەکانیش چاوگە

لێکدراوەکان، بەلاّم چاوگە دروستکراوەکان لەم سنوورو چوارچێوەیەدا دەردەچن، کەواتە داڕێژراو و دروستکراو دوو دەستەواژەن بۆ دوو چەمك و مەبەستی جیاواز، بەلاّم ئەو هۆکارەی کە ئەم دوو دەستەواژەی تێکەڵی یەکترکردووە ئەوەیە، کە لەهەموو حاڵەتێکدا دروستکردن لەشوێنی داڕێشتن بەکاردێت، بەلاّم بەپێچەوانەوە هەردەم داڕێشتن لەشوێنی دروستکردن بەکار ناهێت، چونکە داڕێشتن شێوەیەکە لە دروستکردن، دەتوانی بڵێیت (خانووەکەم دروستکرد) بەلاّم نابێت بڵێیت (خانووەکەم داڕێشت)، بەلاّم دەتوانی بڵێیت (بناغەی خانووەکەم دروستکرد یا داڕێشت).

## چاوگە خۆییەکان:

ئەم چاوگانەی کە جێناوی (خۆ) وەردەگرن، شێوەیەکن لەشێوەکانی چاوگ، بەلاّم وەك پۆلێنکردنێکی سەربەخۆ نەگونجاوە، چونکە ئەرکی ئەم پێشگرە نابێتە هۆی داهێنانی واتای تازە، هەروەك پێشگرە داڕێژەرو لێکدەرەکان لەهەمان کاتدا نابێتە پێشگرێکی یاریدەریش بۆ مەبەستێك لە مەبەستەکان، تا ببێتە هۆی گۆڕینی واتای چاوگە سادەکە بەپێچەوانەی پێشگرو پاشگرە یاریدەدەرەکان.

مەبەست لەبەکارهێنانی ئەم پێشگرە جیاوازە لەگەڵ پێشگرەکانی تر، نووری عەلی ئەمین دەڵێت لە وشەی (خۆ) و ڕاناوی لکاوی (م، مان – ت، تان – ی، یان) دروست دەبێت و لەڕستەدا بۆ تەوکید بەکار دێت[٤٤] سادق بەهائەدین دەڵێت لە شێوەی سەروودا هیچ گۆڕانێك لە(خۆ)دا نابێت چ بۆ نێر و چ بۆ مێ.[٤٥]

## تایبەتمەندی:

– لە ڕووی هێزەوە، هەردەم تێپەڕن بەیاسا، بەلاّم تێنەپەڕن بەواتا، چونکە لە ڕووی واتاوە، کارەکانیان بە تەنیا گەڕانەوەیەکی واتایی هەیە بۆ بکەر و بەرکارە لەیەك کاتدا، بەپێچەوانەی کارە تێپەڕ و تێپەڕکراوە ئاساییەکان کە بکەرو بەرکارەکانیان دەبێتە دوو کاراکتەری جیاواز و کار لەسەر یەکتر دەکەن، بەلاّم بکەر و بەرکارەکانی ئەم جۆرە چاوگانە نابنە دوو کاراکتەری جیاواز تا هەریەکێکیان مەبەستێکی کارەکە دەربڕن هەروەك لە(خۆ فرۆشتن)– خۆ

فرۆشەر–خۆ فرۆشراو / (خۆ سووتاندن) –خۆ سـووتێنەر– خۆسـووتێنراو) واتـای بکەرو بەرکارەکە بەتەنیا بۆ بکەری کارەکە دەگەڕێتەوە.

**پۆلێنکردن:**

– ئەم جۆرە چاوگانە بۆ دوو بەشی سەرەکی دابەش دەبن :

ا– **پێشگری خۆ + چاوگی سادەی (سەربەخۆ– بەیاریدە) = چاوگی سادەی خـۆیی** وەك (خۆسـووتاندن، خـۆ گنخانـدن، خۆکوشـتن، خۆدزینـەوە، خـۆ شاردنەوە....تاد.

ب–**پێشگری خۆ + چاوگی ناسادە = چـاوگی ناسـادەی خـۆیی** وەك (خـۆ هەڵ کێشان، خۆ بە زل زانـین، خـۆ دانووسـاندن، بـەخۆدا چـوونەوە، لـەخۆ بـایی بوون....تاد).

**چاوگەکانی بنیات[٤٦]:**

ئەم چاوگانە هەر چاوگی سادەن، بەڵام چالاك و کاراترن لە چاوگە سادەکانی تر لەدروستکردنی هەموو جۆرەکانی چاوگی ناسادە بریتین لە **(کردن، بردن، دان، خستن، بوون، چوون، هێنان، هاتن، کەوتن، کێشان، گرتن، بڕین، مان، نان )**

**پێوەری هەژمارکردنی چاوگی سادە بەچاوگێکی بنیات :**

١– ببێتـە بنیاتنـەری هـەموو جۆرەکـانی چـاوگ بەناسـادەیی (داڕێـژراو، لێکدراو، دروستکراو)، چونکە ئەم پێوەرە چالاکی و ناچـالاکی چـاوگەکانمان بـۆ بەدەردەخات لەنێو شێوەزارەکاندا.

– لەئەنجامی بەدواداگەڕان و بـەراوردکردنی چـاوگە سـادەکان ئـەوە ڕوون دەبێتـەوە کـە ئـەم چـاوگانە لـەڕووی دروسـتکردنی چـاوگی ناسـادەدا لەهـەموو چاوگەکانی تر چالاکترن لەبەکارهێناندا وەك (کردن) – هـەڵ کـردن – ئـازادکردن، دەست بەکارکردن....تاد (دان ) –پـێ دان، گەمارۆ دان، پـێ دا هـەڵ دان.....تـاد چاوگەکانی تریش بەهەمان شێوە.

٢– گرنگترین سیفەتی چاوگەکانی بنیات ئەوەیە، کە لەگەڵ حەفت پێشـگری داڕێژەر و زیاتر یەکبگرێت و واتایەکی تازە دابهێنێت، ئەم ڕێژەیەش دەکاتە زیاتر لەیـەك لەسـەر سـێی پێشـگرە داڕێـژەرەکان، چـونکە ئـەم پێـوەرە ئـەوەمان بـۆ

بەدەردەخات، کە هەموو چاوگێکی سادە توانای دروستکردنی چاوگی داڕێژراوی نییە لەگەڵ ئەم ڕێژەیەدا وەك :

١- (گرتن) { دا گرتن، هەڵ گرتن، وەرگرتن، تێ گرتن، تێك گرتن، پێ گرتن، پێك گرتن، لێ گرتن، لێك گرتن، ڕاگرتن، بەر گرتن، ژێ گرتن.....تاد.

٢- (خستن) {داخستن، هەڵ خستن، ڕاخستن، تێ خستن، تێك خستن، لێ خستن، ژێ خستن، ڤێ خستن....تاد.

٣- (کردن) {داکردن، هەڵ کردن، ڕاکردن، تێ کردن، تێك کردن، پێ کردن، پێك کردن، لێ کردن، ژێ کرن، ژێك کرن....تاد.

٤-(دان) { دادان، هەڵ دان، ڕادان، پێ دان، بەر دان، تێك دان، لێ دان، وێ دان، ڤێ دان، ژێ دان......تاد.

٥- (بردن) { دا بردن، ڕابردن، تێ بردن، تێك بردن، لێ بردن، لێك بردن، ژێ برن، ژێك برن....تاد.

٦-(بوون) { ڕابوون، هەڵ بوون، بەر بوون، پێ بوون، لێك بوون، ژێك بوون، ژێ بوون....تاد .

٧- (چوون) {داچوون، هەڵ چوون، ڕا چوون، تێ چوون، تێك چوون، پێ چوون، پێك چوون....تاد.

٨-(کەوتن) {دا کەوتن، هەڵ کەوتن، بەر کەوتن، لێ کەوتن، پێ کەوتن، پێك کەوتن، تێ کەوتن، وێك کەوتن....تاد.

٩- (هێنان) { داهێنان، ڕاهێنان، هەڵ هێنان، تێ هێنان، پێك هێنان، وەر هێنان، ژێك ئینان.....تاد.

١٠-(هاتن) {داهاتن، ڕاهاتن، هەڵ هاتن، لێ هاتن، پێك هاتن، ژێ هاتن، ژێك هاتن....تاد.

١١-(کێشان) {داکێشان، ڕاکێشان، هەڵ کێشان، تێ کێشان، تێك کێشان، پێ کێشان، پێك کێشان....تاد.

١٢-(بڕین) {دا بڕان، دابڕین، هەڵ بڕین، لێ بڕان، لێ بڕین، پێ بڕان، پێك بڕین، تێ بڕین، تێك بڕین....تاد.

١٣–(مان) { دامان، ڕامان، هەڵ مان، تێ مان، پێ مان، ژێ مان، وێ مـان، ڤێ مان.....تاد.

١٤– (نان) {دانان، هەڵ نان، تێ نان، تێك نان، لێ نان، لێك نـان، پێوەنـان، پێك وەنان....تاد.

**تێبینی :**

ئەگەرچی بەگشتی چاوگە سادەکان لە زمانی کوردیدا توانـای دروسـتکردنی چـاوگی ناسـادەیان هەیـە، ئەمـەش سـەلمێنەری ئـەو تایبەتمەندییەیـە، کـە زمانەکەمان هەیەتی وەك زمانێکی لێکدراو، بەڵام هەموو چاوگەکان لەیەك ئاسـتی چالاکیدا نینە، تا بەچاوگی بنیات هەژمار بکرێن، چونکە وەکـو یـەك بەشـدار نـابن لەدروستکردنی هەموو جۆرەکانی چاوگی ناسادە، بەڵکو چەند چاوگێکی ناسادە دروسـت دەکـەن لـە یـەکێك لـەجۆرەکان وەك ئـەم چـاوگانە : – تۆڵـە سـەندن، باوسەندن – خەو دیتن (بینین)، لێ ڕا دیتن، دوور بینین – داشکاندن، ڕاشکان، دڵ شکاندن – جووتکە هاوێشتن، لووشـکە هاوێشـتن – ئـاوات خواسـتن – خەفـەت خواردن – لە زگ وەستان – یەخە دا درین – قوڕ پێوان – سـەر لێ شـێوان – بـە خاك سپاردن – چاو لێ پۆشین – دڵ ڕەنجاندن – خەو زڕان – شیوەن گێـڕان – پـەل کوتـان، سـنگ داکوتـان –خـوێن تـێ زان – پێـدا هـەڵ خوێنـدن – پـەیمان بەستن، درۆ هەڵ بەستن.....تاد هەروەك دیارە لەم چاوگانەدا کە هـەموو چـاوگە سـادەکان لەئاسـتی چـالاکی چـاوگەکانی بنیاتـدا نینـە، چـونکە نـاتوانن چـاوگی ناسادەی داڕێژراو و لێکدراو و دروستکراو لەیەك کاتدا بەچالاکی چاوگەکانی بنیات دروسـت بکـەن، لـە هـەمان کاتیشـدا نـاتوانن لەگـەڵ ئـەو ڕێژەیـە لەپێشـگرە داڕێژەرەکان یەك بگرن و واتایەکی تازە دابهێنن، بـەڵام ئەگـەر هـەر چـاوگێکی تـر هەمان سیفەتی چاوگەکانی بنیاتی هـەبێت، بەچـاوگێکی بنیـات هـەژمار دەکرێـت، بەمەرجێك زۆرترین بەکارهێنانی هەبێت بەبێ جیاوازی لەنێو شێوەزارەکاندا .

## جیاوازی لەنێوان چاوگەکانی بنیات و کارە یاریدەدەرەکان:

پێناسەی چاوگەکانی بنیات جیاوازە لەکارە یاریدەدەرەکان، ئەگەر هەنـدێ چـاوگ هـەردوو دەوریـش ببیـنن، چـونکە ئەرکـەکانیان لەیـەکتر جیـاوازە، کـاری یاریـــدەدەر دەبێتـــە هـــۆی دروســـتکردنی شـــێوازێك لەبابـــەتێکی ڕێزمانیـــدا،

بەبەردەوامیش ئەرکی جێبەجێکردن و دروستکردن و یاریدەی شێوازێك دەدەن هەروەك (هاتن) كە یاریدەی دروستکردنی شێوازی کاری بکەری نادیاری دەدات لەکرمانجی سەرووداو (بوون) لەهەردوو زارە سەرەکییەکەی کوردی (کرمانجی ژێری– ژووروو ) شێوازی تایبەتی دروست دەکات لەڕابوردوو و ئایندەدا وەك (کردبووم –کردبێتم – دەبوو بمکردایە)[٤٧] وێڕای ئەم دوو چاوگە دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف چەند چاوگێکی تریشی بە یاریدەدەر داناوە وەك (هانین، هێنان، خستن، کەوتن، دان، کردن) کە دەڵێ تەنیا لەدۆخێکدا دەبنە یاریدەدەر، کە چاوگ بەدوایاندا بێت، لەو حاڵەتانەدا مەبەست تەنیا نە بەچاوگە رووتەکە ڕادەگەیەنرێ و نە بەکردارە یاریدەدەرەکە، بەڵکو بەهاریکاری هەردووکیان ئەنجام دەدرێ، هەروەها دەڵێ هەموو ڕواڵەتێکی بەیەکەوە هاتنی کردارێك لەگەڵ کردارێکی دی ناکرێ تێیدا کردارەکەی پێشەوەی بەیاریدەدەر دابنرێ[٤٨]

کەواتە چاوگەکانی بنیات وکارە یاریدەدەرەکان دوو شێوەی جیاوازن بۆ دوو مەبەستی جیا، هەر یەکێکیان پێناسەیەکی تایبەتی خۆیان هەیە، چونکە هەریەکێکیان ئەرکێکی تایبەت جێبەجێ دەکەن.

### پێوەری هەژمارکردنی پێشگرەکانی داڕێژەر:

لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەی کە پێشگرە داڕێژەرەکان هەیانە، بەڵام پێویستە پێوەرێك بۆ دەستنیشانکردنی پێشگرە داڕێژەرەکان دابنێین بۆ ئەوەی جیاوازی لەدەستنیشانکردنی پێشگرەکاندا نەهێڵین هەروەك لەئێستادا هەست پێ دەکرێت، گرنگترین مەرجی سەرەکیش لە هەژمارکردنی پێشگرە داڕێژەرەکان ئەوەیە کە بتوانێ لەگەڵ حەفت چاوگی بنیات و زیاتر یەك بگرێ بەشێوەی سەربەخۆو گرێی ناوی واتایەکی تازە دابهێنێ هەروەك ئەم پێشگرە داڕێژەرانە :

١– (دا) –دا گرتن، دا کردن، دا خستن، دا هێنان، دا نان، دا هاتن، دا بڕین، دا مان.....تاد.

٢– (ڕا)– ڕا گرتن، ڕا کردن، ڕا خستن، ڕا هێنان، ڕا دان، ڕا هاتن، ڕا کێشان، ڕا بوون، ڕا مان...تاد.

٣- (هەڵ)-هەڵ گرتن، هەڵ کردن، هەڵ خستن، هەڵ هێنان، هەڵ دان، هەڵ هاتن، هەڵ کێشان، هەڵ بوون...تاد.

٤- (وەر)- وەر گرتن، وەر کردن، وەر کەوتن، وەر دان، وەر هاتن، وەر بوون، وەر هێنان....تاد.

**سەرنج:**

ئەم پێشگرە زیاتر لەگەڵ پێشگری (تێ - پێ) بەشێوەی ناسادەیی بەکاردێت وەك (تێ وەردان، تێ وەر هاتن، پێ وەر هاتن، تێ وەر هێنان، تێ وەربوون، پێ وەر بوون، تێ وەرکردن، پێ وەرکردن ..تاد).

٥- (بەر)-بەرگرتن، بەردان، بەربوون، بەرکەوتن، بەرخستن، لەبەرکردن، وەبەرهێنان...تاد.

٦-٧- (وێ، وێك) - وێ کەوتن، وێك کەوتن، وێ کردن، وێ دان، وێ بوون، وێك چوون، وێ مان، وێك گرتن.....تاد.

٨-٩- (ڤێ، ڤێك) -ڤێ خستن، ڤێ دان، ڤێك دان، ڤێ کەفتن، ڤێك ئینان، ڤێك چوون، ڤێك کرن......تاد.

١٠-١١- (پێ، پێك)-پێ کردن، پێ کەوتن، پێك کەوتن، پێ بوون، پێ مان، پێ دان، پێك هێنان، پێك هاتن....تاد.

١٢-١٣- (تێ، تێك) - تێ گرتن، تێ کردن، تێ خستن، تێك خستن، تێ نان، تێك نان، تێ کەوتن، تێ بڕین، تێ هێنان...تاد.

١٤- ١٥- (لێ، لێك )- لێ گرتن، لێ کردن، لێ کەوتن، لێ دان، لێك دان، لێ هاتن، لێ بوون، لێ چوون، لێك چوون....تاد.

١٦-١٧- (ژێ، ژێك) - ژێ بوون، ژێ کرن، ژێ هاتن، ژێ گرتن، ژێك دان، ژێك برن، ژێ چوون، ژێك چوون....تاد.

**تێبینی:**

ئەگەر هەر پێشگرێکی تر هەمان تایبەتمەندی و سیفەتی ئەم پێشگرانەی هەبێت لەدروستکردنی چاوگی ناسادەو یەکگرتنی لەگەڵ ئەم ڕێژەیە لەچاوگەکانی بنیات، بەپێشگرێکی داڕێژەر هەژمار دەکرێت، بەمەرجێك زۆرترین بەکارهێنانی هەبێت لەنێو شێوەزارەکاندا.

**چاوگ لە شیکردنەوەدا:**

١- **(وەشان)** چاوگێکی سادەی تێنەپەڕی سەربەخۆیە.

- وەشان + دن / چاوگێکی سادەی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی تێپەڕکردن.

- **هەڵ** + وەشان / چاوگێکی داڕێژراوی تێنەپەڕە.

-**هەڵ** + وەشان + ەوە /چاوگێکی داڕێژراوی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی دووبارەیی.

- **هەڵ** + وەشان + دن / چاوگێکی داڕێژراوی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی تێپەڕکردن.

- **هەڵ** + وەشان + دن + ەوە / چاوگێکی داڕێژراوی بە یاریدەیە بۆ مەبەستی تێپەڕکردن و دووبارەیی.

- دەست + ڕا + وەشان /چاوگێکی دروستکراوە

- دەست + ڕا + وەشاندن / چاوگێکی دروستکراوی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی تێپەڕکردن.

٢- **(شێرین - شاردن)** چاوگێکی سادەی تێپەڕی سەربەخۆیە.

- وە + شاردن / ئا + شاردن / شران + ەوە / شێرین + ەوە / شاردن + ەوە/ ڤە + شارتن، چاوگێکی سادەی تێپەڕی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی گونجان بەتایبەتمەندی شێوەزارەکان.

٣- **(ناردن)** چاوگێکی سادەی تێپەڕی سەربەخۆیە.

- **هە** + ناردن / **ه** + نارتن، چاوگێکی سادەی تێپەڕی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی بە**هێ**زکردنی واتای چاوگە یا تایبەتمەندییەکی شێوەزارە

- ناردن + ەوە / چاوگێکی سادەی تێپەڕی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی دووبارەوگەڕانەوە.

٤- **(سووتان)** چاوگێکی سادەی سەربەخۆی تێنەپەڕە.

- سووتان + ەوە / چاوگێکی سادەی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی گۆڕینی چەمکی واتا.

-سووتان + دن / چاوگێکی سادەی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی تێپەڕکردن.

– سـووتان + دن + ەوە / چـاوگێکی سـادەی بـە یاریدەیـە بـۆ مەبەسـتی تێپەڕکردن و دووبارەیی.

–زگ + سووتان / چاوگێکی نسادەی لێکدراوە.

– زگ + سـووتان +دن / چـاوگێکی ناسـادەی لێکـدراوی بەیاریدەیـە بـۆ مەبەستی تێپەڕکردن.

**٥– (خواردن) چاوگێکی سادەی سەربەخۆی تێپەڕە.**

– وە + خـواردن – ڤـە + خـوارن، چـاوگی سـادەی سـەربەخۆی تێپـەڕی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی بەهێزکردنی واتای چاوگە سادەکەیە یا تایبەتمەندییـەکی شێوەزارە .

– خواردن + ەوە –خواردن + ەڤە / چاوگی سادەی تێپەڕی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی گۆڕینی چەمکی واتا.

– نان خواردن / چاوگێکی لێکدراوی تێپەڕە.

– ئاو خواردن + ەوە / چاوگێکی ناسادەی لێکدراوی تێپەڕی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی گۆڕینی چەمکی واتا.

**٦– (کردن) چاوگێکی سادەی سەربەخۆی تێپەڕی ناوازەیە.**

– وەکـردن، ڤـەکرن، کردنـەوە، کرنەڤـە / چـاوگێکی سـادەی تێپـەڕی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی داهێنانی واتا و دووبارەیی.

– تێ + کردن / چاوگێکی ناسادەی داڕێژراوی تێپەڕە.

–تـێ + کـردن + ەوە / چـاوگێکی داڕێـژراوی بەیاریدەیـە بـۆ مەبەسـتی دووبارەیی.

– دروست کردن / چاوگێکی لێکدراوی تێپەڕە.

– دروسـت کـردن + ەوە /چـاوگێکی لێکـدراوی بەیاریدەیـە بـۆ مەبەسـتی دووبارەیی.

– دەرگـا کـردن + ەوە / چـاوگێکی لێکـدراوی بەیاریدەیـە بـۆ مەبەسـتی داهێنانی واتایەکی تازە.

–کارکردن / چاوگێکی لێکدراوی تێپەڕە.

– دەست بەکار کردن / چاوگێکی دروستکراوی تێپەڕە.

– دەست بەکارکردن + ەوە / چاوگێکی دروستکراوی تێپەڕی بەیاریدەیە بۆ مەبەستی دووبارەیی.

**سەرنج:**

هەروەك لەپێشتردا ڕوونمان کردۆتەوە کە لەهەندێ چاوگی دەگمەنداو لەهەندێ حاڵەتدا (ەوە – ڤە) بێجگە لەئەرکی دووبارەکردنەوە دەبێتە داهێنەری واتای تازەش، بۆیە بەگوێرەی مەبەستی ئاخێوەرو پێشگرە داڕێژەرو لێکدەرەکان، لەڕستەدا مەبەست لەدانانیان ڕوون دەبێتەوەو شیکردنەوەی بۆ دەکرێت.

**ئەنجام:**

لەکۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا بەچەند ئەنجامێك گەیشتین.

١- شێوە پۆلێنکردنێکی گشتگیر لەڕوانگەی واتاگۆڕی و داهێنانی واتای تازە لەسەر چاوگە سادەکان بەتایبەتمەندی و جیاوازی شێوەزارەکان، چونکە تایبەتمەندی و جیاوازی شێوەزارەکان نابێت ببێتە هۆکار بۆ لەیەکترجیابوونەوەی شێوەی پۆلێنکردنەکان.

٢- داهێنانی واتای تازەو گۆڕینی واتا دوو چەمکی جیاوازن بۆ دوو مەبەستی جودا، دەورو ڕۆڵی پێشگرو پاشگرەکان هەردوو چەمك لەیەکتر جیادەکەنەوەو مەبەستەکان بەدەردەخەن، چونکە هەندێکیان دەبنە داهێنەری واتای تازەو بزووتنەوەی جیا بەواتای چاوگەکان دەکەن، هەندێکی تریان دەبنە گۆڕیاری واتای چاوگەکە بۆچەند مەبەستێکی جودا لەسەر چاوگە سادەکان.

٣- پێشگرە یاریدەدەرەکانی ( هە، ئە، ئا، ڤە، وە ) پاشگرەکانی ( ەوە، ەڤە، اندن ) واتا گۆڕی بەچاوگە سادەکان دەکەن و دەبنە جیاکەرەوەی چاوگە سادەکان، چونکە یاریدەی چاوگە سادە و سەربەخۆیەکان دەدەن بۆ چەند مەبەستێك، مەبەستەکانیش (دووبارەکردنەوە و بەردەوامی و پێچەوانەیی و گەڕانەوەو تێپەڕاندنە) یا گونجان و تایبەتمەندی شێوەزارێکە یا بنج و بناغەی چاوگەکەیە بۆ مەبەستی بەهێزکردنی واتای چاوگ و کارەکە، ئەم مەبەستانەش هەرگیز لەواتای چاوگە سادەکان دوور ناکەونەوە، بەڵکو هەر هەمان واتای چاوگە سادەکەیە، بەڵام جارێکی ترو بەشێوازێکی تر ئەنجامی دەدەیتەوە، لەبەر ئەوە چاوگە سادەکان دابەش دەبن بۆ سادەی (سەربەخۆ - بەیاریدە).

٤- پێشگرە داڕێژەرە بێ واتایەکان (دا، ڕا، هەڵ، وەر، بەر، وێ، وێك، ڤێ، ڤێك، پێ، پێك، تێ، تێك، لێ، لێك، ژێ، ژێك ) و لێکدەرە واتادارەکان، لەداهێنانی واتای تازەدا جیاکەرەوەی چاوگە ناسادەکانن، چونکە واتای تازە لەسەر چاوگە سادەکان دادەهێنن و چاوگی ناسادەی (داڕێژراو و لێکدراو) دروست دەکەن.

٥- بەیەکگرتن و تێکەڵبوونی پێشگرە داڕێژەر و لێکدەرەکان بەشێوەی ناسادەیی و گرێی ناوی، ئاستێکی تر و جیا لە چاوگی ناسادە دروست دەبێت، چونکە دەبێتە هۆی داهێنانی واتای تازەو گۆڕینی واتا بەیەکەوە، لە هەندێ حاڵەتیشدا لەڕووی هێزەوە تێنەپەڕ دەکات بە تێپەڕ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە چاوگی ناسادەی (دروستکراو) ساز ببێت.

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

١- نووری عەلی ئەمین / ڕێزمانی کوردی چ٢، ٢٠١٢، ل١٣٦.
٢- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی لە کۆڕی زانیاری کورد چ٢، ٢٠١١، ل٢٢٢.
٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٣٢.
٤- ڕێزمانی کوردی / بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی پێنجەم (کردار)/ پ. د. ئەورەحمانی حاجی مارف چ٢، ٢٠١٤، ل٣٩.
٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨ تا ٨٨.
٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩٣.
٧- هەندێك لایەنی زاری فەیلی / د، تارا عەبدوڵڵا سەعید ٢٠١٤، ل٢٣.
٨- زمان و ئەدەبی کوردی/ پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی / لیژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە چ٦، ٢٠١٢، ل٢٩.
٩- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی لە کۆڕی زانیاری کورد چ٢، ٢٠١١، ل١٩٧.
١٠- ڕێزمانی کوردی / بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی پێنجەم (کردار)/پ. د. ئەورەحمانی حاجی مارف چ٢، ٢٠١٤، ل٧٢.
١١- زمان و ئەدەبی کوردی / پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی / لیژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە چ٦، ٢٠١٢، ل٢٩.
١٢- زاراوەسازیی پێوانە / مەسعوود محەممەد / چ٢، ٢٠١١، ل٣٥.
١٣- ڕێزمانی کوردی / بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی پێنجەم (کردار)/پ. د. ئەورەحمانی حاجی مارف چ٢، ٢٠١٤، ل٧٢.
١٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٨.
١٥- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی لە کۆڕی زانیاری کورد چ٢، ٢٠١١، ل١٩٩.
١٦- ڕێزمانی کوردی/بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی پێنجەم (کردار)/پ.د. ئەورەحمانی حاجی مارف چ٢، ٢٠١٤، ل٧٧. لە پەراوێزدا.
١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٧٤.
١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧١.
١٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٨٧.
٢٠- هەندێك لایەنی زاری فەیلی/ د. تارا عەبدوڵڵا سەعید ٢٠١٤، ل٢٨.

٢١– ڕێزمـانی کـوردی/ بـەرگی یەکـەم (وشەسـازی) بەشـی پێنجـەم (کـردار)/پ.د. ئەورەحمانی حاجی مارف چ٢، ٢٠١٤، لا٧٥.
٢٢– زارە کوردییەکان/ پ. ی. عەبدولواحید موشیر دزەیی چ١، ٢٠١١، لا١٢٤.
٢٣– هەمان سەرچاوەی پێشوو لا١٠٠.
٢٤– هەمان سەرچاوەی پێشوو لا٧٧.
٢٥– هەمان سەرچاوەی پێشوو لا٥١.
٢٦– نووری عەلی ئەمین / ڕێزمانی کوردی چ٢، ٢٠١٢،لا١٧١.
٢٧– ڕێزمانی ئاخـاوتنی کـوردی بـەپێی لێکۆڵینـەوەی لیژنـەی زمـان و زانسـتەکانی لـە کۆڕی زانیاری کورد چ٢، ٢٠١١، لا١٩٧.
٢٨– هەمان سەرچاوەی پێشوو لا٢٣٢.
٢٩– زاراوەسازیی پێوانە/ مەسعوود محەممەد / چ٢، ٢٠١١، لا٧٣.
٣٠– ڕێزمـانی کـوردی/ بـەرگی یەکـەم (وشەسـازی) بەشـی پێنجـەم (کـردار)/پ.د. ئەورەحمانی حاجی مارف چ٢، ٢٠١٤،لا٧٤.
٣١– هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٨٥.
* بۆنموونەی زیاتر بڕوانـە فەرهـەنگی هەنبانـە بۆرینـە – هـەژار موکریـانی/ فەرهـەنگی باشوور– عەباسی جەلیلیان
٣٢– پیتۆکەکانی زمانەوانی /پ.د. وریا عومەر ئەمین چ١، ٢٠١١، لا٥٣.
٣٣– ڕێزمـانی کـوردی / بـەرگی یەکـەم (وشەسـازی) بەشـی پێنجـەم (کـردار)/پ.د. ئەورەحمانی حاجی مارف چ٢، ٢٠١٤، لا٥٦.
٣٤– زمانەوانی / پ. د. یوسف شەریف سەعید چ١، ٢٠١١، لا١٤٧.
٣٥– شێوەزارەکانی زمانی کوردی لە نێوان کۆن و کۆنتر و نوێدا/ کازم عـەباس عـەلی – گۆڤاری ڕامان – ٢٠١٤، ژمارە ٢١٠.
٣٦– زمانەوانی / پ. د. یوسف شەریف سەعید چ١، ٢٠١١، لا١٤٧.
* نیشـــانە بنەڕەتییـــەکانی (ا ، ی) لـــەزمانی کوردیـــدا بەتێپـــەڕینی ســـەردەم و بەکاریگەرییـەکانی گۆڕاون بـۆ نیشـانەکانی (ت ، د ، ست ، شت ، وو ، ر) چـونکە هەموو چاوگێکی دروستبوو بەم نیشانانە، بەنیشانەی بنەڕەتی چاوگی بەرانبەریان هەیـە، بێجگـە لـە ناوازەکـان و خوازراوەکـان لەیـەکێك لـە شـێوەزارەکاندا وەك (پالأوتن)، پالوین، پالێن، پالزنین / (خوێندن)، خونـدن، خینـدن، خوانـدن، وەنـدن، خوەینین / (ڕۆیشتن) ڕۆیـین / (نووسـتن) نڤـین / (دروون) درویـن، دوورین / (مـرن، مردن) مرین.....تاد). بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە چاوگ سەرچاوەو ژێدەرە لا٨٦
٣٧– فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی/ ڕۆژان نووری عەبدوڵلا چ٢، ٢٠١٣، لا٩٧.

٣٨- پەیوەندی چاوگەکان لەزاراوە جیاوازەکانی زمانی کوردیدا / کازم عەباس عەلی چ١، ٢٠١٤، ل٣٩٧ تا ٧٩.
٣٩- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی لەکۆڕی زانیاری کورد چ٢، ٢٠١١، ل٩٤.
٤٠- ڕێزمانی کوردی/ بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی پێنجەم (کردار)/پ. د. ئەورەحمانی حاجی مارف چ٢، ٢٠١٤، ل٨٦.
٤١- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٩.
* لە پێشترداو لە بابەتی پێشگرەکاندا لێکدانەوەمان بۆ ئەم پێشگرە کردووە .
٤٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٠.
٤٣- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی لە کۆڕی زانیاری کورد چ٢، ٢٠١١، ل٢٣١.
٤٤- نووری عەلی ئەمین/ ڕێزمانی کوردی چ٢، ٢٠١٢، ل٩١.
٤٥- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی لە کۆڕی زانیاری کورد چ٢، ٢٠١١، ل٥٥
٤٦- چاوگ سەرچاوە و ژێدەرە / کازم عەباس عەلی چ١، ٢٠١٣، ل ١٧٥.
٤٧- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی لە کۆڕی زانیاری کورد چ٢، ٢٠١١، ل١٢٧.
٤٨- ڕێزمانی کوردی / بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی پێنجەم (کردار)/پ. د. ئەورەحمانی حاجی مارف چ٢، ٢٠١٤، ل٢٧٠.

## ملخص البحث

هذه الدراسة بعنوان تصنيف المصادر حسب المعاني، الغرض منه تعميم شكل من التصنيف لكي يملأ مكان التصانيف الاخرى على ضوء خصوصية واختلاف اللهجات وواجبات الادوات البادئة واللاحقة، لأن الأدوات لهم دور في تفريق وتكوين المصادر غير البسيطة على المصادر البسيطة.

– يتصنف الادوات الى صنفين مختلفين، البعض منهم يبنون المعاني الجديدة على المصادر البسيطة، ويكونون المصادر الغير بسيطة، والبعض الآخر يُغيرون ألمعاني للمصادر البسيطة بقصدٍ من المقاصد (التكرار و الاستمرارية – المعكوسة والرجوعية – وتغير لازم الى المتعدي) او خصوصية للهجةٍ او مكون اساسي للمصدر، ولكن في كل الحالات هذه المقاصد لا يحتسب كمكون للمعاني الجديدة على المصادر البسيطة الا نادراً، لأن معناها لا يبتعد عن المعنى الاساسي للمصدر البسيط، بل يُنفذها الفاعل بشكل مختلف لغرض معين ومحدد، ولهذا السبب يتكون المصادر بالمساعدة على المصادر البسيطة .

## Abstract

This research entitled Classifying Infinitive Through Meaning.The aim of this research is the comprehensive classification form to replace the other classifications. Because it is noticed that the peculiarity and difference of dialects and the function of prefixes and suffixes through the invention of new meaning and its change about simple infinitives.

The invention and change of meaning are two different ideas for two different purposes. The prefixes and suffixes take the role of the differentiation of this classification form because it will be two different classes through function.

Each class does special function. Some of them will be the inventor of new meaning on simple infinitives which makes complicated the sorts of infinitives. And the others will be auxiliary which change the simple infinitives into several ( specific / identified ) purposes. But the purpose is not inventing new meaning. These aims of the simple infinitive do not avoid from the meaning. So the simple infinitive with auxiliary will be made on the simple infinitives.

# ڕۆڵی پاڵنەرەکان لە ئاراستەکردنی ناوەرۆکی دەقی شیعری بەنموونەی شیعری (سالم)

**مامۆستای یاریدەدەر: ڕێبوار محەمەد ئیسماعیل**
بەشی زمانی کوردی – کۆلێژی پەروەردە–
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

## پێشەکی

پێکهاتە و حاڵەت و دیاردە دەروونییەکان پێکهێنەری ژیانی مرۆڤن، هاوشانی ڕەهەندە فیزیکی و جەستەیییەکان بەشدارن لە تەواوکردنی ناسنامەی مرۆڤبوون وەك دروستکراوێك، ئەم دوو لایەنە سەرەکییە واتە لایەنە دەروونی و جەستەیییەکان مرۆڤیان لە دۆخ و قالبێکی تایبەت ئاخنیوە، تایبەتمەندییان بە ئادەمیزاد بەخشیوە، ئەم تایبەتمەندییەی مرۆڤیش هەمیشە جێگای تێڕامان و لێکۆڵینەوەی زاناکان بووە، لە بواری جیاجیادا زانستییانە لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ دواون.

سایکۆلۆژیا وەك زانستێك، ڕاوەستانە لەسەر ڕەهەندە دەروونییەکانی مرۆڤ، لێکۆڵینەوە لە پێکهێنەرە سەرەکی و لاوەکییەکانی دەروونی تاك دەکات بە هەموو ئەو ئاڵۆزی و تایبەتمەندییانەی، کەوا هەیەتی. پێکهێنەرە دەروونییەکانی مرۆڤیش خۆیان لە (پاڵنەرەکان، سۆزەکان، هەڵچوونەکان، چەپاندن، حەز و ئارەزووەکان.... تاد) دەبیننەوە، هەموو ئەمانە دەچنە بازنەی دەروونی مرۆڤەوە و لەوێیەوە فشار و کاریگەری ئیجابی و سەلبی دەخەنە سەر مرۆڤ، بە شێوەی جیاجیا مرۆڤ دەجووڵێنن بۆ ڕەفتار و هەڵوێستی جۆراوجۆر ئاراستەی دەکەن، مرۆڤ لە ژێر باری ئەم پێکهێنەرە دەروونییانە وەڵامی وورووژێنەرەکانی دەوروبەری خۆی ئەداتەوە، هەمان دەوروبەریش لە ڕێگەی هەستەکانی مرۆڤەوە کار لەو

پێکهێنەرانــە دەکــات و گۆڕانکارییــان بەســەردا دێنێــت، بــە شــێوەی جیاجیــا پەروەردەیان دەکات، هەر ئەو کارتێکردن و پەروەردەکردنەشە کەوا دەبێتە هـۆی بەرهەمهێنانی کەسایەتیی جیاواز لە ناو کۆمەڵگادا.

پاڵنەرەکان وەك یەکێك لە پێکهێنە دەروونییەکانی مرۆڤ، هێزی بەڕێوەبردنی مــرۆڤ و توانــای ئاراســتەکردنی ڕەفتارەکــانی مرۆڤیــان هەیــە لــە هەڵوێســتە جیاوازەکاندا، پاڵنەرەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە کـار لەسـەر سـاغی و ناسـاغی دەروونی مرۆڤ دەکەن و کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر چـۆنییەتی مامەڵـەکردنی تاکەکانی کۆمەڵگا و بەرهەمهێنانی لایەنی هونەری و داهێنانەوە هەیە، ئەمـەش لـە ڕێگەی دروسـتکردنی ئـەو هێـز و فشـارەوە دەبێـت، کـە دەیخەنـە سـەر مـرۆڤ بـۆ پڕکردنـــەوەی پێویســـتییە جەســـتەیی و دەروونییـــەکان، بـــوونی پێویســـتییە جۆراوجۆرەکان و دابین نەکردنی پێویستییەکان و پڕ نەکردنـەوەیان دەبێتـە هـۆی دروستبوونی بۆشایی دەروونی، بەمەش پاڵنەرەکان پاڵەپەستۆ دەخەنە سەر تـاك بـۆ پڕکردنـەوەی بۆشـاییەکان و دەستخسـتنی پێویسـتییەکان جـا بـە شـێوەی ڕاسـتەوخۆ بێـت یـان ناڕاسـتەوخۆ. جووڵـەی تـاك بـە هـەموو جۆرەکانیـەوە وەك مامەڵــەکردن و ئاخــاوتن و چــالاکییە جەســتەیی و فکرییــەکان، ئــەوا پاڵنــەری جۆراوجۆری لە پشتەوەیە لـە ڕووی سـایکۆلۆژییەوە، ئـەوەی لێـرەدا مەبەسـتمانە ڕۆڵی پاڵنەرەکانە لەسەر ئەنجامدانی چالاکیی ئەدەبی لەلایەن مرۆڤەوە، کە لە ژێر هێـزی پاڵنەرەکانـەوە دێتـە بەرهـەم و ئـەم هێـزە نووسـەر و شـاعیر بـۆ کـردەی دەربڕین و نووسینی دەق ئاراستە دەکات، مەبەسـت و نـاوەڕۆکی دەقەکـە دیـاری دەکەن، بە مەبەستی پڕکردنەوەی بۆشاییە دەروونییەکان و تێرکردنـی پێویسـتی و حەز و ئارەزووە جەستەیی و دەروونییەکان.

ئەم توێژینەوەیە، کە لە ژێر ناونیشانی (ڕۆڵی پاڵنـەرەکان لـە ئاراسـتەکردنی نـاوەڕۆکی دەقــی شـیعری بـە نموونــەی شـیعری سـالم. لێـرەدا بـاس لـە ڕۆڵ و کاریگـەری جۆرەکـانی پاڵنـەر دەکـەین لەسـەر بەرهـەمهێنانی دەقـی شـیعری بـە شێوەیەکی گشتی لە ڕێگەی ئاماژە کردن بە نموونـەی شـیعری سـالم. کەسـایەتی ئەم شاعیرە جۆرێك لە جۆرەکانی پاڵنەری لە پشتەوەیە، کە لە نائاگـایی و دیـوی شاراوەی دەقە شیعرییەکاندا هەست بە بوونیان دەکرێـت، شـاعیر نائاگاییيانـە لـە

ژێر باری فشار و هێزی ئەم پاڵنەرانە دەقی شیعری بۆ مەبەستی جیاجیا ئاراستە کردووە لە ڕووی ناوەرۆکەوە، هەموو ناوەرۆکێکی دەقی شیعری بەشێوەیەك لە شێوەکان گوزارشت لە بوونی جۆرێك لە جۆرەکانی پاڵنەر دەکات.

**پێناسەی پاڵنەر:**

پاڵنەر بەشێکی گرنگە لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی دەروونی مرۆڤ، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەرییان هەیە لە دروستکردن و نمایشکردنی جۆری ڕەفتار و کەسایەتی مرۆڤەکان، لە بارودۆخی جیاجیادا مرۆڤ بە شێوەی جۆراوجۆر بارگاوی دەکەن و بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجەکان ئاراستەیان دەکەن، لەبەر ئەوەی هەڵسوکەوت و ڕەفتار و جووڵە و چالاکی تاك پەیوەستە بە پاڵنەرەکانەوە بۆیە ناساندن و تێگەیشتن لە چەمك و جۆرەکانی پاڵنەر گرنگی زۆری لە ژیانی مرۆڤدا هەیە، لە ڕێگەی شارەزابوون لە پاڵنەرەکان دەتوانین لە سروشتی ڕەفتار و چالاکی و کاردانەوەکانی تاك بگەین، چونکە ( هیچ هەڵسوکەوت و بیرکردنەوە و هەڵچوونێك بەبێ بوونی پاڵنەر ڕوونادات، پاڵنەر بۆ هەموو کەسێك گرنگە و پێویستە شتێك لەبارەیەوە بزانێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بە شێوەیەکی زانستییانە و دروست مامەڵە لە تەك کەسانی چوار دەوری بکات و لە کارو کردەوەکانیدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ)[1]. وروژێنەرە دەرەکییەکان، کە لە ڕێگەی هەستەکانەوە بە مرۆڤ دەگات، ئەوا وەرگرتن و وەرنەگرتنیان پەیوەستە بە پاڵنەرەکانەوە و بە هۆی پاڵنەرەکانیشەوە وروژێنەرەکان وەڵام دەدرێنەوە، ئەم وەڵامەش لە ڕەفتار و چالاکی و بەرهەمی جیاوازدا خۆی دەنوێنێت، بۆیە بەبێ شارەزابوون لە پاڵنەر و جۆرەکانی ناتوانین لە ڕەفتاری پۆزەتیف و نێگەتیفی تاك و چالاکی و بەرهەم و داهێنانی مرۆڤەکان بگەین، چونکە هەموو ئەمانە لە ژێر هێزی پاڵنەرەکاندا شێوەی جیاواز وەردەگرن و گۆڕانی جۆراوجۆریان بەسەردا دێت.

سەبارەت بە پێناسەی پاڵنەر ئەوا پاڵنەرەکان بوون و پێکهاتەیەکی فیزیکییان نییە لە مرۆڤدا، بۆیە ناتوانین بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ تێبینی بکەین و تێگەیشتن لەسەر پاڵنەرەکان بەدەست بێنین، بەڵکو دەتوانین لە ڕێگەی مامەڵە و چالاکییەکانی مرۆڤەوە تێبینی پاڵنەرەکان بکەین، پاڵنەر بە هۆی پێویستییە

جۆربەجۆرەکانی مرۆڤ وەك حاڵەتێکی ناوەکی لە مرۆڤدا ئەکتیڤ دەبێت و هێز و فشار دەخاتە سەر مرۆڤ بۆ ئامانجی دیاریکراو بە مەبەستی دەستخستنی پێویستییەکان ڕەفتاری مرۆڤ ئاراستە دەکات، واتە پاڵنەر (بارێکی ناوەکییە کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت، بۆ ئەوەی ڕەفتارێکی تایبەتی بکات بە مەبەستی نەهێشتنی ئەو بارە ناوەکییە)[٢]. ئەم بارە ناوەکییە خوازیاری پێویستییێکە و وەك هێزێك ڕۆڵ دەبینێت لە جوولە و جۆر و چۆنییەتی ڕەفتار و چالاکییەکانی مرۆڤ، (پاڵنەر وەك هێزێکی جوولێنەر بە پێویستی بەستراوەتەوە و دۆخی نەبوون و کەمبوونەوەی شتێکە و دوچاری مرۆڤ دەبێت و دەبێتە هۆی تێکدان و شێواندنی هاوسەنگی)[٣]. لە مرۆڤدا پاڵنەر وەك حاڵەتێکی ناوەکی دەبێتە بزوێنەری چالاکی مرۆڤ بۆ ئامانجێکی دیاریکراو دوای گەیشتن بەو ئامانجە هێزی ئەم بزوێنەرە نامێنێت، بە واتایەکی تر پاڵنەر بەرپرسە لە ڕەفتار و چالاکی و نمایشە جۆربەجۆرەکانی هەر تاکێك، (بە داینەمۆ و جوولێنەری ڕەوشتی مرۆڤ دادەنرێت و دەیخاتە گەڕ تووشی گرژی و ناڕەحەتی دەکات و ناچاری دەکات بە دوای ئەو ئامانج و مەبەستانەدا وێڵ بێت، کە ئەو پاڵنەرە تێر دەکات بۆ ئەوەی لەو گرژی و ناڕەحەتییە ڕزگاری بێت و بگەڕێتەوە حاڵەتی هاوسەنگی)[٤].

پاڵنەرەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە ئەو پێکهێنەرە سەرەکییەی دەروونی مرۆڤن، کەوا ڕەنگڕێژی چۆنیەتی و جۆریەتی ڕەفتار و چالاکی مرۆڤ دەکەن، لە کات و ژینگە جۆربەجۆرەکاندا و ناسنامەی شاراوەی بوونی مرۆڤەکانن.

### پاڵنەر و بەرهەمی ئەدەبی:

وەك لە پێناسەکەدا دەردەکەوێت، کە پاڵنەرەکان لە ڕێگەی فشار و پاڵەپەستۆکانیان لەسەر مرۆڤ ڕۆڵیان لە هاوسەنگی و ناهاوسەنگی دەروونی مرۆڤدا هەیە و سەرچاوەی دروستبوونی گرێی دەروونی و ململانێیە جۆربەجۆرەکانن، بە شێوەیەکی گشتی لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە بە تایبەتی بەپێی قوتابخانەی دەروونشیکاری ئەم پاڵەپەستۆ و ململانێ و گرێ دەروونییانەش ژێرخان و سەرچاوەن بۆ چالاکی هونەری و بەرهەمە ئەدەبییە جۆربەجۆرەکانن، چونکە (هونەرمەند لەم قوتابخانەیەدا یەکێکی ساغ نییە، کەسێکە تووشی

کۆمــەڵێکی زۆر گرێــی دەروونــی بــووە، لــە ڕێگــای بەرهەمــەوە ئەیــەوێت گــرێ دەروونییەکانی بکاتەوە)[٥].

فرۆیــد لــە ژێــر چــەمکی پاڵنــەری ئــیرۆس و ســاناتۆس، گــرێ و ململانــێ دەروونییەکان و چەپاندنی پاڵنـەرەکان، لێکدانـەوە بۆکـاری هونـەری و داهێنـانی ئــەدەبی دەکــات، دوای چــەپاندنی پاڵنــەرەکان مــرۆڤ لــە ڕێگــەی میکــانیزمی بەرزکردنــەوە، پاڵنــەرەکان دەگۆڕێــت بــە جۆرێــك تــا بــواری تێرکردنیــان بــۆ برەخســـێنێت، پاڵنـــەرە شـــەرتییەکان (ئـــیرۆس) لـــە کۆمـــەڵگادا بـــەهۆی ناپەسەندبوونیان بەرەو چەپاندن دەبرێن، پاشان ئـەو چـەپاندنە بـۆ پاڵنـەری تـر دەگـۆڕێن و لـە ڕێگـەی کـرداری بەرزکردنـەوە، پاڵنـەرە چـەپێنراوەکان کـردەی داهێنانی لێ دەکەوێتەوە [٦]. چەپاندن و گرژی و ململانێـی دەروونـی سەرچـاوەی دروستبوونی وزەی بەرهــەمهێنانی بابەتـە هونـەری و ئەدەبییـە جۆربـەجۆرەکانن، ئــەم بارودۆخــە دەروونــی و چــەپاندن و ململانێیــەش پەیوەســتن بــە بــوونی پاڵنەرەکانەوە، کەواتە ( پاڵنەرە فیزیاییەکان خۆیان لـە خۆیانـدا شـتی سـادەن، نوێنەری غەریزەی چێژن، بەڵام پاڵنەرەکانمان جیاجیان بۆیە گرژی و کێشمەکێش لە نێوانیانـدا سـەرهەڵدەدات، کاتێك بـەر یـەکتری دەکـەون، یـاخود بـەر ڕاسـتییە نەگۆڕەکانی جیهانی دەرەوە دەکەون، هەرچۆنێك بێت، خاڵی بنەڕەتی دەربـارەی پاڵنەرەکان بریتییە لە بیرۆکەی ململانێ ، کێشمەکێش، یەك خێزانی پاڵنەرەکان لە نێوان خۆیاندا، هەروەها لە نێوانی پاڵنەرەکان و جیهانی دەرەوەشدا)[٧].

لە ئەنجامی ئەو فشارەی، کە پاڵنەرە جۆربەجۆرەکان لەسەر مـرۆڤ دروسـتی دەکەن، بۆ مەبەستی تێرکردنیان لە لایـەك و ڕێگرییـەکانی جیهـانی دەرەوەش لـە لایەکی ترەوە، ئەوا مرۆڤ بـە ناچـاری  پاڵنـەرەکان دەخاتـە دۆخـی چـەپاندنەوە، ئەمــەش دەبێتــە سەرچــاوەیەك بــۆ دروســتبوونی ململانــێ و وزەی (لیبــدۆ)، کــە ئەمەش لای مرۆڤ دەرکەوتـەی جیـاوازی هەیـە. هونەرمەنـد و شـاعیر لـە ئـەنجامی چـــەپاندن و بەریـــەك کـــەوتنی پاڵنـــەرەکان لەگـــەڵ واقیـــع و تێـــر نـــەکردنی پێویستییەکان، چەند میکانیزمێك بەکاردێنێت بۆ ڕزگاربوون لەم گرژی و بارودۆخە دەروونییانــە، کــە ئــەمانیش لــە ڕێگــەی میکــانیزمی خســتنە ســەر و گــۆڕین و قەرەبووکردنەوە لە ڕێگای چالاکییەکی ئەدەبی و هونەری گوزارشتیان لێ دەکات.

داهێنـەر بـە بـوونی پاڵنـەری بـەهێز و ئـەکتیڤ لـە کەسـانی ئاسـایی جیـا دەکرێتـەوە، کـە هێـزی فشـاری ئـەم پاڵنەرانـە داهێنـەر بـۆ ئەنجامـدانی کـردەی داهێنان و بەرهەمهێنان ئاراستە دەکات، واتە (کەسانی داهێنەر پاڵنەری گەورە لـە پشتیانەوە هانیان ئەدات، بە وزە و توانای زۆریان لـە بـەردەوامبوون و هەوڵـدان و کارکردن و مـەیلی زۆریـان بـۆ زانـین و کۆکردنـەوەی زانیارییـەکان دەناسـرێن)[8]. خاوەنی بەرهەم بە شێوەیەکی گشتی، لـە ژێـر خاوەندارییـەتی دوو جـۆرە پاڵنـەر چـالاکی هونـەری و ئـەدەبی ئـەنجام ئـەدات، ئـەوانیش پاڵنـەرە سـەرەکییەکان و پاڵنەرە لاوەکییەکانن، پاڵنەرە سەرەکییەکان ئەو پاڵنەرە جۆربەجۆرانەن کـە لای مرۆڤەکان بە ڕێژەی جیاواز بوونیان هەیە، بەڵام پاڵنەرە لاوەکییەکان ئەوانەن، کە تایبەتن بە داهێنەر و مرۆڤـی بەرهـەمهێن و نووسـەر و شـاعیر، (بـەپێی بۆچـوونی زاناکـان بـوونی پاڵنـەری گشـتی بـۆ داهێنـەر بـەس نییـە، بـەڵکو کەسـی داهێنـەر پێویستی بە بوونی چەند پاڵنەرێکی تری تایبەت بە ئەنجامدانی چالاکی هەیە، کـە پاڵنەری قۆستنەوەی لایەنە ژیرییەکانە وەك پاڵنەری خسـتنەڕووی بابـەتی نـوێ و داهێنراو، پاڵنـەری وەرگـرتنی زانیـاری و شـارەزایی، پاڵنـەری وەرگـرتنی چـێژ لـە بابەتە ئاڵۆزەکان، پاڵنەری حەزی گۆڕانکاری.... تاد)[9]. واتا هونەرمەند و شـاعیر بۆ بەرهەمهێنانی دەق سەرەڕای پاڵنەرە گشتییەکان، کە لە هەر تاکێکی ئاساییدا بوونیان هەیە، ئەوا چەند پاڵنەرێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە هێـزی داهێنـان و بەرهەمهێنانی دەق بە نووسەر دەبەخشێت، وەك پاڵنەری (دەربڕین، پاڵنەری چێژ وەرگرتن لە داهێنان و دەربڕینی بەرهەمی هونەری، پاڵنەری سـەرکەوتن، پاڵنـەری خۆسەلماندن، پاڵنەری دەربڕینی هەست و هەڵوێستەکان بە هونەر،....تاد).

بەواتایەکی تـر (پاڵنـەرەکان دابـەش دەبـن بـۆ دوو جـۆر پاڵنـەر، یەکـەمیان پاڵنـەری دەرەکـی پاڵپشـتی و دووەمیـان پاڵنـەرە ناوەخۆییـەکان، واتـا پاڵنـەرە دەرەکییـەکان وەك ناوەخۆییـەکان سـەرەکی نـین، بـەڵام پاڵپشـت و تەواوکـەری هێـزە ناخییـەکانن، لـە ئامانجیشـدا لەیـەکتر جیـاوازن، وەك ئـەوەی پاڵنـەرە دەرەکییەکان ئامانجیـان بەدەسـتهێنانی نازناوێکـە، یـان پلـە و پایەیەکـە، بـەڵام ئامانجی پاڵنەرە ناوەخۆییەکان لە ناخـەوە کێشـراون و دەردەکـەون لـە شـێوەی جیـادا وەکـو گـەڕان بـەدوای زانیارییەکانـدا، حـەزکردن بـە زانـین، هەسـتکردن

بەخۆشی لە کاتی نوێ و بۆچوون و ڕوانگەیەکی تازە، لەبەر ئەوەی پاڵنەرە ناخی و ناوەخۆییـەکانی کەسـی داهێنـەر دەورێکـی گـرینگ دەبیـنن لـە دۆزینـەوەی ڕاسـتییەکان، یـان هێنانـە ئـارای بیرۆکەیـەکی سـەرەکی دەبیـنن لـە پرۆسێسـی داهێناندا)[١٠]. ئەو زانایانەی، کە لە کەسایەتی داهێنەر و تواناکانی داهێنەرەکانیان کۆڵیوەتـەوە، بـەو ئەنجامـە گەیشـتوون، کـەوا مرۆڤـی داهێنـەر و بەرهەمهێنـەر کۆمەڵێك تایبەتمەندی جیاوازی هەیە، کە بەهۆیەوە لەگـەڵ کەسـانی ئاسـایی جیـا دەکرێنەوە. یەکێك لەو تایبەتمەندییانە بوونی چەند پاڵنەرێکی تایبەتـە لایـان یـان دەرکـەوتنی پاڵنـەرە گشـتییەکان بـەهێز و شـێوازێکی جیـاواز بـە بـەراورد لەگـەڵ کەسـانی ئاسـایی، (کـردەی داهێنـان لەسـەر بنـەمای بـوونی چـەند پاڵنـەرێکی دیاریکراوی بەهێز دەوەستێت، کەسی داهێنەر بە بوونی ئـەو پاڵنـەرە تایبەتییانـە جیا دەکرێتەوە وەك بـوونی پاڵنـەری حـەزی زانـین بـە ڕێژەیـەکی زۆر و پاڵنـەری خۆسـەلماندن و پاڵنـەری چارەسـەر کردنـی گرفتـە ئاڵۆزەکـان و پاڵنـەری جیاکـاری)[١١]. بـوونی پاڵنـەری تایبـەت بـۆ بەرهـەمهێنان و کـردەی داهێنـان بـە پێویسـت زانـراوە، ئـەم پاڵنـەرە تایبـەت و جۆراوجۆرانـە وەك هێـز و فشـارێکی دەروونی، نووسەر و شاعیر بۆ گوزارشتکردن و دەربڕینی پەیام و مەبەستی عەقڵی و سایکۆلۆژی ئەخەنە ژێر کۆنترۆڵەوە.

### کاریگەری پاڵنەرەکان لەسەر ناوەرۆکی دەقی شیعری:

وەك ئاشـکرایە هـەر دەقێکـی شـیعری هـەڵگری نـاوەرۆکێکی تایبـەت بـە خۆیەتی، شاعیر لە ڕێگەی دەقە شیعرییەکەیەوە ویستوویەتی مەبەستێك دەربڕێت و ئامـاژە بـە یـەکێك لـە حاڵەتـە دەروونـی و بابـەت و ڕەهەنـدەکانی ژیـان بکـات. ئەوەی لێرەدا ئاماژەی پێ دەکرێت، ئەو پێکهێنەرە شیعرییەیە، کـەوا مەبەسـت و بارودۆخ و حاڵەتەکانی دەروونی شاعیر لەخۆ دەگرێت، پێـی دەوترێت نـاوەرۆکی شیعری، ئەم پێکهێنەرە شیعرییەش بابەت و مەبەستە جیاجیاکانی شیعر بەگشتی لەخۆ دەگرێت، لێرەدا مەبەستمانە ئـەو بابـەت و دەرکەوتانەیـە لـە شـیعردا، کـە گوزارشت لە لایەنەکانی هەڵچوون و پاڵنەرەکانی دەروونی شاعیر دەکەن و دەچنە نـاو خانـەی شـیعری لیریکـەوە، وەك: شـیعری (دڵـداری، نیشـتیمانی، ئـایینی، داشـۆرین، سیاسـی، قارەمانیـەتی، کۆمەڵایـەتی، کـراوە،.... تـاد). ئـەم بابەتانـە

دەبنە پێکهێنەری ناوەڕۆکی دەقی شیعری، واتە ( ئەم مەبەستە شیعرییانەی، کە لە دڵ و دەروون و ویژدانی شاعیرەوە هەڵدەقولێت، سۆزێکی خەستی تێدا ئەبینرێت لە چوارچێوەی باسەکانی "خۆشەویستی، ڕق و کینە، ترس و باوەڕ، چاکە و خراپە" دەسوورێتەوە بە شێوەیەکی جۆراوجۆر خۆی دەنوێنێ و هەر لە ئەنجامی ئەم گۆڕانە بابەتی شیعری گۆرانی سەری هەڵدا)[12]. شاعیر لە ڕێگەی شیعرەکانییەوە، سەرەڕای مەبەستە ڕوون و ئاشکراکان، ئەوا لە قووڵایی ناوەڕۆکی شیعرییەوە گوزارشت لە تێرکردن و چەپاندنی پاڵنەرەکان و پاڵنەرە نەستییەکان و حەز و ئارەزووەکانی خۆی دەکات، چونکە (هەر بەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری دوو ڕووی هەیە، ڕووی دەرەوە و ڕووی ناوەوە، کە ڕووی دووەمی شاراوەیە کەرەستەی شاراوەی تێدا شاردراوەتەوە، دەبێ ڕەخنەگر شارەزای ڕەمزەکان و بۆچوونەکان و سەرنجە تیژەکانی نووسەر بێت، تا بەهۆیانەوە بەهەر دوو دیوەکەی نووسینەکە بگات)[13]. هەر بۆیە هەر دەقێکی شیعری نەستی تایبەت بەخۆی هەیە، لە ڕێگەی شیکردنەوەی دەقەکانەوە دەتوانین ئەو پاڵنەر و حەز و ئارەزووانەی خاوەن دەق بدۆزینەوە، کە بوونەتە هۆکاری بەرهەمهێنانی دەقەکە، هەر ئەم پاڵنەر و ڕەهەندە دەروونییانە مەبەست و ناوەڕۆکی شیعری دیاری دەکەن. پاڵنەرەکان جا هەستی بن یان نەستی، ئەوانە بڕیار لەسەر مەبەستی شیعر ئەدەن و کاریگەرییان لەسەر ئاراستەکردنی ناوەڕۆکی شیعردا هەیە، ناوەڕۆکیش هەم لە ئاستی هەستیدا هەم لە ئاستی نەستیدا گوزارشت لە پاڵنەرە جۆربەجۆرەکانی شاعیر دەکات، کە دەتوانین لە ئاستی هەستیدا، واتە لە دیوی دەرەوەی ناوەڕۆکی شیعری بە ئاشکرا تێبینی جۆری مەبەستی شاعیر بکەین و هەڵچوون و پاڵنەرەکانی تێدا بدۆزینەوە، شاعیر خۆویستانە لە مەبەست و پێویستییەکی خۆی ئەدوێت. لە ئاستی نەستیشدا، واتە ئەوەی پەیوەستە بە دیوی ناوەوە و قووڵایی ناوەڕۆکی شیعری دەتوانین بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی شیکردنەوەی ڕەمز و توخمە دەروونییەکانەوە ئەو پاڵنەرە شاراوە و نەستییانە بدۆزینەوە، کە شاعیری بۆ بەرهەمهێنان و وروژاندنی ناوەڕۆکێکی دیاریکراو ئاراستە کردووە.

ئەگەر لە بەرهەمە شیعرییەکانی سالم وردبینەوە و بەو پێیەی، کە باسمان کرد لە ناوەرۆکی شیعرەکانی بڕوانین، دەتوانین لەهەر دوو ئاست و دیودا تێبینی ئەو جۆرە پاڵنەرانە بکەین، کە کاریگەری بەسەر بەرهەمە شیعرییەکانیەوە هەبووە و مەبەست و ناوەرۆکی جۆراوجۆریان بە شیعرەکان بەخشیوە. ئەم شاعیرە لە ژێر فشار و کاریگەریی پاڵنەرەکان و بۆ تێرکردنی پێویستییەکان، مەبەستە جیاجیاکانی شیعری لە شیعرەکانیدا بەکارهێناوە، لە تێڕامان لە نەستی مەبەستە شیعرییەکانی شاعیر دەتوانین پێویستییەکانی سالم پاڵنەرە چەپێنراوەکان و پاڵنەرە هەستی و نەستییەکانی بدۆزینەوە، کە دەقە شیعرییەکەی ئاراستەی بابەتی جیاجیا کردووە، بێ گومان بوونی ڕێژەی پاڵنەرە چەپێنراوەکان و زۆری و جۆری پاڵنەرەکان و فشار و هێزی پاڵنەرەکان لە لای سالم جیاوازی هەیە، چونکە بوونی هەموو ئەمانە پەیوەستە بە ژیانی تایبەتی شاعیرەوە، ژینگە و شێوازی ژیان لە قۆناغە جیاجیاکاندا گۆڕانکاری لە بوون و فشاری پاڵنەرەکاندا دروست دەکەن، بۆیە ئەگەر سەیری بەرهەمە شیعرییەکانی سالم بکەین دەبینین، کەوا ناوەرۆکی شیعرەکانی گوزارشت لە پاڵنەری جیاواز دەکات، واتە بەهۆی بوونی پاڵنەرەکان و بەمەبەستی گوزارشتکردن و تێرکردنی پاڵنەرە جۆراوجۆرەکانی شیعری ئەم شاعیرە ناوەرۆکی جیاوازی لێ کەوتووەتەوە، بۆ نموونە هەندێك پاڵنەری وەك (پاڵنەری دلێری، بەرگریکردن، قارەمانییەتی) لە شیعرەکانی سالم بوونێکی گەورەیان هەیە، کە دیارە ئەمەش بۆ بارودۆخی سیاسیی ژیانی سالم دەگەڕێتەوە، هەروەها پاڵنەری سۆز و پاڵنەری لاساییکردنەوەش لە هەندێك بارودۆخدا بووەتە هێزی فشار و کاریگەری لەسەر ناوەرۆکی بەرهەمە شیعرییەکانی هەبووە.

**ناوەرۆکی شیعری سالم بەپێی جۆرەکانی پاڵنەر**

**یەکەم: پاڵنەرە وەرگیراوەکان/ پاڵنەرە کۆمەڵایەتییە گشتییەکان**

١. پاڵنەری لاساییکردنەوە:

لاساییکردنەوە ڕۆڵێکی گەورەی لە بەردەوامبوون و بەڕێوەبردنی ژیانی مرۆڤدا هەیە، ڕێگەی لاساییکردنەوە کردەیەکە کە تاك ئەنجامی دەدات تا بە هۆیەوە بە ئامانجەکانی ژیانی بگات، مرۆڤ بۆ فێربوونی بابەتە جیاجیاکان و

ئەنجامـدانی داهێنـان و جـۆر و چـۆنیەتی ژیـان لـە نـاو کۆمـەڵگادا سـەرەتا وەك هەنگاوی یەکـەم لـە وێسـتگەی لاسـاییکردنەوە دەسـت پـێ دەکـات، واتـا کـردەی دووبارەکردنـەوەی زانیـاری و چـالاکییەکان هۆکـارێکی بـەهێز و سەرچـاوەیەکی سەرەکییە لە پرۆسەی فێرکردنی زانیاری و چالاکی و بـەهێزکردنی توانـا عـەقڵی و جەستەییەکان، ئەم کردەیەش بە هـۆی هێـز و فشـاری پاڵنـەری لاسـاییکردنەوە ئەنجام دەدرێت، مرۆڤ لە ژینگەی خۆیـدا پێویسـتی بـە فێربـوون و شـارەزابوون و تێگەیشتن هەیە لە دیاردەکانی ژیان بـۆ بـەردەوامبوون و درێـژەدان بـە ژیـان، بـۆ دەستخستنی ئەم پێویستییەش پاڵنەری لاساییکردنەوە فشارێکە بـۆ تـاك و هـانی ئـــەدات بـــۆ تێبینیکـــردن و ســـەیرکردن و گـــوێگـــرتن لـــە ورووژێنـــەرەکان و لاســـاییکردنەوەیان تـــا بەهۆیـــەوە بگاتـــە ئامانجـــەکان، کـــە پڕکردنـــەوەی پێویسـتییەکانە، بـەپێی بۆچـوونی ئەرسـتۆ (مـرۆڤ هـەر لـە منداڵییـەوە خـدووی لاساییکردنەوەی بە میرات بۆ ماوەتەوە. جیاوازیی نێوان مرۆڤ و گیانلەبـەرانی دی ئەوەیە: مرۆڤ لە هەموو گیانلەبەرانی دی لاساییکەرەوەترە و یەکەم زانیاریی خۆی بەلاساییکردنەوە فێر دەبێ و هەموومان لە ناخەوە حەز بەلاساییکردنەوە دەکـەین و چـێژی لـێ وەردەگـرین)(١٤). سـەبارەت بـە نووسـینی شـیعر ئـەوا لـە پرۆسـەی لاساییکردنەوە بـەدەر نییـە، ئەرسـتۆ لاسـاییکردنەوە بـە یـەکێك لـە هۆکارەکـانی سەرهەڵدانی شیعر دادەنێت.

شـاعیرێك سـەرەڕای لاسـاییکردنەوەی سروشـت دوای ئـەوەی، کـە شـیعر دەبیسـتێت و دەیخوێنێتـەوە لـە ڕێگـەی پاڵنـەری لاسـاییکردنەوە بـە شـێوەیەکی نەستی دەست دەکات بە لاساییکردنەوەی هەمان شت، ئەم پاڵنەرەش لـە ڕێگـەی نووسین و شیعر نووسینەوە تێر دەکرێت لەلایەن شاعیرەوە، ( کاتێك کـە نووسـەر زانیاری خەزن کرد لە ئەقڵی ناوەوەیدا و وازی لێ هێنا هەتا بپێکێـت و تێکـەڵ بـن بە یەکتری، دوای ئـەوە هەسـت بـە پاڵنـەر دەکـات بـۆ نووسـین، حـەز دەکـات لـە نووسـین بـەردەوام بێـت تـا دەمرێـت)(١٥). کاتێـك پاڵنـەری لاسـاییکردنەوە فشـار دەخاتە سەر شاعیر، بەپێی تایبەتمەندی شارەزایی و زانایی خۆی ئەم پاڵنەرە تێر دەکات، واتا شاعیر بەهۆی شیعر نووسینەوە پاڵنەری لاسـاییکردنەوە مومارەسـە دەکـات، بـەڵام بـارودۆخی دەروونـی و سـۆز و هەسـتی ئیسـتێتیکای و ژێرخـانی

نەستی شاعیر و چەندین ڕەهەندی تـر وا ئەکـەن شـاعیر شـیعرەکەی لـە بـەرگێکی تایبەت و بە چێژێکی نویٚ بەرهەم بێنێت. بۆ نموونە کاتێك سـەیری ئـەم شـیعرەی سالم دەکەین:

**ساقی لە پەردە دەرهات جامی شەرابی هێنا**
**دڵ خیرە ما لە حیرەت مــەهـ ئافتابی هێنا**
**یەك زەڕە عەکسی پڕتەو دەرکەوت و طوڕی سووتاند**
**ئایینە ســەخت ڕوو بوو لـەو عەکسە تابی هێنا**
**تیماری چاکی سینەم ڕاجع بە چاوی مەستە**
**بەختیش مەوافقی عیـشق بۆ من خراپی هێنا**
تا دەگاتە:
**وەی وەی چ مەجلیسیٚ بـوو دویٚنیٚ لە دیدەو و دڵ**
**دولبەر شەڕابی گێڕا (سالم) کەبابی هێنا** ٣٥*

لێــرەدا ســـالم بــۆ دەربــڕینی هەســت و بــارودۆخی دەروونـــی و توانــا و مەبەستەکانی خۆی پەنا بۆ شیعر دەبات، بۆ دەربـڕین و گوزارشـتکردن لـە خـود، شیعر وەك میکانیزم و فۆرمێك بوونی هـەبووە، ئـیتر شـاعیر بـۆ گوزارشـتکردن لـە مەبەستەکانی خۆی لاسایی ئەم میکانیزم و فۆرمە دەکاتەوە، کە بریتییە لە شـیعر نووسین بەپێی تایبەتمەندی شیعری کلاسـیکی و یاسـا و دەسـتوورەکانی شـیعری ئەوسا لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە، واتە ئەم کردەیە خۆی لە لاساییکردنەوەی هـەمان فـۆرمی شـیعر دەبینێتـەوە، لـە ڕووی قـالبی شـیعری و کـێش و سـەروا و هونەرەکانی تری شـیعر و پـەیام و مەبەسـتەکانی شـیعری، کـە بـەهۆی پێویسـتی دەربـڕین پاڵنـەری لاسـاییکردنەوە فشـار دەخاتـە سـەر شـاعیر، سـالم لـە ڕێگـەی لاساییکردنەوەی ئەم فۆرمە پەیامی دەروونـی خـۆی دەردەبڕێـت، بـەپێی توانـا و تایبەتمەندی خۆی نوێگەری و داهێنانی تێدا دەکات ئەمە لەلایەك. لەلایەکی ترەوە ئەگەر لە ڕووی ئەدەبییەوە سەیری کاریگەری شاعیرێك بەسـەر شـاعیرێکی تـرەوە بکـەین، بـە دیاردەیـەکی سروشـتیی ئـەدەبی دادەنرێـت و بـە زاراوەی کاریگـەری ئـەدەبی لەقەڵـەم دەدرێـت، ئـەم دیاریدەیـە لـە سـایکۆلۆژیادا خـۆی لـە حـەزێکی نەستییانەی شاعیر دەبینێتەوە بۆ لاساییکردنەوەی شـاعیرێکی تـر و بەمەبەسـتی

خۆ هاوشانکردن بەم. بۆ نموونە نالی وەك شاعیرێك کاریگەری بەسەر زۆر شاعیری ترەوە هەیە، لێرەدا ئەو شاعیرە کە لە ژێر کاریگەری نالیدا شیعر دەنووسێت لە دوو ڕووەوە دەکەوێتە ژێر بار و فشاری پاڵنەری لاساییکردنەوە یەکەم وەك ئەوەی پێشتر باسمان کرد، کە بریتییە لە لاساییکردنەوەی شیعر نووسین یان هەڵبژاردنی شیعر وەك فۆرمێك بۆ دەربڕین بەشێوەیەکی گشتی، دووەم بریتییە لە لاساییکردنەوەی توانا و تایبەتمەندی و لایەنی ئیستێتیکای خودی نالی، لێرەدا دوو هێزی پاڵنەری لاساییکردنەوە دەربڕینی شاعیر ئاراستە دەکەن، واتە دوو وروژێنەر هێزی پاڵنەری لاساییکەرەوەی شاعیر بۆ خۆیان کێش دەکەن، فۆڕمی شیعر وەك وروژێنەری یەکەم، شێوازی نالی دەبێتە وروژێنەری دووەم، گەر سەیری ئەم شیعرانەی نالی بکەین ئەوا دەبینین کە ئەم شیعرانە وەك وروژێنەرێك کاری لە سالم کردووە و ئەم شاعیرە بە فشاری پاڵنەری لاساییکردنەوە هەمان ناوەرۆك و تایبەتمەندی و وێنەی شیعری نالی دووبارە کردووەتەوە. بۆ نموونە نالی دەڵێت:

**دەروونــــم پڕ کـــەباب و دەردە بێ تۆ**
**دڵــــم گەرمە و هەناسەم سەردە بێ تۆ**
تا دەگاتە:
**بــەبێ دیـــداری تۆ خـۆ لاڵە (نالی)**
**عەجەب هەستاوە ئەم چەن فەردە بێ تۆ!** ٣٧٩ـ٣٨٠**

ئــەم پارچــە شــیعرە لیریکــەی نــالی لــە ڕووی نــاوەرۆك و ڕوخســارەوە تایبەتمەندی و جوانکاریی خۆی هەیە، دیارە ئەمەش کاری لە سالم کردووە، بۆیە سالمیش لە ژێر کاریگەریی ئەو نموونە شیعرەی نالی، ئەکەوێتە ژێر فشاری پاڵنەری لاساییکردنەوە بۆ وەگەڕخستنی توانای شیعر نووسین و بەرهەمهێنانی شیعرێکی نزیك لە نموونە شیعرەکەی نالی، لەبەر ئەوەی (لەو سەردەمەدا نالی بە مامۆستای شیعر لە قەڵەم دراوە و دەنگوباسی گەیشتۆتە ئەورووپا، سالم بە ڕێزەوە ناوی بردووە و بە مامۆستای خۆی زانیوە)[١٦]. بۆیە لە چەندین شوێنی ناو بەرهەمە شیعرییەکانی سالمدا ئەوە دەبینین، کەوا (سالم شانازی بە نالی کردووە، خۆشی ویستووە،.... شیعری نالی کارێکی زۆری کردووتە سەر شیعری

سـالم لـە ڕووی کـێش و قافیـە و وشـە و داڕشـتن و تـەعبیر و لێکسـیکۆن و ڕەوانبێژییەوە)[17]. سالم لەژێر کاریگەی نالی و شیعرەکانی هەوڵی خۆ سەلماندن دەدات، سەرکەوتنی نالی و بەرزیی شیعرەکانی دەبنە وروژێنەرێکی کاریگەر بۆ سەر پێکهاتەی دەروونی سالم، بۆیە پاڵنەری لاساییکردنەوە فشار دەخاتە سەر شاعیر بۆ لاساییکردنەوەی نموونە شیعرییەکانی نالی بە نموونەی هاوشێوە، ئەم پاڵنەرەش چەند پێویستییەکی نەستی تێر دەکات بەوەی، کە سالم خۆشەویستی بۆ نالی هەبووە و بە شاعیرێکی گەورەی داناوە لەم ڕێگەیەوە دەیەوێ گوزارشت لە پاڵنەری خۆشەویستی خۆی بکات، هەروەها لە لایەکی تر شاعیر نەستییانە ویستوویەتی لەم ڕێگەیەوە نموونەی شیعرەکەی خۆی بخاتە ئاستی شیعرەکەی نالی، دەڵێت:

**لـە سینەم دا صەدای ناڵینە بێ تۆ**
**دڵـی زارم بەسێ غەمگینە بێ تۆ**
**ئەبەد وەك من غەمیش صاحێب وەفایە**
**ڕەفـیق و هـەمدەمی دێرینە بێ تۆ**
**هەناسەی سەردی من دێنێ زومستان**
**گڕەی گـەرمی دڵـم هاوینە بێ تۆ**
تا دەگاتە:
**لە چنگ غەم صەیدە (سالم) وەك کەبووتەر**
**لـە دڵیا میـخلەبی شـاهینە بێ تۆ** ١١٣

سالم لە ژێر فشارو هێزی پاڵنەری لاساییکردنەوە چەندین دەقی شیعری تری بەرهەمهێناوە (لە بەڵگەیەکی تردا سالم لاسایی غەزەلێکی نالی دەکاتەوە)[18]. کە لە سەرەتاکەیدا نالی دەڵێت:

**طه بعي شەككەر باری من، كوردی ئەگەر ئینشا دەكا**
**ئیمتیحانی خـۆیە مەقصوودی، لە "عمدا" وا دەكا**

تا دەگاتە:
**شیعری خەڵقیی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی؟!**
**کـەی لە دیققەتدا پەتك دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا؟!** ١٠٦

سالمیش لە نموونەیەکی شیعریدا دەڵێت:

**کــــاتبی فیــکرم لە دڵــدا دقتی ئینشا دەکا**
**جوست و جۆ بۆ سطر بەندی کاغەزی میرزا دەکا**
**تــاکوو بێتە سەر سەری سایەی هوما ئاوا نەبێ**
**لووتی پاپاخی لەگەڵ سەقفی فەلەك دەعوا دەکا** ٢٩

نالی بەهۆی توانا و بەرزیی ئاستی هونەری لە شیعر نووسیندا لای زۆر شاعیر بۆتــە جێگــەی ســەرنجدان و وەك ورووژێنــەرێك ڕۆڵــی گێــڕاوە، کــە پاڵنــەری لاساییکردنەوەی شاعیرەکانی تری ورووژاندووە، ئەم پاڵنەرە وای لە شاعیرەکانی تر کردووە کە شوێن پێی تایبەتمەندییەکانی شیعری بکەون و نموونە و وێنەی نزیك لە قەسیدە و غەزەلەکانی نالی بەرهەم بێنن، بەپێی تایبەتمەندیی توانا و شاعیرییەت و ژینگەی دەروونی خۆی. ئیتر ئەم پاڵنەرە هێز و فشارێکی گەورەیە بۆ سەر شاعیر و نووسەر تا بکەونە ژێر کاریگەری وێنە و دیاردەکانی سروشت و بەرهەمی ئەدەبی و هونەری، دواتر شاعیر بەهێزی پاڵنەر و کۆمەڵێك میکانیزم و تایبەتمەندی ئەدەبی و هونەریی خۆی شتێکی نوێ دێنێتە بەرهەم.

**٢. پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیایی:**

پێکهاتەی نافیزیکانەی مرۆڤ لە دۆخی تەنیاییدا ئارام ناگرێت، ئەمەش بۆ پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیایی مرۆڤ دەگەڕێتەوە، کە هەمیشە فشارێکی دەروونی گەورەیە بۆ سەر تاك، بۆ ئەوەی لە دۆخی تەنیایی دەروونیی بێتە دەرەوە، بۆ ئەمەش تاك ناچاری بەکاربردنی کۆمەڵێك هۆکار و میکانیزم دەکات، واتە کاتێك مرۆڤ لە ڕووی پێکهاتەی جەستەیی و دەروونی هەست بە بوونی تەنیایی دەکات، وەك حاڵەتێکی دەروونیی ناخۆش بەسەر تاکەکەدا دەشکێتەوە، لێرەدا تاك پێویستی بە دەروازەیەك هەیە بۆ ڕزگاربوون، بەهۆی پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیایی تاك بار و فشارێکی گەورەی دەکەوێتە سەرشان بۆ پەیوەندیکردن و تیکەڵبوون و ئاوێتەبوون لەگەڵ دەوروبەر تا ڕاستەوخۆ ئەم پاڵنەرە تێر بکات، بەمەش دەیەوێت لەم دۆخە دەرچێت، بەڵام نەڕەخسان و نەگونجانی ئەم ڕێگایە تاك بە جۆرێکی تر ئاراستە دەکات، مرۆڤ بۆ ڕزگاربوون

لەم دۆخە و ڕەواندنەوەی ئەم تەنیاییيە کۆمەڵێك میکانیزم بەکاردێنێت بۆ خۆ سەرقاڵکردن، وەك (خەیاڵکردن، مەنەلۆگ، بەکەسکردن، خوێندنەوە، نووسین و شیعردانان..... تاد).

سەبارەت بە شیعر ئەوا کۆی پرۆسەی نووسینی شیعر میکانیزمێکی بەرگری دەروونی تاکە بۆ تێکشکانی ئەو تەنیاییيەی، کە دەوری مرۆڤی داوە و بۆ تێرکردنی پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیاییيە، کاتێك ئەم پاڵنەرە هانی مرۆڤ ئەدات، ئەوا مرۆڤەکان بە شێواز و میکانیزمی جیاجیا ژینگەیەك بۆ خۆیان دروست دەکەن لەم تەنیاییيە دەردەچن، شیعر نووسین یەکێکە لەو میکانیزمانە، واتە شاعیر لە ڕێگەی سەرقاڵبوون بە وشە و هۆنینەوەی شیعر و ڕێکخستن و دروستکردنی وێنەی شیعری لە دۆخی تەنیایی دەروونی خۆی دەردەچێت و لەگەڵ شیعر و ژیان لە ناو دەقدا ئاوێتە دەبێت، واتا شیعر نووسین میکانیزمێکە بۆ سەرقاڵبوونی شاعیر تا لەو ڕێگەیەوە پاڵنەری بەرگەنەگرتنی تەنیایی تێر بکرێت. کاتێك شاعیر دوچاری لادان دەبێت لە ژینگەی کۆمەڵایەتی خۆی، هێزی تێکەڵبوون و بەستانی پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگادا دەکێشێتەوە، بەواتا گشتییەکەی گۆشەگیر دەبێت، لەم دۆخەی شاعیردا پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیایی ئەکتیڤ دەبێت و فشار بۆ سەر شاعیر دروست دەکات و داوای خۆ سەرقاڵکردن و ڕەواندنەوەی تەنیایی دەکات، بەمەش شاعیر لە ڕێگەی نووسینی شیعرەوە ئەم ئامانجە دەروونییە جێبەجێ دەکات، لێرەدا شاعیر ئاوێتەی خەیاڵکردن و ژیانێکی نوێ دەبێت لە ناو دەقە شیعرییەکاندا، لەو دەرچەیەوە خۆی سەرقاڵدەکات و لە تەنیایی ڕزگاری دەبێت، هەرچەندە لە ڕووی سۆسۆلۆژیاوە هەر تەنیایە و بەم دۆخە لە تەنیایی ڕزگاری نابێ، بەڵام لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە شاعیر بەم شیعر نووسینە ژینگەیەکی نوێ بۆ خۆی دروست دەکات و تەنیایی خۆی دەڕەوێنێتەوە.

کۆی پرۆسەی شیعر نووسین لای سالم جا هەڵگری هەر مەبەست و ناوەرۆکێك بێت ئەوا پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیایی شاعیری لە پشتەوەیە، کە ئەم شاعیرەی ئاوێتەی ژیان و ژینگەی ناو دەقە شیعرییەکان کردووە، لە ساتە وەختی تەنیاییدا ئەم پاڵنەرە ئەکتیڤ بووە و لەم ڕێگەیەوە شاعیر لە حاڵەتی

تەنیایی دەروونی دەرچووە و بەهۆی بەرهەمە شیعرییەکانی ئەم پاڵنەرەی تێر کردووە، بۆ نموونە گەر سەیری ئەم پارچە شیعرانەی خوارەوە بکەین.

**خۆزگــــە دەمزانی لــە تارانا نەجاتم کەی دەبێ**
**کۆیی یـارە مشــهدم یا مــدفنم هــەر ڕەی دەبێ**
**من لە نەشئەی جامی لەعلت محشریش نایێمە هۆش**
**جـامی وا (سالم) لە دەورا قسمتی جەم کەی دەبێ** ١٤١ ـ ١٤٢

تا دەگاتە:

**لــەگـەڵ دڵ شەرتە (سالم) گـەر نەجاتم بێ لە تارانا**
**بەهەشت ئەر بێتە دەشتی(ڕەی) بە ئێرانا گوزەر ناکەم** ٨٥

لێرەدا دەبینین، کە سالم وێنەی ساتی ژیانی خۆی دەکێشێت لـە تاراوگـەدا، ئەگەر لـە ڕوانگـەی کۆمەڵناسییەوە سـەیری سـالم بکـەین بـە ئاشـکرا هەست بـە تەنیابوونی دەکەین، بەهۆی غەریبی و نامۆیی لە وڵاتی ئێراندا، بۆیـە لـەم دۆخـەی ژیاندا پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیایی فشار دەخاتـە سـەر شـاعیر بـۆ ڕزگـاربوون لـەو چوارچـێوە تەنیاییـەدا، بـۆ ئەمـەش شـاعیر ژینگەیـەکی نـافیزیکی دروسـت دەکات، لە ڕێگـەی خـەیاڵکردن ئـەم پاڵنـەرە تێـر دەکـات و تـەنیایی دەوروبـەری دەڕەوێنێتەوە، لە ڕێگەی بەکەسکردنی دڵی خۆی و دواندنی دڵی خـۆی، سـالم بـە خەیاڵی نیشـتمان و گەڕانـەوە بـۆی، خـۆی سـەرقاڵ دەکـات، لێـرەدا کـاتێ سـالم تەنیایە، ئەوا پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیایی فشار دەخاتە سەر سـالم و بەمـەش شاعیر لە ڕێگەی میکانیزمی خەیاڵکردن و گوزارشتکردن لە حاڵەتە دەروونییەکـەی خۆی لە ڕێگەی شیعرەوە لەم تەنیاییە خۆی ڕزگار دەکات.

لەم شیعرانەشی، کە شاعیر ڕووی دەمی دەکاتە یـار و وەك بڵێـی ڕاسـتەوخۆ قسە لەگەڵ یاردا دەکات، مەبەست و هەستی دەروونی بۆ یـار دەردەبڕێـت و بـاس لە هەلومەرجی خۆشەویستی نێوانیان دەکات، یاخود ئەم وێنە شیعرییانەی، کە لە فـۆرمی (گێڕانــەوە و مەنــەلۆگ و گفتوگــۆ و دیــالۆگ)دان وێنــەی نەخشــێنراوی شاعیرن، وێنەیەکن لەو ژینگە دروستکراوەی خەیاڵی شاعیر، کە بەهۆیـەوە شـاعیر دەرفــەتی گوزارشــتکردن و دەربــڕین و قســەکردن و خــۆ ســەرقاڵکرن بــۆ خــۆی

دەرەخسێنێت، کە ئەمەش بۆ بوونی فشاری پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیایی دەگەڕێتەوە. بۆ نموونە:

**لــــە نــور و لامیعی تەشتێکی ڕاگرت و وتی ڕوومە**
**بە دوو شەهـ ئەژدەهای پڕ نێشی ڕاگرت و گوتی موومە**
**تکام کرد قەتلی ناحەق بەس بکا جانا، وتی: فەرزە**
**کوتم بــۆ ئاگرت بەردایە عومری من؟ وتی: خوومە**

تا دەگاتە:

**کوتم (سالم) دزە، دەستی بڵند کرد ئایینەی ڕاگرت**
**وتی: کێشکچی ئەم بـــاغە بە دایم خاڵی هیندوومە** ١٢٣

لەم نموونە شیعرییەدا شاعیر لە ڕێگەی بەکارهێنانی کۆمەڵێك میکانیزم، پاڵنەری بەرگە نەگرتنی تەنیایی خۆی تێر کردووە، لە ڕێگەی شێوە و ناوەڕۆکی ئەم شیعرانەوە هەست بە ژینگەی تەنیایی ژیانی شاعیر دەکرێت، کە بەهۆی بەربەستەکانی بەردەم خۆشەویستییان لە ناو کۆمەڵگادا پاشەکشەی کردووە و لە دۆخی پاشەکشێ و تەنیایی فیزیکی خۆیدا، پاڵنەری بەرگەنەگرتنی تەنیایی ئەکتیڤ دەبێت، بەمەش دەبینین، کەوا سالم لە ڕێگەی میکانیزمی خەیاڵکردنەوە ژینگە و دەوروبەرێکی تری دروست کردووە، کە بریتییە لە سەرقاڵبوون و ژیان لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا، چونکە بەمە بە ئاسانی دەتوانێت بە خۆشەویستەکەی بگات و قسەی لەگەڵدا بکات، بۆیە دەبینین، کەوا ئەم شیعرانە ڕاستەوخۆ لە شێوەی دیالۆگ و دەربڕینی خۆشەویستی بۆ یاری نووسراون وەك ئەوەی، کەوا شاعیر یارەکەی بەرامبەر وەستابێت و قسەی لەگەڵدا بکات، لێرەدا شاعیر خۆی لە تەنیایی ڕزگار کردووە بەوەی، کە لە ڕێگەی خەیاڵکردنەوە یاری خۆی لەبەردەم خۆیدا ئامادەکردووە و ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا دەدوێت.

### ٣. پاڵنەری کۆمەڵایەتی:

بۆ بەردەوامبوون و پڕکردنەوەی پێویستییەکان مرۆڤ پێویستی بە کەسانی تر هەیە لە دەوروبەریدا، ئەم ئامانجەش نایەتە جێ تاوەکو مرۆڤ پەیوەندی لەگەڵ کەسانی تر نەبەستێت، (مرۆڤ چ ئاسایی بێت یان هونەرمەند و ئەدیب، خاوەنی سروشتێکی کۆمەڵایەتییە،... سروشتی مرۆڤ خۆی وا هەڵکەوتووە، کە ناتوانێ بە

تەنیا بژێت، بەڵکو بە کۆمەڵ و دەستە و گرووپ دەژێت)[19]. ئەوەی، کەوا هێز بە مرۆڤ دەدات و هانی دەدات بۆ پڕکردنەوەی پێویستی پەیوەندیکردن و ژیان لە ناو کۆمەڵگادا پاڵنەری کۆمەڵایەتییە، ئەم پاڵنەرە لە ڕووی سۆسۆلۆژییەوە قورسایی خۆی هەیە بەوەی کە بنیاتنانی کۆمەڵگا و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی پێوە بەندە، بەپێی بۆچوونی ماسلۆ ( ئەم پێویستییە دەبێت بە پاڵنەرێکی گرینگ بۆ ئەوەی مرۆڤ بەکار و چالاکی کۆمەڵایەتی هەڵبستێت و بەشداری کۆڕ و کۆبوونەوەکان بکات)[20]. لە ڕووی کۆمەڵناسییەوە مرۆڤ یەکەیەکی دابڕاو نییە لە ژیانی گشتی و پێوەرە گشتییەکانی کۆمەڵ، کۆمەڵ بە ڕێژەی جیاواز کاریگەری بەسەر مرۆڤەکانەوە هەیە، لەبەر ئەوەی (پەیوەندی لە نێوان ڕەفتاری تاکە کەس و پێوەرەکانی کۆمەڵگا لە ڕووی سیاسی و ئەخلاقییەوە پەیوەندییەکی پتەوە، هەریەکە کار لەویدیکە دەکات و ئەو کارلێکردنەش بەپێی هەلومەرجی هەر کۆمەڵگایەك و ئاستەکانی پێشکەوتنی کەوتووە)[21].

ئەگەر لە ژێر چەمکی ئەم پێویستی و پاڵنەرە لە ناوەڕۆکی دەقە شیعرییەکان بڕوانین، ئەوا شیعری کۆمەڵایەتی وەك چالاکییەکی بەرجەستەکراو لای شاعیر لە ژێر بار و فشاری ئەم پاڵنەرە دێتە بەرهەم، واتا ئەو شیعرانەی کە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە مەبەست و پەیامێکی کۆمەڵایەتی دەخەنە ڕوو، ڕێگەیەکن بۆ دەستخستنی پێداویستی خۆشەویستی و ئەنجامدانی چالاکی کۆمەڵایەتی، بەمەش ئەم ناوەڕۆکە شیعرییانە میکانیزمێکن بۆ تێرکردنی پاڵنەری کۆمەڵایەتیی شاعیر، هەموو ئەو شیعرە کۆمەڵایەتییانەی سالم، کە گوزارشت لە ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتی دەکەن و تیشك خستنە سەر لایەنێکی سەلبی یان ئیجابی کۆمەڵگایە یان ڕەخنەگرتنە لە چین و توێژێکی کۆمەڵ و دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ئەوا پەیوەستە بە بوونی پاڵنەری کۆمەڵایەتیی شاعیرەکەوە. بۆ نموونە سالم لەو قەسیدەی، کە دەڵێت:

**لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم دەستە و ئەژنۆ کەف زەنان**
**گێژەلووکەی بای نەدامەت تاری کرد صفحەی جیهان** ٩٧

تا دەگاتە دوا دێری کە دەڵێت:

**جــەنگەڵــی شــەهبازی بـازی بازیانی باز نەوین**
**فش هەڵات کــەهیا لەسەر بیچهی طمع وەك ماكیان** ١٠١

لەم قەسیدەیەدا سالم باسی جەنگی بابان و داگیرکردنـی سـلێمانی دەکات و پەرۆشی بۆ تێکچوونی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ژیانی کۆمەڵگای ئەوسا دەکەوێتـە بەرچـاو، سـالم باسـی ئـەو جـۆرە کەسـانە دەکـات، کـە خراپـەیان لەگـەڵ خـەڵك کردووە، لێرەدا پاڵنـەری کۆمەڵایـەتی شـاعیر ئـەکتیف دەبێـت و کۆمەڵایەتییانـە سالم ئاراستە دەکات، بۆیە لەم شیعرەدا پەرۆشی و خەمخۆری بەدی دەکرێـت بـۆ تاکەکانی نـاو کۆمـەڵگا، کـە ئەمـەش بـۆ (پێداویسـتییەکی تـاك دەگەڕێتـەوە، کـە خۆشەویسـتییەتی بـۆ دەوروبـەر و کۆمـەڵگا و خۆشەویسـتی کۆمـەڵگا بـۆی ئەمـە پاڵنەری کۆمەڵایەتی ئـەکتیف دەکـات، تێـر نـەکردنی ئـەم پاڵنـەرە دەبێتـە هـۆی یاخیبوون)[٢٢]. بۆیە دەبینین ئەم ئەکتیڤبوونە بەرهەمهێنانی ئەم نموونە شـیعرەی سالمی بەم ئاراستە بردووە لە ڕووی ناوەرۆکەوە. سالم لە غەزەلێکی تردا باس لـە بارودۆخ و کۆبوونەوە و ئادابێکی کۆمەڵایەتی دەکات و تێکـەڵبوون و ئاوێتـەبوونی لەگەڵ کۆمەڵگادا دەخاتە ڕوو.

**چـــــوومە سەر ضــیافەتی مەلا بەکری عالی جەناب**
**چ بڵێم خەڵکــینە بۆم نایەتە بــەر مــەددی حیساب**
**خولاسە جێ بەجێ بووین ڕێز بەڕێز ئێمە لە خوارو ژوور**
**هێنایـــــان هــــەر بەدوو کەس سینی یاپراخ و کەباب** ٤٣

سالم لەم نموونە شیعرییەدا باس لە دەعوەت و سـەردان و نـان خـواردنی بـە کۆمەڵ دەکات، ئەم کارەی سالم لە ڕاسـتیدا بـوونی پاڵنـەری کۆمەڵایـەتی شـاعیر دەسەلمێنێت، کە لە ڕێگەی تێرکردنی ئەم پاڵنەرە ئـارامی و خۆشـی بـاڵی بەسـەر لایەنی دەروونی شاعیردا کێشاوە و دواتر لە سەر بنەمای چێژ و بە فشاری هـەمان پاڵنەر شاعیر ئەم ڕووداوە لە بەرهەمێکی شیعریدا دەخاتە ڕوو، واتا هەمان پاڵنـەر دوای تێپـەڕبوونی ماوەیـەك فشـار دروسـت دەکاتـەوە، شـاعیریش لـە ڕێگـەی میکـانیزمی گەڕانـەوە بـۆ هـەمان سـاتی دەعـوەت دەگەڕێتـەوە و بـە شـێوەیەکی نەستی بۆ دووبارەبوونەی بنەمای چێژ لە ناوەرۆکێکی شیعری دەیخاتە ڕوو. سـالم لە قەسیدەیەکی تردا باسی میوانداری و خانەخوێی خراپ دەکات و دەڵێت:

**ئــــاخ و داخ دڵ غافــڵە نــازانێ قسمەت چی بکا**
**ئەمڕۆ وا لێرەم بەڵام ئاخــۆ بەیــانی کـــوێم دەبا**

تا دەگاتە:

**خــانە خوێم میـــوان نەوازە وەرنە سەیری پیاوەتی**
**دۆشەگی خۆم خاك و خۆڵ سەر ڕاخەری ئەسپم سەما** سالم ٤١

بـارودۆخ و نەریتــە باوەکـانی نـاو کۆمــەڵگا بــە شـێوەی ڕاسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ کاریگـەرییان بەسـەر مرۆڤـەوە هەیـە، ئـەم کاریگەرییـەش لەلایـەن پاڵنەری کۆمەڵایەتییەوە پێشوازی لێ دەکرێت و وەڵام دەدرێتـەوە، لـەم نموونـە شیعرییەی سـالمدا هەسـت بـە کاریگـەریی ئـەم ڕەهەنـدە کۆمەڵایەتییـە دەکـەین، (دوای ئەوەی کە سالم بە هۆی کاری ڕەسمی دەگوازرێتەوە بۆ شـاری حیللـە لـەم شارە میوانی ماڵێکی عەرەب دەبێـت کـە بەشـێوەیەکی شایسـتە پێشـوازییان لـێ نـەکردووە و مامەڵەیـەکی باشـیان لەگەڵـدا نـەکردووە وەك میوانـدارێك، بۆیـە ئـەم قەسیدەیە لە شێوەی ڕەخنەگرتن لەو مامەڵە کۆمەڵایەتییەی ئـەم شـارە دەخاتـە ڕوو)[٢٣]. سالم ڕەخنە لە هەڵوێستێکی ناشیرین دەگرێت، کـە خانـەخوێ خراپییـە، کە لە ژینگەی ئەو کۆمەڵگایـەدا بـەدی کـردووە، واتـە ئەمـە پەیوەسـت بـووە بـەو کۆمەڵگایـە نوێیـەوە، چـونکە (جـوانترین یـان ناشـیرینترین حـەز و ئارەزووەکـانی ئادەمیزاد بەشێك نین لە کاراکتەرێکی نەگۆڕ و بایلۆجی، بەڵکو زادەی ئەو ڕەوت و پرۆسـە کۆمەڵایەتییـەن، کـە داڕێــژەری ئــادەمیزادن)[٢٤]. ســالم بــەهۆی ئــەم گواستنەوەیە دوچاری ململانێی دەروونی دەبێت بـە هـۆی گۆڕانکـاری لـە ژینگـەی کۆمەڵایەتی بەوەی کە لە شاری خۆی دەرفەتی تێرکردنی پاڵنەری کۆمەڵایەتی بـۆ ڕەخساوە و لەم شارەش هەمان پاڵنەر کاتێك فشـار دەخاتـە سـەر شـاعیر بـواری تێرکردنی بۆ نەڕەخساوە بەهۆی مامەڵەی خراپی خانەخوێیەکەیەوە، بۆیە هەسـت و دۆخی چەپاندنی ئەم پاڵنەرەی خۆی لە ناوەرۆکێکی شیعریدا دەردەبڕێت.

**دووەم: پاڵنەرە کۆمەڵایەتییە شارستانییەکان:**

**١. پاڵنەری موڵکداری:**

ئەم پاڵنەرە لە سایکۆلۆژیادا لەجۆری پاڵنەرە وەرگیراوەکانە و سەر بە پاڵنەرە کۆمەڵایەتییە شارستانییەکانە، واتە بەپێی شارستانییەکان بوونیان هەیە و گۆڕانیان بەسەر دادێت، پاڵنەری موڵکداری ( تایبەتە بە شارستانیەتێك و لە شارستانییەتێکی تردا نییە، لە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتییەوە بۆ ژینگەیەکی تر دەگۆڕێت)[٢٥]. پێداویستییە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤ حەزو ئارەزووی خاوەندارییەتیان بۆ مرۆڤ دروست کردووە، ئەم پێداویستییانەش بوون بە پاڵنەرێك، کە فشار دەخەنە سەر مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی کار و چالاکی، تا مرۆڤ ببێت بە خاوەنی پێویستییەکانی، بەمەش پاڵنەری موڵکداریی خۆی تێر بکات، مرۆڤ تا مەودای خاوەندارییەتی زۆرتر و گەورەتر بێ زیاتر گوزارشت لە پاڵنەری موڵکداریی خۆی دەکات، بە واتایەکی تر ئەم پاڵنەرە هاندەرێکە بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی هەوڵی پەیداکردن و دەستخستنی (سامان، سەرمایە، دەستەڵات، پۆست، ناوبانگ، بەرهەم....تاد) بدات.

ئەگەر لە ژێر ئەم پرەنسیپە و بەهۆی ڕەهەندەکانی پاڵنەری موڵکداری بۆ نەستی شاعیر و بەرهەمی شیعری شاعیر بڕۆین، ئەوا شیعر دانان دوو ئاراستەی لێ دەکەوێتەوە، لە ئاراستەی یەکەمدا ئەوا بە شێوەیەکی گشتی بەرهەمی شیعری هەر شاعیرێك بەهەر فۆرم و ناوەڕۆکێك بێ دواجار دەبنە موڵك و سەرمایەی شاعیرەکە، ئەم ئاراستەیە پاڵنەری خاوەندارییەتی و موڵکداری شاعیر هاندەدات بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکی بەرهەمهێن، کە بریتییە لە دانانی شیعر، شاعیر وەکو بەرهەمێکی بەرجەستە و بەهادار مامەڵە لەگەڵ کەرەستە و پارچە شیعرەکانی خۆی دەکات، ئەم پاڵنەرە بەو ئاراستەیە فشار دەخاتە سەر شاعیر، کە بەرهەمێك بخاتەوە و بواری خاوەندارییەتی بۆ بڕەخسێنێت، شاعیر هەست بە بوونی بەرهەم و سەرمایەیەك بکات لە ژیاندا، کە بریتییە لە بوونی نموونە شیعرییەکانی و دیوانێکی شیعری، دواتریش لە ڕێگەی سەیرکردن و خوێندنەوەی شیعرەکانی خۆی ئەوا جارێکی تر لەسەر بنەمای چێژ وەرگرتن لە سەرمایە و بەرهەمەکانی پاڵنەری موڵکداری خۆی تێر دەکات و هەستی خاوەندارییەتی مومارەسە دەکات،

کەواتــە بەرهەمــە شـیعرییەکان ئـەرکێکی سـایکۆلۆژی زۆر گـرینگ ڕادەپـەڕێنن بـۆ لایــەنی دەروونیــی خــودی شــاعیرەکە، بۆیــە دەبیــنین، کــە شــاعیرەکان خۆشەویستییەکی زۆریان بۆ بەرهەمەکانی خۆیان هەیە و شیعرەکانیان بە (منداڵ، سـەرمایە، گەنجینـە، دوڕ و گەوهـەر)یـان لـە قەڵـەم داوە، بۆیـە شـانازییان بـەم سەرمایە کردووە.

ئــەم بارودۆخــە بــە ئاشــکرا لای ســالم هەســتی پــێ دەکرێــت، پاڵنــەری موڵکدارییەتی، کە فشارێکە بۆ سـەر شـاعیر و ئاراسـتەکردنی شـاعیر بـۆ پـرۆژەی بەرهــەمهێنان، کــە خــۆی لــە دەقــی شــیعریدا دەبینێتــەوە و دواتــر هەســتی خاوەندارییەتی بەرامبەر بە شیعرەکان بۆ شاعیر دروست دەبێت و جـارێکی تـر لـە ڕێگەی ئەم هەستەوە پاڵنەری موڵکداری خۆی تێـر دەکـات، بۆیـە دەبیـنین، کـەوا شاعیر باس لە ڕەسەنی و بەرزیی شیعرەکانی خۆی دەکـات، کـە خـاوەنی وێنـە و تایبەتمەندیی خۆیەتی، خۆی بە خاوەنی سەرمایە و گەنجینەیـەکی بـەنرخ دەزانـێ ئەو گەنجینەیەش شیعرەکانیەتی، کە خـەڵکانی تـر ئـەم سـەرمایەیان نییـە، بۆیـە شـانازی بـە خـۆیی و بەرهەمەکانییـەوە دەکـات، ئـەم ڕاسـتییەش لـەم نموونـە شیعرییەدا دەردەکەوێت:

**کــــاتیبی فیــــکرم لـــــە دڵدا دقتی انشا دەکا**
**جــوست و جۆ بۆ سطر بەندی کاغەزی میرزا دەکا**
**تاکـــوو بێتە سـەر سـەری سایەی هوما ئاوا نەبێ**
**لـــووتی پاپاخی لەگەڵ سقفی فەلەك دەعوا دەکا**
**بـۆ ڕێگا گەر ساقی عوجیان کردە پردی ئاوی نیل**
**استیـخوانی دەستی میرزا پول لەسەریا دەریا دەکا**
**گەر لەلای زەوجەی لەشەو دابێت و هەڵسێ بۆ عمل**
**قیـامەتی مەیلی لـە دەرگانەی حەرەم بەرپا دەکا**
**ئەحـمەقە لەقلەق ئەگەر تەرکیبی نسبت کا بە تۆ**
**حوشتر ئەر بێت و بڵێ وەك تۆ ئەڕۆم بێ چا دەکا** ٢٩

لەم وێنە شیعرییەدا هەستی خاوەندارییـەتی شـاعیر دەبیـنین، بەرامبـەر بـە توانای شیعر نووسین و بەرهەمەکانی، ئەمەش بـۆ پاڵنـەری موڵکدارییـەتی شـاعیر دەگەڕێتەوە، کە شاعیر دەیەوێ ئیسپاتی سـەرمایە و بەرهەمـەکانی خـۆی بکـات،

ئەگەر سەیری دێرە شیعرەکانی سالم بکەین ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کەوا سالم لە ڕێگەی ئەم دێرە شیعرانەوە خاوەندارییەتی خۆی لە شیعر و وردەکاری و سەنعەتکاریی شیعر نووسیندا دەخاتە ڕوو، ئەمانەش هەموو دانپێدانانی ڕاستەوخۆی شاعیرن بۆ بوونی سامانێکی بەنرخ، کە خۆی لە نایابی و بەرزیی شیعرەکانیدا دەبینێتەوە، واتە هەستی خاوەندارییەتی بەرامبەر بە شیعر لای شاعیر لە ڕێگەی بوون و دانانی شیعرەوە دروست دەبێت، کە پاڵنەری موڵکدارییەتی بۆ مەبەستی بوون بەم خاوەندارییەتییە فشار دەخاتە سەر شاعیر و بەرەو ئەنجامدانی ئەم چالاکییەی دەبات، بە واتایەکی تر کاتێک تاک لە ڕێگەی کەرەستە و بەرهەمە جۆربەجۆرەکان پێداویستییەکانی پڕ دەکاتەوە، مرۆڤ لە ڕووی دەروونییەوە دەکەوێتە ناو چێژ بینین و ئارامی، ئەمەش وا لە مرۆڤ دەکات کەوا دەست بە بەرهەم و موڵکەکەیەوە بگرێت و خاوەندارییەتی بکات لە پێناو بەردەوامبوونی ئەم ئارامی و چێژ بینینەدا، بۆ ئەمەش مرۆڤ شانازی بە بەرهەم و موڵك و سەرمایەی خۆیەوە دەکات و لەگەڵی دەژی و مومارەسەی دەکات و دەیکاتە ناسنامەی خۆی و خۆی پێ هەڵدەکێشێت، ئیتر لەم ڕێگەیەشەوە بەردەوام پاڵنەری موڵکداری خۆی تێر دەکات. جگە لەمە بەکاربردنی نازناویش لە دوا دێری شیعرەکانیشدا جۆرێکی ترە لە هەستی خاوەندارییەتی شاعیر بەرامبەر بە شیعرەکانی و ئەم نازناوە وەك مۆر و واژووی شاعیرە بۆ تاپۆکردنی شیعرەکان لەسەر خۆیدا.

لە ئاراستەی دووەمدا ئەو ناوەڕۆکە شیعرییانەی کەوا ڕەهەندی ماددی و باسکردنی سەروەت و سامانیان لە خۆ گرتووە و شاعیر باس لە کەرەستە و موڵك و سەرمایەك دەکات، ئەوا پاڵنەری موڵکداری لە ژێرخانی ئەم دەقە شیعرییەدا هەیە، کە شاعیری هانداوە بۆ ئەوەی مەبەست و ناوەڕۆکێکی وەها بخاتە ناو چوارچێوەی شیعرێکیەوە، لێرەدا شاعیر شیعرێك دەنووسێت، کە هەڵگری ناوەڕۆکێکی ماددییە و باس لە شتێك دەکات کە پێکهاتەی فیزیکی هەیە و حەز و ئارەزووی بوون بە خاوەنی دەخاتە ڕوو، یان لە کەرەستەیەك دەدوێت و وەسفی دەکا و لایەنەکانی دەخاتە ڕوو، کە خۆی خاوەنییەتی وەك ( نیشتمان، یار، خێزان، منداڵ، پۆست، خانوو، موڵك ، پارە، زێڕ،....تاد) ئەم جۆرە ناوەڕۆك و

مەبەستە شیعرییە پشت بە جێناوی (لکاوی کەسی یەکەمی تاک و خۆیی و هەبوون) دەبەستێت لە ڕووی ڕێزمانییەوە، ناوەڕۆکی شیعری شاعیران ڕێژەیەکی زۆری لە هەبوونی یار و خۆشەویست و زۆری کەرەستە و شتی تر لە خۆ گرتووە، ئەگەر سەیری ناوەڕۆکی شیعرەکانی سالم بکەین ئەم مەبەست و حەزو ئارەزووی خاوەندارییەتی و پاڵنەری موڵکدارییە لە ژێرخانی نەستی دەقە شیعرییەکاندا بەدی دەکەین، حەز و ئارەزووی مرۆڤ و فشاری پاڵنەری موڵکدارییەتی مرۆڤ و تێر نەکردنی ئەم پاڵنەرە و شکانەوەی بە ئاراستەی ناوەوەی دەروونی مرۆڤ، مرۆڤ بەرەو چەند هەڵسوکەوت و چالاکییەك دەجووڵێنێت، ئەم جووڵە و چالاکییەش گوزارشت لەو پاڵنەرە دەکات.

**٢. پاڵنەری شەڕخوازی:**

پاڵنەری شەڕخوازی و دەستدرێژی، یەکێکە لە پاڵنەرە کۆمەڵایەتییە شارستانییە وەرگیراوەکان، ئەم پاڵنەرە تایبەتە بە بەرگریکردن و خۆپاراستن و لایەنی سکویریتی، دەرکەوتەی ئەم پاڵنەرەش لای تاك خۆی لە ڕەفتار و مامەڵەیەکی سەلبی دەبینێتەوە لەگەڵ دەوروبەردا، مەبەست لەو پاڵنەرە (ئەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارەیە کە ئامانجەکەی ئازاردانی بەرامبەر و زیان گەیاندنە بە کەلوپەل و سەرمایەکانیان)[٢٦]. ئەم هەڵسوکەوتە بە شێوەی ماددی یان مەعنەوی دەرکەوێت، لای هەر تاکێك ئەوا پاڵنەری شەڕخوازی هۆکارەکەیەتی، واتا پاڵنەری شەڕخوازی (ئازار گەیاندنە بە کەسانی تر بە شێوەیەکی ماددی وەك لێدان و کوشتن یان بەشێوەیەکی نامادی وەك جوێندان و بریندارکردنی هەستی بەرامبەر)[٢٧]. سەبارەت بەم پاڵنەرە هەندێك لە زاناکان لەوانە فرۆید بە پاڵنەرێکی بایلۆژییان لە قەڵەم داوە، (بە بڕوای فرۆید شەڕخوازی پاڵنەرێکی بایلۆژییە و بەشێکە لە سروشتی مرۆڤایەتی و دەربازبوون لە دەستی مەحاڵە، بەڵام دەکرێت لە ڕێگەی نزیککردنەوەی تاکەکانی کۆمەڵ و بەهێزکردنی سۆز و خۆشەویستی لە لایەك و ڕەخساندنی دەروازە و کەش و هەوای گونجاو بۆ خاڵیکردنەوەو ڕزگاربوون لێی لە لایەکی تر بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی دەستەمۆی بکەین)[٢٨].

بەڵام بەشێکی تر لە زاناکانی بواری سایکۆلۆژی لە ئەنجامی کۆمەڵێك تاقیکردنەوە لەسەر مرۆڤ و ژینگەی مرۆڤ و کۆمەڵگادا بە پێچەوانەوە بۆی دەڕوانن، (ئەو پاڵنەرە دەگەڕێننەوە بۆ سەرنەکەوتنی مرۆڤ لە تێرکردنی هەندێك لە پێویستییە گرنگەکانی مرۆڤ)[29]. بە واتایەکی تر ئەم پاڵنەرە ( زۆری و کەمی و بوونی بۆ تێکچوونی ژینگەی سایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتیی تاك دەگەڕێتەوە، بە هۆی دانانی بەربەست لەبەردەم حەز و ئارەزووەکانی تاکدا، گوزارشتکردن لەم پاڵنەرە هۆکارێکە بۆ ڕزگاربوون و کەمکردنەوەی ئەو گرژی و پشێوییەی، کە بەهۆی بەربەست و ڕێگرەکانەوە دروست بوون)[30]. کاتێك مرۆڤ بارودۆخی ئەمنیی خۆی مەترسی دەکەوێتە سەر بەهۆی بوونی کۆسپ و ڕێگرەوە، ئەوا ئەم بارە دەبێتە ورووژێنەرێکی ناخۆش و ئازار بەخش، مرۆڤ لەم دۆخەدا پاڵنەرێکی بۆ دروست دەبێت، کە بریتییە لە پاڵنەری شەڕخوازی هانی ئەدات بۆ وەڵامدانەوە و ئەنجامدانی مامەڵەیەکی توند بەرامبەر بە ورووژێنەرەکە، تا لە ڕێگەی ئەم وەڵامەوە پێداویستی ئاسایش و پاراستن بۆ خۆی دابین بکاتەوە.

ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە پاڵنەری شەڕخوازییە، کە خۆی دەبینێتەوە لە ئازار گەیاندنێکی ماددی بە کەسی بەرامبەر، واتە ڕەفتار و وەڵامی توند لە دەرکەوتەیەکی مەعنەویدا، وەك بەکاربردنی زمان بۆ مەبەستی (هەست بریندارکردن، جوێندان، بەرگریکردن، هێرشکردن، توانج لێدان.....تاد)، ئەگەر لە ژێر چەمکی ئەم پاڵنەرە لە دەقی شیعری بڕوانین، کە ڕێگا و زمانی گوزارشتکردنی شاعیرە، ئەوا دەبینین کە هەموو ئەم دەقە شیعرییانەی کەوا مەبەستی جیاجیای هەیە وەك: (داشۆرین، دلێری و قارەمانیەتی، بەرگری، هێرشکردن و....تاد) بۆ بوونی پاڵنەری شەڕخوازی دەگەڕێتەوە لای شاعیر، ئەم جۆرە شیعرانەی، کە یەکێك لەم ناوەرۆکانەی لە خۆ گرتووە، وەڵام و ڕەفتارێکی توندی شاعیرە، کە بەهێز و هاندانی پاڵنەری شەڕخوازی شاعیرەوە ئاراستەی کەسێك یان لایەنێك دەکرێت، بەمەش ئازاردانی نافیزیکی لێ دەکەوێتەوە بۆ کەس و لایەنە ئاراستەکراوەکە. ئەمەش ئامانجی دەروونی شاعیر جێبەجێ دەکات، کە بریتییە لە دابینکرنی پێداویستی ئاسایش و دڵنیایی و بەرگریکردن، هەروەها تێرکردنی حەز و ئارەزووی شاعیر بۆ ڕەخنەگرتن و توانج لێدان و تۆڵەکردنەوە.

ئەگەر سەیری ناوەرۆکی شیعرەکانی سالم بکەین، ئەوا لە نەستی دەقە شیعرەکانیدا هەست بە بوونی پاڵنەری شەڕخوازی دەکرێت، کە لە ژێر فشار و هێزی ئەم پاڵنەرە حەزی بەرگریکردن و هێرشکردنی خۆی تێر دەکات و ئەمەشی لە چەند نموونەیەکی شیعریدا خستووەتە ڕوو، واتا ئەم پاڵنەرە لای سالمی شاعیر بوونی زیاترە، دیارە ئەمەش بۆ بوونی ژیانی تایبەتی سالم و بارودۆخی کۆمەڵایەتی و گۆڕانکارییە ئابووری و سیاسییەکانی ئەوکات دەگەڕێتەوە، بە تایبەتی دوای داگیرکردنی سلێمانی لەلایەن عوسمانییەکان و ڕووخانی میرنشینی بابان، ئەمەش لەو شیعرانەدا ڕەنگی داوەتەوە، کە مەبەست و ناوەرۆکێکی وەك: (داشۆرین، دلێری، قارەمانییەتی، هێرشکردن....تاد)ی لێکەوتووەتەوە، بەرگری و دلێری لە شیعرەکانی سالمدا ڕووبەرێکی فراوانی داگیر کردووە لەبەر ئەوەی شاعیر (بەڕووخانی میرنشینی بابان و هاتنی فەرمانڕەوا تورکەکان زۆر دڵتەنگ و غەمگین دەبێت... شایانی باسە، کە سالم خۆی یەکێك بوو لەو جەنگاوەرانە و بە چاوی خۆی هەموو ڕووداوەکانی بینیوە، بۆیە بە شێوەیەکی ڕاستەقینە و ڕاستگۆیی باسی بەرگری و قارەمانی شاسوارەکانی بابان دەکا دژی تورکی وێرانکار)[٣١]. ئەم بارودۆخەی سالم یارمەتیدەر بووە بۆ ئەکتیڤ بوون و گەشەسەندنی پاڵنەری بەرگریی فشار و هێزی ئەم پاڵنەرەش خەباتی کرداری و بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە شیعرانەی لێ کەوتووەتەوە، کە هەڵگری ناوەرۆك و مەبەستی بەرگرین، ئامانجی ئەم پاڵنەرەش مسۆگەرکردن و پاراستنی ژیانی مرۆڤە، چونکە (سروشتی مرۆڤ وای لە تاك کردووە کەوا ژیانی خۆی خوشبوێت، لە پێناویدا دوچاری زۆرداری بێت و هێرش بکاتە سەر خەڵك، هەروەها خەڵکیش هێرشی بکاتە سەری بۆ ئەمەش مرۆڤ پێویستی بە بەرگریکردن بووە لە ئەنجامدا دوژمنداری و جەنگ و کوشتار ڕوویداوە)[٣٢]. ڕەمەکی ئیرۆس واتا حەزی مرۆڤ بۆ بەردەوامبوونی ژیان و خۆپاراستن پاڵنەری شەڕخوازی لای تاك دروستکردووە، ئەم پاڵنەرەش توانا و هێزی بەرگریکردن بە مرۆڤ دەدات لە بەرامبەر ورووژێنەرەکان (ناکۆکییەکان دەبنە پاڵدەرێك کە هزر و بیری بەرگری لە ئەدەبدا بەرهەم دێنن)[٣٣]. ئەم ناکۆکی و جەنگەی لە سەردەم و دەوروبەری سالمدا بوونی

هەبووە، وەك ورووژێنەرێك شـاعیری ناچـار بـە وەڵامدانـەوە کـردووە و لـە ڕێگـای پاڵنەری شەڕخوازییەوە شاعیر بە شیعری بەرگری و قارەمانییەتی هەڵدەستێت بە وەڵامدانەوەی ئەم وروورژێنەرە ناخۆشە، بۆ نموونە وەك لەم شیعرانەدا دەبینین.

**لـە دەریای مـەعرەکەی تیغی نەهەنگی گەر نمایان بێ**
**لـە ناو ئوردوویی تـورکانا دەبێ شین و صەدا پەیدا**
**ئەگــر ئاوی بـەقای نۆشی بێ دوژمن فائدەی نادا**
**لە مـــەوجی جـەوهەری تیغی حروفی لا بەقا پەیدا**
**بەضـەربی زەرگی ئەو دوژمن وەکو پووشە بەدەم باوە**
**لـە میغناتیسی دوور بـینی فنونی کـارەبا پەیدا**
**عصای مـوسایە سەر نێزەی لەڕەغمی مشتی فرعەونی**
**بە بەرقی ئاتەش ئەفشان و بەشکلی ئەژدەها پەیدا** ١٩

ئەمە شیعری بەرگری و هێرشبردنە بۆ سەر دوژمن، کەوا پاڵنەری شەڕخوازی لە پشـتەوەیە، شـاعیر لێرەدا بـاس لـە ئازایـەتی و دلێـری عـەزیز بـەگ دەکـات و قارەمانییـەتی بەرامبـەر دوژمنـەکانی دەخاتـە ڕوو، (سـالم لـە شـیعرەکانی، کـە دەربارەی قارەمانی و سوارچاکیی عەزیز بەگی بابان نووسیویەتی وا دەردەکەوێ، کە زۆر ئاشنایی لەگەڵ عەزیز بەگی بابان هەبووە و دۆستێکی تایبەتی عەزیز بـەگ بووە و مەفتوونی ئازایەتی و سوارچاکیی بووە بە شیعری پڕ سۆز و بـەتین باسـی کردووە)[٣٤]. شاعیر لە ژێر حەزی هێرشکردن و سەرکەوتن بەسەر دوژمندا وێنـەی عەزیز بەگ وەك پاڵەوانێك دەکێشی ئەگەر دوژمن، کە مەبەست تورکی عوسمانییە هەر چەند بەهێز و بـەتوانابن، ئـەوا بەرامبـەر بـە دلێریـی عـەزیز بـەگ بـێ توانـا و ترسـنۆکن و خۆیـان ڕانـاگرن، ئـەم وێنـە جـەنگی و قارەمانەتیـەی، کـە شـاعیر دەیکێشێت دەرئەنجامی پاڵنەر و ڕق و حەماسـەتی شـاعیرە بەرامبـەر دوژمـن. لـە نموونەیەکی تردا دەڵێت:

**تورکی قورصی خۆر کە طالع بوو طلووعي کرد بەڕەقص**
**کـەوکـەبەی مـاهی موڕادی ئەهـلی بـابان بوو نیهان** ٩٧

تا دەگاتە:

**هــەی خوا ڕۆ لەو دەمە چی کرد تەقەی تۆپ و تفەنگ**
**ســەر زەمین تاریك و دونیا تۆز و کەڕ گوێی ئاسمان**
**مــاهی طالع ڕیٚی محاق و ڕۆژی نەگبەت و جیلوەگەر**
**خــەرمەنی شادی لەبەر با بەرقی غەم ئــاتەش فشان** ٩٨

شاعیر لە ژێر پاڵنەری هێرشکردن بۆ سەر دوژمن لەم شیعرەدا نمایشی هێز و توانا جەنگییەکانی جەنگاوەرانی کورد دەکات، کاتێك ڕووبەڕووی تورکی عوسمانی بوونەتەوە، جەنگاوەری کورد لە بەرزترین وێنەی بەرخودانی و دلێری دەخاتــەڕوو لە بەرامبەریشدا هێرش دەکاتە سەر جەنگاوەرانی دوژمن و بە ترسنۆك و بیٚ توانـا وەسفیان دەکات، ئەم وێنە شیعرییانە لە کاتی جەنگ و شەڕدا گرینگیی زۆری پــیٚ دەدرێــت، چــونکە دەبێتــە هــۆی پەرەپێــدانی پاڵنــەری شــەڕخوازی و هەســتی بەرگریکردن و هێرشــکردن، کــە لــە ســایکۆلۆژیای ســەربازیدا کاریگەرییــەکی زۆری بەسەر جەنگاوەرانەوە هەیە.

جگــە لــەو دەقــە شــیعرانەی ســالم، کــە هــەڵگری نــاوەرۆکی بــەرگری و قارەمانییــەتین، پاڵنــەری شــەڕخوازی لــەو شــیعرانەش تێبــینی دەکرێــت کــە بــۆ مەبەستی داشۆرینی کەسێك یان لایەنێك نووسراوە، چونکە لە داشــۆریندا (شــاعیر بە زمانێکی تیژو وڕووشـێنەر وەسـفی بەرامبەرەکـەی دەکـات... هەرچـی عـەیب و خەوشێکی بەرامبەر هەیە دەیخاتــە ڕوو، بــە مەبەســتی ڕیســواکردن و هــەتککردنی کەســی بەرامبــەر)[٣٥]. ئــەم مەبەســتە شــیعرییەی شــاعیر ئــەم پاڵنــەرە بەرهــەمی هێناوە، شاعیر لە ڕێگەی ئەم داشۆرینەوە چــەند ئامــانجێکی دەروونیــی جێبــەجیٚ دەکات و لەو ڕێگەیەوە حەزو پێویستیی خۆی تێر دەکات و باری دەروونیی خــۆی دادەمرکێنێتەوە، (ئەو هۆیانەی پاڵ بە شاعیرەوە دەنێن بــۆ داشــۆرین بــریتین لــە ئارەزووی شاعیر بۆ ڕەخنەگرتن و پیشاندانی خەوشەکانی مرۆڤ، دان پیانــەنان بــە ئیشــی بەرامبــەر و ئــازاردان و تۆڵەکردنــەوە)[٣٦]. ئــەم حــەز و ئارەزووانــە دەبنــە هۆکــاری دروســتکردنی پاڵنــەری شــەڕخوازی و بەرجەســتەکردنی لــە شــیعری داشۆریندا، واتە ئەم جۆرە شیعرە وەڵام و ڕەفتارێکی توند و سەلبییە بۆ کــەس و لایەنی بەرامبــەر، کــە لــە لایــەن پاڵنــەری شــەڕخوازی شــاعیر بەرهــەم هــاتووە بــۆ

تێرکردنی ئەم پێویستی و حەز و ئارەزووانەی کە باسمان کرد. وەك لەم شیعرە داشۆرینەدا سالم دەڵێت:

**فەرەنگ و داسنی و ئەرمەنی و جوو**
**نەصیری و دەیلەمی و گەبری بەدخوو**
**بەحاڵی من نەبن هەرگیز ئەمانە**
**هەزار جار ئۆف برایم ئاغا لە دەس توو**
**قورمساغە ئەوەندە بەدسروشتە**
**بەدایم خووێڕییە وەك شبری سەر کوو**

تا دەگاتە دوا دێر:

**برایم ئاغا لە قوڕنیشیٚ سەراپا**
**وەکو باب مردووان بۆی کا خوارو** ١١٦

لەم پارچە شیعرە داشۆرینەدا سالم هێرش دەکاتە سەر پیاوێك بە ناوی برایم ئاغا، دوای بێزارییەکی زۆری شاعیر لە برایم ئاغا و ئازار بینین بە دەستییەوە، شاعیر دەیەوێت لە ڕێگەی هێرشکردنە سەر ئەو پیاوە بە شێوەیەکی نامادی حەزی وەڵامدانەوە و تۆڵەکردنەوەی خۆی تێر بکات، بۆ ئەمەش شاعیر هەستاوە بە دانانی شیعرێك بۆ دەرخستنی کەموکوڕی و قسە پیٚ وتن و وێنە کێشانێکی ناشیرین بۆ برایم ئاغا، ئەم شیعرە لە ژێر فشاری پاڵنەری شەڕخوازیی شاعیرەوە ئەم ناوەڕۆکەی لیٚ کەوتووەتەوە بۆ تێرکردنی حەزەکانی شاعیر.

**سێیەم: پاڵنەرە کۆمەڵایەتییە تاکییەکان:**

**١. پاڵنەری سۆز:**

سۆز ئامادەیەکی ویژدانی ئاوێتەیە، لەگەڵ کۆمەڵێك هەڵچوون بەرامبەر بە هەڵوێستێکی دیاریکراو، یان پەیوەستبوونی ئەم هەڵچوونانەیە بە کەسێك یان لایەنێك، کە پاڵ بە تاکەوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی چالاکی و ڕەفتارێکی تایبەت، (سۆز ئاماژەیەکە بۆ پەیوەستبوون، کە پێکدێن لە هەڵچوونێکی پۆزەتیف یان نێگەتیف بەرامبەر بە کەسێکی تر، یان ئامادەیییەکی شاراوەی جێگیرە بەشێوەیەکی ڕێژەیی، کە لە چەندان جۆرە هەڵچوون پێکدێت، کە لە زۆربەی کاتەکاندا بەرجەستەبوونی دەرئەنجامێکە بۆ بابەتێکی دیاریکراو)[٣٧]. واتە ئەگەر

کۆمەڵێك هەڵچوون لە بارەی بابەت یان کەسێك لای مرۆڤێك کۆببنەوە ئەوکاتە حاڵەتێکی تایبەت دروست دەبێت، کە پێی دەڵێن (پاڵنەری سۆز)، ئەم پاڵنەرە فشار دروست دەکات و پاڵ بە مرۆڤەکەوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی هەڵسوکەوتی تایبەت بەرامبەر بەو بابەتە یان بەو کەسە، ئەگەر مرۆڤێك لە حاڵەتە جیاجیاکاندا بەرامبەر بە کەسێك ڕووبەڕووی هەڵچوونەکانی وەك: (دڵخۆشی، غەمباری، دڵەڕاوکێ، تووڕەبوون، ئارامی، ترس، .... تاد) بوویەوە، کۆی هەموو ئەم هەڵچوونانەی کە کۆبووەتەوە ئاماژەیە بۆ پەیوەستبوون بەو کەسەوە، بەردەوامیی ئەم پەیوەستبوونەش پاڵنەری سۆز دروست دەکات، ئەم پاڵنەرەش پێویستی بە تێرکردن هەیە بۆیە فشار دەخاتە سەر مرۆڤ، بۆ بەردەوامبوون بەم پەیوەستبوونە تا ئامانجی پاڵنەری سۆز جێبەجێ بکات، کە بریتییە لە درێژەدان بە هەڵچوونە خۆشەکان و چێژ وەرگرتن و تێرکردنی پێویستییەکان، (سۆز لە پەیوەستبوونی تاك بە بابەتێك و بەردەوامبوون پێی لە هەڵوێستی جیاجیادا دروست دەبێت، بەهۆیەوە گەلێك پاڵنەری جیاواز ڕازی دەبێت، هەست و مەشاعیری خۆشی و چێژ وەرگرتن لە دەروونیدا دەورووژێنێت)[٣٨].

بە شێوەیەکی گشتی سۆز پێکهێنەرێکی سەرەکی دەروونی مرۆڤە، بوونیشی وەك پاڵنەرێکی بەهێز کاریگەری لەسەر ئاراستەکردنی ڕەفتاری مرۆڤ هەیە، چۆنیەتی هەڵسوکەوتی مرۆڤ شێوازی دەربڕین لە ژێر فشاری پاڵنەری سۆز گۆڕانکاری بەسەردا دێت، (سۆز کاریگەری لەسەر لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی دەروونی وەك بیرکردنەوە و بیرهاتنەوە و بیروباوەڕ و چۆنیەتی مامەڵەکردنی مرۆڤەوە هەیە، کەسی گەشبین جیهان بە لالەزارێکی پڕ لە گوڵ و نەسرین دەبینێت و ڕەشبینیش بە بیابانێکی ناخۆش دەیبینێت، مرۆڤ لە بارودۆخە غەمگینییەکانی حەز دەکات ڕۆژەکانی بەدبەختی و غەم و خەفەت بەبیر خۆی بهێنێتەوە بە پێچەوانەشەوە)[٣٩]. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە، کە دەربڕین و هەڵسوکەوت و چالاکییەکان نوێنەرایەتی سۆزەکانی مرۆڤ دەکەن، بە شێوەیەکی گشتی بەرهەمی شیعری شاعیرەکانیش وەك چالاکییەکی ئەدەبی و بە تایبەتی شیعری ویژدانی خۆی بە ئەنجامدانی نوێنەرایەتیکردنی سۆزەکانی شاعیر نیشاندەدا، ئەمەش لە ڕێگەی ناوەرۆکی خودی شیعرەکە بۆمان ڕوون دەبێتەوە،

ئەگەر سەیری شیعرەکانی سالم بکەین ئەو شیعرانەی، کە ناوەرۆکە جیاجیاکانی وەك: (خۆشەویستی و ڕق، شیوەن و لاوانەوە، شانازی،.... تاد)یان لە خۆ گرتووە گوزارشت لە سۆزی شاعیرەکە دەکەن و پاڵنەری سۆز ئەم شیعرانەی بۆ ئەم مەبەستە ئاراستە کردووە، بۆیە لە ناوەرۆکی دەقە شیعرەکانی سالمدا سۆزی ئاراستەکراو دەبینین بۆ کەسێك یان لایەنێك یان بابەتە جۆراوجۆرەکان وەك دەربڕینی ڕق یان خۆشەویستی بۆ هاوڕێیەك یان ڕەگەزی بەرامبەر یان بۆ گرووپێك یان بۆ ئاژەڵێك، بۆ نموونە لەم شیعرەدا سالم گوزارشت لە سۆزی خۆشەویستیی خۆی دەکات و دەڵێت:

**شەتی ئەشکم دەبی هەر بیّ بە ڕووما**
**هەتا بیّ بەحری ئاق دنگز بە رۆما**
**دەزانی چۆنە ئەحواڵم لە هیجرت**
**وەکوو تەشنەم لەناو بەحری زقووما**
**لە پیریشدا عەروسی یادی وەصلت**
**بیرون نایە لە پەردەی ئارەزووما**
**دەمی وەصفی دەمی تیغت دەلەرزم**
**ئەرەستوو بم لە ئیدراکی علووما**
**لە کوورەی دڵ بیرون دیّ ئاهی سەردم**
**عەجەب یەخ بیّ لە ناو چاهی سمووما**
**تەجاوەز کەی دەکا (سالم) لە ئەمرت**
**کەسیّ نەیدیوە ڕوو سەختی لە مووما** ٣٣

لەم پارچە شیعرەدا سالم وێنەی ژیانی خۆی دەکێشێت لە دووری خۆشەویستەکەی، بەهۆی ئەم وێنەکێشانەوە شاعیر گوزارشت لە سۆزی خۆی دەکات، کە سۆزێکی ئاراستەکراوە بۆ ڕەگەزی بەرامبەر، کە یاری شاعیرەکەیە، شاعیر لە دووری یار هەڵچوونە ناخۆشەکان و حاڵەتە نەرێنییەکانی وەك:(غەم، بێزاری، ڕەشبینی، دەردەداری... تاد) دەخاتە ڕوو، ڕووبەڕووبوونەوەی شاعیر بەم حاڵەتە ناخۆشانە لە غیابی یاردا بۆ بوونی سۆزی خۆشەویستی شاعیر دەگەڕێتەوە بۆ یار، کە ئەم سۆزە وەك پاڵنەرێك فشار دەخاتە سەر شاعیر بۆ گوزارشتکردن لە خۆی.

جگـە لەمـە بەشـێکی گـەورەی سـۆزی ڕقـی سـالم ئاراسـتەی عوسمانییـە داگیرکەرەکان کراوە، لە بەرامبەریشدا سـۆزی خۆشەویسـتی ئاراسـتەی نیشـتیمان کـردووە، ئـەم شـیعرانەی، کـە بـۆ وەسـف و سـتایش و خۆشەویسـتیی مـیر و جـەنگاوەرانی میرنیشـینی بابـانی نووسـیوە ئامـاژە بـە بـوونی پاڵنـەری سـۆزی خۆشەویستی شاعیر دەکەن، واتـا لێـرەدا سـۆزی شـاعیر بـۆ لایـەنێك و نیشـتیمان ئاراستە کراوە. وەك لەم قەسیدەیەدا دەبینین:.

**الـــوداع ئــەی موڵکی بابان الوداع**
**الــــوداع رەیـحانی جانان الوداع**
**وەك ئەسیری تورکمان دەمبەن بە زۆر**
**الــــوداع ئەی شاهی خۆبان الوداع**
**مستـــعدم بۆ بــــلادی رافـضي**
**الــــوداع ئـەی جانی جانان الوداع**

تا دەگاتە:

**گەرچی بۆ ئەحـواڵی (سالم) بیٚ غەمی**
**الـــوداع ئەی نا مـــوسوڵمان الوداع** ٧٥

لـەم پارچـە شـیعرەدا شـاعیر دەسـت دەکـات بـە شـیوەن و لاواندنـەوە بـۆ ئـاوابوونی خـۆری میرنیشـینی بابـان، لێـرەدا دەتـوانین هەسـت بـە غـەمخۆری و پەرۆشـیی قـووڵی شـاعیر بکـەین، بـۆ ڕووخـانی میرنیشـینی بابـان لەلایـەن عوسمانییەکانەوە، ئەمەش خۆشەویستی سالم دەسـەلمێنێت بەرامبـەر بـە وڵـات و نیشـتیمانەکەی، ئـەم غـەمخۆری و خۆشەویسـتییەش بـۆ بـوونی پاڵنـەری سـۆزی خۆشەویستی بۆ میرنشین و سۆزی ڕق بۆ داگیرکەران دەگەڕێتەوە، لە ژێـر فشـاری بوونی پاڵنەری سۆز سالم چەندین شیعری لەسەر ستایش و خۆشەویسـتی سـوپای میرنشینی بابان نووسیوە و شانازی بە ئازایەتییانـەوە دەکـات و چـەندین شـیعری بەرگری و هێرشکردنیش لە دژی هێزی داگیرکەر دەنووسێت، سۆزی خۆشەویسـتی سالم بۆ میری میرنشین عەزیز بەگی بابان هـانی شـاعیری داوە بـۆ ستایشـکردن و نووسینی شیعر لەسەر ئەم کەسایەتییە، بۆ نموونە لەم قەسیدەیەدا سالم دەڵێت:

**دەکـــا دونیـــای پڕ شۆڕش بە دایـم فیتنەها پەیدا**
**بـە نەیڕەنگ و فسوون هەردەم لەهەر موویێ وەغا پەیدا**
**تەماشای جەوری دونیا کەن چ قەهرێکی لە خوسرەو گرت**
**نـەبۆ تـاجی نیشانێ مـا نـەبۆ تەختی نیا پەیدا**
**بـە مثلي خوویی مەعشـووقە دڵی دنیا لەگەڵ خەڵکی**
**بـە دوژمن نعمت و لـطفي جـەفای بۆ ئاشنا پەیدا** ١٨

تا دەگاتە:

**عزیزە وا لـە ناو چاهـە خـوداوەند نەجاتی دە**
**لـە چیهرەی ئەو بکا یعقوب دڵی شێوەی صفا پەیدا**
**خودایە ملکی (بابان) بێ ڕەواج و قەڵبە سا لطفێ**
**بـە ئیکسیری وجودی ئەو بکا وەك موو بەها پەیدا** ١٩

مرۆڤ لە ڕێگەی پاڵنەری سۆزەوە بە نیشتیمان و ڕەهەندە نەتەوەییەکانی خۆیەوە پەیوەستکراوە، پاڵنەری سۆزی خۆشەویستی، تاك بۆ چۆنیەتی و جۆرییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ڕەهەندە نەتەوەییەکان و پیرۆزییەکانی نیشتمان ئاراستە دەکات، ئینتیمای تاك بە ئاراستەی ئیجابیبوون پەروەردە دەکات، لەم نموونە شیعرانەی سالمدا هەست بە بوونی ئینتیمای ئیجابی شاعیر دەکەین بەرامبەر بە ڕەهەندە نەتەوەییەکانی خۆی، بۆیە دەبینین(هەموو ژیانی جەنگاوەریی عەزیز بەگ و ئەو شەڕانەی فەرمانبەری دەکردن، بوون بەسەرچاوەیەك بۆ ئەو شیعرە مەدح و ستایشانەی سالم بۆ "عەزیز بەگی بابان"ی هۆنیوەتەوە بە تایبەتی ئەم قەسیدەیە)[٤٠]. لەم قەسیدەیەدا پاڵنەری سۆزی خۆشەویستی شاعیر دەبینین بۆ عەزیز بەگی بابان، کە شاعیر گوزارشتی لە پاڵنەری سۆزی خۆشەویستی خۆی کردووە لە ڕێگەی مەدح و ستایش و باسکردنی توانا و ئازایەتی و لیهاتوویی عەزیز بەگی بابان و خستنە ڕووی ئەم کەسایەتییە بەم شێوەیەی، کە لە ناوەرۆکی قەسیدەکەدا ئاماژەی پێکردووە.

## ئەنجام

١. پاڵنەرەکان وەك پێکهێنەری دەروونی مرۆڤ هێزێکی شاراوەن، بەپێی بارودۆخی سایکۆلۆژیای تاك و کۆمەڵگا دروست دەبن، کە ڕۆڵی گرینگیان لە بەرهەمهێنانی دەقی شیعری و ئاراستەکردنی ناوەرۆك و مەبەستی شیعریدا هەیە، لە ژێر فشاری پاڵنەرێك یان چەند پاڵنەرێك و بە مەبەستی تێرکردن و گوزارشتکردن لێیان، شاعیر لە شیعرێکیدا بابەتێك ئەخاتە ڕوو، بەمەش ناوەرۆك و مەبەستە جۆربەجۆرەکانی شیعر سەریان هەڵداوە.

٢. پرۆسەی شیعر نووسین لای سالم کەوتووەتە ژێر هێزو سترێسی پاڵنەرەکانەوە، شاعیر لە ڕێگەی شیعرەوە دەرچەیەك دەدۆزێتەوە بۆ دەرچوون لەو فشار و ململانێیەی، کە لە ئەنجامی تێرنەکردنی پاڵنەرەکان دووچاری بووە و لە نەستیدا پەنگی خواردووەتەوە، شاعیر لەو مەیدانەدا بە جۆرێکی تر گوزارشت لە پاڵنەرەکانی خۆی دەکات.

٣. لە ناوەرۆکی شیعرەکانی سالمدا تێبینی ئەو پاڵنەرانە دەکەین، کە بەپێی بارودۆخ و ژینگە و تەمەن لای شاعیر دروست بوون وەك: پاڵنەری (لاساییکردنەوە، کۆمەڵایەتی، بەرگە نەگرتنی تەنیایی و موڵکداری، هێرشکردن و سۆز). هەریەکە لەو پاڵنەرانە لە قۆناغی جیاجیادا بە ڕێژەی جیاواز ناوەرۆکی شیعرەکانی سالمیان بە ئاراستەی خۆیاندا بردووە.

٤. بەشێکی زۆر لە ناوەرۆکی شیعری سالم، کە بەرگریکردنە لە میرنشینی بابان و هێرشکردنە سەر داگیرکەران بووە، لەو کاتەی، کەوا جەنگ لە ناوچەی سلێمانی ڕوویداوە وای کردووە، کە سالم بە بوونی شیعری قارەمانییەتی جیا بکرێتەوە، ئەم ناوەرۆکە شیعرییەی شاعیر بۆ بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە پاڵنەری پەیوەست بەم ناوەرۆکە دەگەڕێتەوە.

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

(*) ئەو ژمارانەی بەرامبەر شیعرەکان نووسراون، ئاماژەن بۆ لاپەڕەکانی سالم (دیـوان)، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٢.
(**) نالی (دیوان)، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبـدالکریم، پێداچـوونەوەی محمـدی مـەلای کـەریم، چـاپخانەی کـۆڕی زانیـاری کـورد، بەغـداد، ١٩٧٦.
١. کـەریم شـەریف قەرەچـەتانی، سـایکۆلۆژیای گشـتی، چـاپی یەکـەم، چـاپخانەی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٠٦. ل٨١.
٢. ئازاد عەلی (د.)، دەربارەی دەروونزانی گشتی، چ/ یەکەم، ؟، ؟، ٢٠٠٧، ل٨٧.
٣. ئەنەس شەکشەك، دەروونناسی گشتی، و: سەلاح سەعدی، چاپی یەکەم، چاپخانەی نارین، ٢٠١٢، ل٦٩.
٤. کەریم شەریف قەرەچەتانی، سایکۆلۆژیای گشتی، ل٨٢.
٥. ئـەکرەم قـەرەداخی، قوتابخانـەی دەروونشـیکردنەوە لـە ڕەخنـەی ئەدەبیـدا، گ. سەردەم، ژ. ٩،٢٠٠٠، ل٢٠٣.
٦. سـهیل مولـود، فرۆیـد گفتوگـۆ لەگـەڵ فرۆیـد دەکـات، گ. کـاروان، ژ.١٣٥، ١٩٩٩، ل١٣٢.
٧. دانیاڵ.ل. پاڵس، ئاین و کەسیەتی، تێڕوانینێك بۆ میتۆدی فرۆید، و: ئاوات ئەحمەد، چاپی یەکەم، چاپ و ئۆفێستی دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٢٦ –٢٧
٨. ڕۆشـنا ئەحمـەد ڕەسـول، داهێنـان لەڕوانگـەی چـەند تیۆرێکـەوە، دەزگـای چـاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل١٢٥.
٩. صـلاح الـدین العمریـة، الـتفکیر الابـداعي، ط/ الاولـي، مکتبـة المجتمـع العربـي للنشـر والتوزیع. الاردن، ٢٠٠٥، ل٧٣ـ٨١.
١٠. هەمان سەرچاوە، ص ٧٣ – ٨١.
١١. ممدوح عبدالمنعم الکناني (د.)، سیکولوجیة الابداع وأسالیب تنمیتـه، ط/ الاولی، دار المسیرة للنشر والتوزیع، الاردن، ٢٠٠٥، ل١٥٠.
١٢. شوکریە ڕەسول (د.)، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، چاپخانەی وەزارەتـی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی، هەولێر، ١٩٨٩، ل ٢٧ –٢٨.
١٣. ئەکرەم قەرەداغی، قوتابخانەی دەروونشیکردنەوە لە ڕەخنەی ئەدەبیدا ، ل٢٠٣.

١٤. ئەرستۆ، هونەری شیعر (شیعرناسی)، و: عەزیز گەردی، بڵاوکراوەی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٢١.
١٥. عەلی وەردی (د.)، خەونەکان لە نێوان بیروباوەڕو زانستدا، چاپی یەکەم، چاپەمەنی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٠٣، ل١١٥.
١٦. مارف خەزنەدار (د.)، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی سێیەم، دەزگای چاپ و بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل٥٥.
١٧. هەمان سەرچاوە، ل١٦٣.
١٨. هەمان سەرچاوە، ل١٦٤.
١٩. ئاوارە کەمال صالح، ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و پراکتیزەکردنی لە شیعرەکانی گۆراندا، نامەی ماستەر، کۆلێژی پەروەردە، بەشی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین، ٢٠١٠، ل٢٣
٢٠. کەریم شەریف قەرەچەتانی، سایکۆلۆژیای گشتی، ل١٠٥.
٢١. بەهزاد حەوێزی، پەیامێك لە ئایندەوە، ئەریك فرۆم بیرمەندی هیومانیسم، چ/ یەکەم، بڵاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتی بلاوکراوەی هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١٠، ل١٢٢.
٢٢. کەریم شەریف قەرەچەتانی، سایکۆلۆژیای گشتی، ل١٠٥.
٢٣. مارف خەزنەدار (د.)، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی سێیەم، ل١٨٠.
٢٤. بەهزاد حەوێزی، پەیامێك لەئایندەوە، ئەریك فرۆم بیرمەندی هیومانیسم، ل١٢٢.
٢٥. کەریم شەریف قەرەچەتانی، سایکۆلۆژیای گشتی، ل٨٤.
٢٦. هەمان سەرچاوە، ل٩٩.
٢٧. ئازاد عەلی (د.)، دەربارەی دەروونزانی گشتی، ل٩٥.
٢٨. کەریم شەریف قەرەچەتانی، سایکۆلۆژیای گشتی، ل١٠٠.
٢٩. ئازاد عەلی (د.)، دەربارەی دەروونزانی گشتی، ل٩٥.
٣٠. عبدالرحمن عدس (د.)، محي الدين توق (د.)، المدخل الى علم النفس، الطبعة الخامسة، دار الفكر للطباعة والنشر، عمان، ١٩٩٨، ل٢٤٧.
٣١. عەبدوللا یاسین عەلی ئامێدی، هۆنراوەی بەرگری لەبەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٦٦.

٣٢. ذكي المحاسن، شعر الحرب في ادب العرب، دار المعارف، مكتبة الدراسات الادبية، مصر، السنة ؟، ل١١.
٣٣. عەبدوڵڵا یاسین عەلی ئامێدی، هۆنراوەی بەرگری لەبەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا، ل٣٢.
٣٤. نوزاد وقاص سعید، شیعری نیشتمانی سالم، نامەی ماجستەر، کۆلێژی ئاداب، بەشی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩١، ل٨٣.
٣٥. ئازاد عبدالواحد کریم، سۆسیۆلۆژیای ئەدەب، چاپی دووەم، چاپخانەی کارۆ، کەرکوك، ٢٠١٣، ل٢٤٠.
٣٦. شوکریە ڕەسول (د.)، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، ل ٤٦ ـ٤٧.
٣٧. سەعید محەمەد نووری، ماهییەتی سۆز و خۆشەویستی لە سایکۆلۆژیادا، ڕامان، ژ١٢٤، (٢٠٠٧)، ل١٣٩.
٣٨. شكري عزيز الماضي (د.)، تیۆری ئەدەب، و: د. سەردار ئەحمەد گەردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ماردین، هەولێر، ٢٠١٠، ل١٦٤.
٣٩. ئەنەس شەکشەك، دەروونناسی گشتی، ل٨٨.
٤٠. مارف خەزنەدار (د.)، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی سێیەم، ل٢٠٣.

## ملخص البحث

يحتوي هذا البحث دور الدوافع في توجه مضمون النص الشعري، شعر (سالم) انموذجاً، وهو محاولة في اظهار دور وتأثير الدوافع في عملية كتابة الشعر مع القدرة التي تمتلكها تلك الدوافع في توجه مضمون وغرض الشعري. وعلى صعيد علم النفس تلك الدوافع مسؤول في الحركات والسلوكيات والأنشطة المتنوعة لدى الانسان، وذلك عن طريق الضغط الذي تحدثه الدوافع على الفرد، ومن ثم أشِر الى قوة الدوافع وانواعه كمكونات نفسية انسانية رئيسة في اطار علم النفس الادبي، وفي هذا البحث تعرض مضمون اشعار سالم حسب انواع الدوافع، مع دورها في نتاج اشعاره وتضغط هذه الدوافع عن طريق النزاع الذي له دور في التعبير ما يدور في خلجات نفسه في قالب شعري، ويعطي مضامين متنوعة للشعر، بمعنى آخر نجد هناك حاجة وضغط وراء أي غرض شعري لدى سالم، والذي يحاول عن طريقها اشباع حاجته وازالة هذا الضغط على نفسه، لما وقع سالم تحت تأثير أي دافع أو بعض الدوافع حينذاك يتجه الشاعر مضمون شعره باتجاه آخر، وذلك لا شعوريا، لكي يشبع تلك الدوافع بهذا الاتجاه ويعبر بها عن طريق مضمون ما، ومن هنا نجد أن الدوافع المتنوعة مكونة لدى سالم من اعمار وبيئات مختلفة، واعطى مضامين متنوعة بأشعاره.

## Abstract

This study, entitled “The role of motives in directing the content of poetic texts, Salm’s poetry as an example“, is an attempt to explore the role of motives in the process of poetry writing. It highlights the capability that motives have in directing poetic text messages. Psychologically, motives take responsibility for various human activities. Here, motive power and types of motives are referred to as main parts of human psyche in the framework of psychology of literature. In this study, the content of Salm’s poems is emphasized in accordance with types of motives. The role of motives in producing the content of Salm’s poems is also focused on. According to this study, there is emptiness behind each of Salm’s poetic text message and Salm attempts to fill this psychological emptiness through producing poetries. The motives, unconsciously, directs the content of Salm’s poems.

# ئیرۆتیك له شیعری (حه‌مام)ی شێرکۆ بێکه‌سدا

د. ده‌ریا جه‌مال حه‌وێزی
به‌شی کوردی/ فاکه‌ڵتی په‌روه‌رده‌/ زانکۆی کۆیه

د. هاوژین صلیوه‌ عیسا
به‌شی کوردی/ فاکه‌ڵتی په‌روه‌رده‌/ زانکۆی کۆیه

## پێشه‌کی :

غه‌ریزه‌ی جنسی و حه‌زی ئیرۆتیك له‌ لای هه‌موو مرۆڤێکدا هه‌یه‌، ئه‌و غه‌ریزه‌ و حه‌زانه‌ش وه‌ك بابه‌تێکی واقیعی خۆیان ده‌خزێننه‌ نێو بابه‌ته‌ ئه‌ده‌بییه‌کان، له‌ڕێی زمانی ئه‌ده‌بییه‌وه‌ له‌نێو ژانره‌ ئه‌ده‌بییه‌کاندا ده‌گیرسێنه‌وه‌، شیعریش پشکی شێری به‌رده‌که‌وێت، هۆی هه‌ڵبژاردنی ئه‌م بابه‌ته‌ش بۆئه‌وه‌ ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ که‌ هێشتا لێکۆڵینه‌وه‌ی زۆر له‌باره‌ی ئه‌م بابه‌ته‌وه‌ نه‌کراوه‌، هه‌رچه‌نده‌ تێکستی ئیرۆتیکی پانتاییه‌کی زۆری له‌ ئه‌ده‌بی کوردی داگیر کردووه‌، هه‌ر له‌ به‌رهه‌مه‌ فۆلکلۆرییه‌کانه‌وه‌ تاوه‌کو به‌رهه‌مه‌ نووسراوه‌کانی نووسه‌رانی ئێستا.

سنووری لێکۆڵینه‌وه‌که‌: تاقه‌ شیعرێکی (شێرکۆ بێکه‌س)ه‌ به‌ناوی (حه‌مام )، که‌ له‌ مارتی (٢٠١٠) دا له‌سلێمانی نووسراوه‌، له‌دیوانه‌ شیعرێکدا به‌ناونیشانی (خێراکه‌ مردن خه‌ریکه‌ بگات) له‌ساڵی (٢٠١٣) بڵاوکراوه‌ته‌وه‌، شاعیر له‌پاڵ ناونیشانی شیعره‌که‌ی نووسیویه‌تی (شیعرێکی ڕۆمانسی و ئیرۆتیکییه‌)، ئه‌م شیعره‌ شێوه‌ی چیرۆکێکه‌، که‌وا له‌ناوه‌ڕۆکیدا گه‌نجێك به‌خه‌یاڵ به‌ره‌و لای ده‌ستگیرانه‌که‌ی ده‌چێت، خه‌یاڵه‌که‌شی خه‌یاڵێکی ئیرۆتیکییانه‌ی جوانه‌، که‌ به‌سه‌ریه‌که‌وه‌و به‌شێوه‌یه‌کی زنجیره‌یی باس له‌ به‌سه‌رهاته‌کانی ئه‌و گه‌نجه‌ ده‌کات، ده‌قێکی گونجاوه‌ بۆ ئه‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه‌، که‌وا لێکدانه‌وه‌و شیکردنه‌وه‌ی ئه‌و خه‌یاڵه‌، خاڵی سه‌ره‌کی لێکۆڵینه‌وه‌که‌ پێکدێنێت.

**ئامـانجی لێکۆڵینـەوە:** بریتییـە لەخسـتنە رووی زاراوەو چـەمکی ئیرۆتیـك و پەیوەسـت بەدەقـە ئەدەبییەکـەو ڕاڤـەکردنی دەقەکـەو دۆزینـەوەو خسـتنەڕووی پێکهاتەو پلەکانی ئیرۆتیك لەدەقەکەدا.

گرفتی لێکۆڵینەوە: کەمی سەرچاوە سەبارەت بـە بابـەتی ئیرۆتیـك بـەزمانی کوردی، درێژی دەقەکە کە نـەدەکرا بیپچڕێنین، چـونکە بەسـەریەکەوە پلـەکان و قۆناغەکانی ئیرۆتیك دەخاتە ڕوو، بۆیە پەنامان بۆ ئەوە برد دەقەکە بکەینە چەند وێستگەیەك، تاوەکو بۆ لێکدانەوەو خستنەڕووی دەقەکە ئاسانتر بێت.

میتـــۆدی لێکۆڵینەوەکـــە: لـــە لێکۆڵینەوەکـــەدا میتـــۆدی وەســـفی دەروونشـیکاریمان گرتۆتەبـەر، لـە بەشـی یەکەمـدا میتـۆدی وەسـفی و لـە بەشـی دووەمـدا میتـۆدی دەروونشـیکاری و لـە هەنـدێ شـوێنی بەشـی دووەمـدا هـەردوو میتۆدەکە تێکەڵکراون.

ستراکتۆری لێکۆڵینەوەکە: لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەممان کردووە بەچەند تەوەرەیەك، لەوانە: یەکـەم (چـەمکی ئیرۆتیـك)، کـە تێیـدا باسـی زاراوەو چەمکی ئیرۆتیکمـان کـردووە و مانـاو مەدلوولـەکانمان خسـتۆتە ڕوو، لەتـەوەرەی دووەمدا بەناوی (سێکس و ئیرۆتیك پەیوەندی بەئەدەبـەوە ) تێیـدا باسـی لایـەنی ئیرۆتیك و سێکسمان کردووە، لەو تەوەرەدا ئەوە ڕوونکراوەتەوە کە تا چەند ئـەو بابەتانە لـەنێو ئەدەبیاتـدا ڕەنگدەدەنـەوە، کـە بـیروڕای چـەندان زانـاو توێـژەری دەروونیمان هێناوەتەوە، تەوەرەی سێیەم: بریتییە لـە ( ئیرۆتیـك و ڕۆمانسـیزم) کراوە، کە هەردووکیان جیهانێکی هاوبەشیان هەیە و کەشوهەوایان لێکەوە نزیکە، چونکە ڕۆمانسییەکان گرنگییەکی زۆریان بەلایەنی هەست و سـۆز داوە، گرنگییـان بەنەستی تاك و کەپتە سێکسییەکان داوە، ئەمانەش دێنەوە نێو جیهانی ئیرۆتیك.

بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەمان تایبەتە بەدەرخستنی قۆناغەکانی ئیرۆتیـك لەدەقە شیعرەکەدا، هەروەك لەخوێندنـەوەی شـیعرەکەدا دەبینرێـت، سـەرەتا بـە دیمـەنی ڕۆمانسـی و سـۆزدارییەوە دەسـتپێدەکات، لـە تـەوەرەی یەکـەمی ئـەم بەشەی لێکۆڵینەوەکەدا قسە لەسەر ئەم لایەنانـە کـراوەو تێیـدا بەچـەند تـەوەرێك بابەتەکانی خودشەیدایی و بایەخدان بەڕێکپۆشی ئـەو گەنجـە شـیکراوەتەوە کـەوا شاکەسی چیرۆکە شیعرەکە پێکدەهێنێت، لەتـەوەرەی دووەمیشـدا سـەرەتاکانی

وروژانـــدن و ئارەزووبزوانـــدن شـــیکراوەتەوە، کـــەوا لـــەوێوە بـــە خـــەیاڵێکی ئیرۆتیکانەوە بەرەو لای دەستگیرانەکەی دەڕوات، کەوا تێیدا پلـەکانی ئیرۆتیـك و گەیشتن بەدوا پلەی ئۆرگازم پێبەپێ دەقەکە شـیکراوەتەوە، دواتـریش گـرنگترین ئـــەو ئەنجامانـــەی لەلێکۆڵینەوەکـــە پێیـــان گەیشـــتووین، لیســـتی سەرچـــاوەو پەراوێزەکان، پوختەی لێکۆڵینەوەکە بەهەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بەرچاو دەکەون.

## بەشی یەکەم
## چەمك و زاراوەی ئیرۆتیك

### تەوەرەی یەکەم : چەمکەکانی سێکس و ئیرۆتێك :

ئیرۆتیـك کردەیـەکی ئـەخلاقی تاکەکەســی نییــە، بــەڵکو هــەڵگری کــارو پەرچــەکرداری کــەلتووری و ڕۆشــنبیریی ئــەو ســەردەمەیە کــە تاکــەکان تێیــدا دەژیـن[1]، ڕەهەنـدی سـایکۆلۆژیای Eroticism بـە دەسـتەواژەکانی (سـیگمۆند فرۆید) دەبەسترێتەوە، کە ئەویش لەبنچینەدا دەگەڕێتەوە بـۆ میتۆلۆژیـای گریکـە کۆنەکان plato (ئەفلاتون) باسی ستاتیکای هەرە باڵا دەکات، جا ئەڵقەی زنجـیرە سایکۆلۆژییەکان کە ڕووەو خۆشەویستی و عیشق دەچن بەم شێوەیەیە:

ڕوخسارە جوانەکانی سەر زەوی ← شێوازی نازدار

شێوازی نازدار ←———— کردەوەو جووڵەی نازدار

کردەوەو جووڵەی نازدار ←———— دەگاتە ترۆپکی ڕوخسارە جوانەکان[2]

هەڵبەتـــە نـــابێ زاراوەی ئیرۆتیـــك Erotic لەگـــەڵ زاراوەی ڕووتـــی pornography تێکەڵ بکرێـت کـە بابـەتێکی وێنـەکاری سێکسـییەو بەمەبەسـتی وروژاندنی سێکسـی نمایشـدەکرێت، کـە لەشـێوەی وێنـەو پۆسـکارت و پەیکـەرو گرتەی فۆتۆگرافی فیلمسازیدا دەخرێنە بەردەست. چونکە لەڕاستیدا ئەم زاراوەیە هـەر واتـای وێنـەو نیگـار لـەخۆ ناگرێـت، بـەڵکو چـالاکیی جەستەیشـی تێدایـە، هەرچەندە مـەرج نییـە دیمەنـەکان کتومـت سێکسـی بـن[3]، سـەبارەت بـەزاراوەی ئیرۆتیك Erotic لەوشەی (erotikos) گریکییەوە وەرگیراوەو مێژووەکەی بۆ ساڵی (١٦١٥– ١٦٢٥) دەگەڕێتەوە، لە فەرهەنگی ئینگلیزیدا ئەم مانایانـە دەبەخشێت:

ورووژاندن، یا تێرکردنی ئارەزووی سێکسی. عەودالّبوون، یان دەستبازیکردن لەگەڵ هەوەسبازی سێکسی. کەوتنە ژێر ئارەزوویەکی قورس و بەجۆشی سێکسی[٤]، پێشڕەوی سەید برایم لەم بارەیەوە دەڵێت: «گەر سەرنج بدەین ئیرۆتیکی گریکی زۆر لە (ڕووت)ی کوردییەوە نزیکە،... لەوەش زیاتر لە هەندێ ناوچەی بناری قەندیلدا لەکاتێ کە دەڵێن غەزال ئیڕووتە، ئەوا مەبەستیان غەزال ڕووتە»[٥].

ئیرۆتێك لەم سەردەمەی ئەمڕۆدا وەك زاراوەیەك لەبواری ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیدا بەکاردێت، هەرچەندە ئەم زاراوەیە هەندێك جار لەگەڵ سێکس بەهاوواتا دادەنرێن، سەبارەت بەسێکس وەك غەریزەیەکی مرۆڤایەتی چەندین پێناسەی جۆراوجۆر دێتەکایەوە، «ئارەزووی سێکسی Libido پرۆگرامێکی دیاریکراوە لەجەستەی مرۆڤ و گیانەوەردا هەیە، کە بەردەوام ئامانجی پارێزگاریکردنە لە جۆر، چونکە هیچ کەسێك باڵندەو ماسی و ئاسك و پشیلەی فێرنەکردووە کە هەندێك جار ئەو کردارە ئاڵۆزانە بکەن کە پێویستن بۆ بەدەستهێنانی جووتبوونی سێکسی، پرۆگرامی ئەم کارانە لەڕێگای کۆدی بۆماوەیی تایبەت بەرەمەك (غەریزە)ی سێکسییەوە دیاریدەکرێن»[٦]، ئیرۆتیك باس لەحەزو ئارەزووە نهێنییەکان دەکات، تاوتوێی چێژی پەنهانی ژیان دەکات، سنوورە داخراوەکانی نێرو مێ دەشکێنێ و ژیانیان بە ڕووتی پیشاندەدات[٧]، مارینا پێناسەی ئیرۆتیك بەم شێوەیە دەکاو دەڵێت: «دەربڕینێکی ناسکی تۆمارکراوە بۆ سێکس»[٨]، کەواتە ئیرۆتیك هەست بزاوتن و مەیل و حەزی سێکسی بەمرۆڤ دەبەخشێت. ئەمانەش خاڵی جیاکەرەوە بوون لەنێوان سێکس و ئیرۆتیکا.

ئەگەر چاوێك بەمێژوودا بخشێنین دەردەکەوێت، «ئەو کاتەی جیهان بەمرۆڤ ئاوەدان کراوەتەوە، هەموو هەلومەرجی ژیانی بۆ دابینکراوە، بەپێویستییە گیانی و لاشەیی و دەروونی و ژیری و جینسی و هی دیکەشەوە، دیارە بەپێی چۆنییەتی پێکهاتنە کیمیاوییەکەی ئینسان و بۆ مانەوەی جۆرەکەی زۆر شتی دەوێت، ئەوەی ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی پاراستنی جۆر، ئەگەر گشت هۆیەکانی دیکە هەبن و مرۆڤ خۆی لەکرداری جینسی پەرێز گرت ئەوا هێندەی پێ ناچێت مرۆڤایەتی لەبەین دەچێت»[٩]، ئەمەش بەهۆی ئەوەی مرۆڤ لەوەدا لە ئاژەڵ

جیادەکرێتەوە، کەوا مرۆڤ دەتوانێت تا ڕادەیەکی دیاریکراو حەزە سێکسییەکانی خۆی کۆنترۆڵ بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (( مرۆڤی کۆن هەمیشە ویستوویەتی هەموو شتێك بەرجەستە بکات، بۆیە ئەفسانەی سۆمەری و ئاشووری و گریکی و ڕۆمانی، دەیەها ئەفسانەو داستانی تر، لەهزرو بیری خۆیاندا زەوی دەکەن بە (مێینە) و ئاسمان بە (نێرینە). ئەم بەرجەستەکردنە جۆرە لێکدانەوەیەکی هزری مرۆڤایەتی بووە بۆ ئەو دیاردەو بوونەوەرانەی کەوتوونەتە بەرچاوی ئەو کات. هەر لەم ئەفسانانەوە تاکو هزری پۆستمۆدێرنزمی جیهانی ئەمڕۆ، چەمکی (ئافرەت) لەهەموو چەمکێك پتر بە مێیینە نیشاندراوە. (هەق، جوانی، زاوزێ، خێروبێر، شوێن، خاك، بەهرە، بەخشین ... ( ئەمانە هەموویان ڕەنگدانەوەی پارچەیەکن لەپارچەکانی هونەر، نەك ڕەنگدانەوەی تاوان و ڕووتبوونەوە. ... لە ئایینە کۆنەکانیش ئافرەت بایەخێکی گرنگی هەبووە، بووە بەخواوەند، واتە لووتکەی دەسەڵات، دەسەڵاتی ڕەها بۆ زاوزێ و جوانی، بۆ بەهرەو بەخشین. هەر لەخواوەندی (ئینانا)ی عەشتارو (ئەستەر) ی تەورات و (ئەفرۆدێت)ی گریکی و (ڤینۆس) ی ڕۆمانییەوە تا دەگاتە (کاوشکا)ی هۆرییەکان. ئەمانە هەموویان ئافرەت بوون ))[10]، سەرەڕای ئەوەش (( سۆمەرییەکان زۆر سووتاوی مومارەسەی سێکسی بوون، کەوا بەنەریتێکی کۆمەڵایەتییان دادەنا سەرەڕای ئەوەی کە نەریتێکی ئایینی بوو بۆ پاراستنی نەوەکان، داستانی گەلگامێش وەك سەرچاوەیەکی گرنگی ئیرۆتیکا سەیر دەکرێت، کەوا چەند نەریت و دیمەنێکی سێکسی تێدا دەردەکەوێت ))[11]، هەموو ئەوانەی باسکران بەڵگەی ئەوەن کەوا ئافرەت لەم کۆمەڵگا سەرەتاییانەدا بەرز ڕاگیراوە، ئەگەر بپەڕینەوە بۆ قۆناغێکی مێژوویی دواتر، دەبینین (( هەر لەسەردەمی یۆنانەوە دوو جۆرە خۆشەویستی بەرامبەر ئافرەت دەستنیشانکراون، یەکەمیان: حەز یا خۆشەویستی لەش، کە وشەی Eros خوای خۆشەویستی، بۆ وەسفکردنی بەکاردێ. دووەمیان: خۆشەویستی عوزری (ئەگاپیە Agape) یە، ئەم جۆرە خۆشەویستییە زۆرجاریش بەخۆشەویستی ئەفلاتونی دەناسرێت، چونکە ئەفلاتون هەوڵیداوە خۆشەویستی لەش (ئیرۆسی) بخاتە ژێر تەئسیری فەلسەفە میسالییەکەی خۆیەوەو ڕەنگێکی ڕۆحی پێبدا. لەگفتوگۆی داوەت Bang vet دا، ئەفلاتون لەزمانی سوکراتەوە ڕای

خۆی بەرامبەر ـ خۆشەویستی دەردەبڕێت ... بەلای ئەوەوە خۆشەویستی جۆرە حەزو ئارەزوویەکە لەو شتانەی کە نیمانن، لەو شتانەی کە لێیان مەحروومین و دەستمان ناکەون ... واتە خۆشەویستی لەپێداویستی و موحتاجییەوە پەیدا دەبێت ... (ئیرۆس) یش بەلای ئەفلاتونەوە خۆی جوان نییە، بۆیە بەدوای جوانیدا دەگەڕێت ... مرۆڤیش چونکە خۆی ناتەواوە، ئەوا هەمیشە بەدوای جوانی و تەواویدا وێڵ و عەوداڵە ... مادام هەر خواوەندە کە بێ کەموکورتی و نوقسانی بێت، ئەوا جوانی تەواو، جوانی موتڵەق، جوانی یەزدانە ... ئەو پێویستی بەخۆشویستنی کەس نییە، بەڵام هەموو کەس پێویستی بەخۆشەویستی ئەوە ... بۆیە مرۆڤی ناتەواو و موحتاج، لەگەشتە ئەبەدییەکەی بەشوێن جوانیدا، دەبێت بە ناچاری پلەبەپلە سەربکەوێت و ڕوو بکاتە ئاسمان، ڕوو بکاتە جوانی یەزدانی))[١٢]، دواتریش کاتێك کە ئایینە جیاجیاکان دەرکەوتوون، دەبینرێت ((داستانە ئایینییەکان بەژیانی بەختەوەریانەی بێزارئامێزی ئادەم لە بەهەشتدا دەستپێدەکەن، ... لەو ساتەوەی ئادەم و حەوا خۆیان لەسەر زەوی بینییەوە، شارەزای ئەوە دەبن کە ئێستا پێی دەڵێن (سێکس). لە سەرەتادا هەریەکەیان بەدوای شتێکدا دەگەڕێت (گەڵا هەنجیر)، تاوەکو ئەندامی سێکسیی خۆی پێ داپۆشێت، بەڵام ئەوە ڕێگا لەوە ناگرێت کە حەوا لە ئادەم سکی پڕبێت و هابیل و قابیلی ببێت))[١٣]، هەربۆیە دەبینین (( سێکس یەکێکە لەو پێداویستییە مرۆییانەی لەبەرایی دروستبوونی مرۆڤایەتییەوە، کێشەو ململانێ و چۆنێتی و چەندێتی لەسەرە، چونکە سێکس وەکو پێداویستییەکانی تر، مرۆڤێك و کەرەستەیەك یاخود خواردەمەنییەك نابەستێتەوە، بەڵکو مرۆڤێك و مرۆڤێکی تر دەبەستێتەوە، ئەمەیان کۆمەڵێك ئیلتیزام و هەست و سۆزی لێ سەرچاوە دەگرێت، لەهەمووی گرنگتریش مێژوویەك دروستدەکات، کە پاشان خۆ لێدەربازکردنی، کارێکی زەحمەتە، چونکە تۆ مامەڵە لەگەڵ مرۆڤ دەکەیت، دوو گەوهەرتان پێیە، ئاڵوگۆڕی دەکەن و لەئەنجامدا کەسی سێیەم دێتەدی، ئیتر خێزان و شارو دەوڵەت و جیهان دروست دەبێت))[١٤]، واتە سێکس مەرجێکی سەرەکییە بۆ دروستبوونی خێزان، ئەو خێزانەی لەژنێك و پیاوێك پێکدێن، چونکە (( هەر لەو دەمەوە کەبە بەرەبەیانی ژیانی مرۆڤایەتی دادەنرێ ئەمن وا دەزانم

پیاوێکی تایبەتی بۆ ژنێکی تایبەتی بووە، بەڵام دوای ئەوەی ژمارەی ئادەمی زۆر بوون، بەپێی بیرکردنەوەو تێکەڵاوی ئەو پەیوەندییە گۆڕاوە، جار بووە چەند پیاوێ بۆ ژنێ بوون، جاریش هەبووە چەند ژنێك بۆ پیاوێك بوون، بووشە کۆمەڵێ پیاو بۆ کۆمەڵێ ژن بوون، دیارە هەر کاتێ لەژنێ زیاتر بۆ پیاوێ بوو یا بەپێچەوانەوە، مانای تێکچوونی یەکسانییەو پەیوەندیی جینسی و کۆمەڵایەتی و خۆشەویستی لەنێوانیاندا ئاسایی نامێنێت، پێ بزانن یا نەزانن لایەکیان هەر تووشی بەش خوراوی دەبێ و لەکۆتاییدا پێکەوە هەڵناکەن و تەبایی لەنێوانیاندا هەڵدەگیرێت، بۆیە چاکترین جۆری ژن و مێردایەتی ئەوەیە کە هەریەکەیان تاقانەی ئەوی دیکەیان بێت، ئەوەش لەکاتێکدا دێتە دی کە پێشکەوتنی کۆمەڵگا لەوپەڕی بەرزی و خۆشیاریدا بێت، لام وایە ئەگەر ئەوە بکرێتە یاسایەکی رۆحی و خەڵکی بەو پێیە گۆش و پەروەردە بکرێن چ کردارێکی بێ ڕەوشتی و داوێن پیسی دروست نابێت ))(١٥)، هەرچەندە لەهەموو کۆمەڵگایەك ئەم نەریتە هاوشێوە نییەو جیاوازە، و لەهەندێك کۆمەڵگادا ژن و پیاو تەنها بەیەك پەیوەندی سێکسییەوە پەیوەست نابن، بەڵام لەکۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگای کوردیدا، کەوا بەهۆی دابونەریتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانەوە، کۆمەڵگایەکی داخراوە لە ڕووی سێکسییەوە، زۆرجار بەهۆی ئەو داخراوییە چەپاندنی سێکسی هاتۆتە کایەوە، ئەو چەپاندنەش لادان و ئاڵۆزی لێوە دروستبووە، هەروەکو هەندێك جار بیستوومانە کەوا (( لاوێکی کورد لە ڕێکخراوێکی نێو دەوڵەتی دامەزرێت، لەگەڵ بینینی یەکەمین کچی خۆرئاواییدا، سەربەستی سێکسی بیر دەکەوێتەوەو قیروسیای لێدەکات و لێی دەچێتە پێشەوەو پێی دەڵێت : Please give me one kiss واتە: تکایە یەك ماچم بدەرێ ))(١٦)، دیارە ئەم نموونەیە لەژیانی ڕۆژانەی ئەم کۆمەڵگایەی ئێمەدا بەدیدەکرێت و خاڵێك بووە بۆ لەدایکبوونی زۆر دەقی ئەدەبی، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین مەبەست لەسێکس هەر (( تەنها لەبەر زاوزێ نییە، لەپێناوی خۆشەویستی و چێژو بەختیاریی مرۆڤایەتیدایە، کەواتە لێرەدا دەبێ ئەوە بەنەزەر وەربگیرێ کە نەچێتە سنووری کاری ئاژەڵایەتی و داوێن پیسییەوە))(١٧)، کەواتە ئەگەر باس لەپەیوەندیی سێکسی بکرێت، ئەوا دەبێت بەوردی لەوە بکۆڵینەوە، کەوا پەیوەندییەکە لەکوێدا پەیوەندییەکی شەرعی و

ئاساییەو لەکوێدا سنووری ئاسایی خۆی دەپسێنێت، ئەوەش یاساو نەریتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان دیاریدەکەن، ئەو پەیوەندییە سێکسییەی لەکۆمەڵگای کوردەواریدا ڕێگەی پێدرابێت، تەنها پەیوەندیی نێوان ژن و مێردە، واتە پەیوەندیی سێکسی نێوان هەردوو هاوسەرەکە، لەم نێوانەدا شەرع و یاسا پەیڕەوکراوەکان ڕێگەی پەیوەندیی سێکسی پێداون، هەروەکو لەم دەقە شیعرەی کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەمان پێکدەهێنێت، لاوێك دەبینین کەوا بەهەموو هۆش و نەستییەوە ئارەزووی گەیشتن بەجەستەی دەستگیرانەکەی دەکات، ئەم بابەتە دەبێتە خاڵێك و لێکۆڵینەوەکەمان بەدەوریدا دەسووڕێتەوە، جا بەهۆی ئەوەی شاعیر لەپاڵ ناونیشانی دەقەکەیدا دەنووسێت شیعرێکی ئیرۆتیکی و ڕۆمانسییە، پێویستە لەم سەرەتایەدا کەمێك لەسەر ئەم دوو زاراوەیە بوەستین.

**تەوەرەی دووەم: پەیوەندیی ئیرۆتیك بەئەدەبەوە :**

زۆرجار لە پێناسەکردنی ئەدەبدا دەگوترێت ئەدەب ئاوێنەی کۆمەڵگایە، کاتێك کۆمەڵگاش لەمرۆڤ پێکبێت، ئەوا بێگومان هەرچی لەناو کۆمەڵگادا ڕوودەدات لەدەقە ئەدەبییەکانی ئەو کۆمەڵگایەدا دەردەکەوێت، هەربۆیەش کاتێك لەپێناسەکردنی سێکسدا دەگوترێت : «سێکس وەك هەر غەریزەیەکی تر پێویستی ژیانی مرۆڤە، بەبڕوای هەندێك لەزانایانی سایکۆلۆجیاو بەتایبەتی (فرۆید)، سێکس لایەنێکی دیاری (نەست) پێکدەهێنێت و پاڵنەری سەرەکییە بۆ داهێنان، بۆیە لەڕوانگەی سێکسەوە دەیانڕوانییە دەقی شیعری و شیکردنەوەو لێکدانەوەیان بۆ وێنەکانی دەکرد. هەرچەندە دانانی سێکس بەتاکە پاڵنەری داهێنان لەلایەن زۆرێك لەدەروونناسان و بەتایبەتی خوێندکارەکانی (فرۆید) لەوانە (ئەدلەر) ڕەتکرایەوەو بەیەکێك لەپاڵنەرەکان دانرا، لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵینەوەو باسکردنی هۆکارو ئەنجام و کاریگەرییەکانی سێکس بوو بەجێگەی مشتومڕی گەلێك لەزانایانی دەروونناسی و کۆمەڵناسی، جا لەبەرئەوەی ئەدەب بەگشتی و شیعر بە تایبەتی بەرهەمی مرۆڤەو دەروون و کۆمەڵ لەداهێنانیدا ڕۆڵیان هەیە، دەبینین لە بواری ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیشدا بایەخی پێدراوە، لەم ڕووەوە دەوترێت : لایەنێکی ڕەخنەی ئەدەبی ئەمریکی جەخت لەسەر سێکس دەکات و بەهێزێکی ئاراستەکەر لەژیان و بەرهەمەکانی نووسەردا دەیزانێت »[(١٨)]، سەرەڕای

ئەم لێکدانەوەیە، ئەگەر بگەڕێینـەوە بـۆ زاراوەی ئـیرۆس یـان ئیرۆتیـك، دەبیـنین لـەدەربڕینێکی تـردا سـەبارەت بـەو زاراوەیـە دەگوترێـت : ((بـەپێی کۆمیـدیای چـۆلەکەکانی ئەرسـتۆڤان ٤٥٠ـ ٣٨٥ پ.ز ئـیرۆس لـە نـیکس (شـەو) بـەدوو بـاڵی ڕەشەوە لـەدایکبووە، خـاوەنی دوو بـاڵی زێڕینـەو تیرەکـانی بـە ئـارەزووی خـۆی دەهاوێژێت، بە بوونەوەرێکی نێرەمووك دادەنرێت، چونکە هەردوو خاسیەتی نێـرو مێی تێـدا کۆبۆتـەوە، بـەو هۆیـەوە توانـای کۆکردنـەوەی ڕەگـەزەکانی بەیەکـەوە هەیـە، ئـەو خواوەنـدی جوانییـەو جـوانی خۆشـدەوێت، هەرکەسـێك بکەوێتـە بـەر تیرەکانی دەبێتە شاعیر))[19]، هـەر لەسـەر ئـەم بنەمایانـەی سـەرەوەش ئـەدەبێك هاتە کایەوە کە بەئەدەبی ئیرۆتیکی ناودەنرێت، (( ئـەدەبی ئیرۆتیکـی پێکهـاتووە لەچـیرۆکی خـەیاڵی و ڕاسـتەقینە کـە پەیوەسـتە بەپەیوەنـدیی سێکسـییەوە، لەبەرئەوەی غەریزەی وروژانـدن خوێنـەری خـۆی هەیـە، بۆیـە ئـەمجۆرە ئەدەبـە هاتـە کایـەوە، بـەڵام لـەدوای بڵاوبوونـەوەی ئایینـەکان و هاتنەکایـەی بەربەسـتی شەرعی زۆربـەی بڵاوکراوەکـانی ئـەمجۆرە ئەدەبـە بـە نهێنـی بڵاودەکرانـەوە))[20]، سـەرەڕای ئـەوەش لەهـەموو کۆمەڵگایەکدا دەبینرێـت، ((هەرچـەندە پیـاو هـەوڵی زۆری داوە بـۆ ئـەوەی لـەباری ئـافرەت و هێـزی کەمبکاتـەوە. هـەروەها هـەوڵی بەردەوامی بۆ ئەوەی کە بەنزمتری داناوەو لەو کـەمترەو شـایانی هـیچ بایـەخێك و گرنگییەك نییە، بەڵام ئافرەت لەهزری پیـاودا شـوێنێکی زۆری گرتـووە، هەرچـەند کە توانی لە زۆربەی بوارەکانی کۆمەڵگەی دوورخاتەوە، بەڵام وەك مۆتەکـە هـزری داگیرکردووە، ناتوانێت لەهزری خۆی دەرکات، ناتوانێت لێی ڕاکات بۆ هەر کوێیەك بچێت، ئەوەی بەرهەمی ئەدیبان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بخاتـە ڕوو لـەکۆن و نـوێ، سەری سوڕ دەمێنێت لەو ڕادە زۆرەی چیرۆك و شـیعرو ڕۆمانانـەی باسـی ئـافرەت دەکەن))[21]، بەدەربڕینێکی ڕوونتر دەتـوانین بڵـێین: (( مرۆڤایـەتی لەسـەرەتایەکی زووەوە لـــووتی بەکێشـــە و مەســـەلەی جینســـییەوە تەقیوەتـــەوە، داســـتان و ئەفسـانەکان پـڕن لـەزۆرانبازیی جینسـی لـە بـەینی قارەمانەکانیانـدا، ئـەدەبی فۆلکلۆریش لەوبارەوە بەشێکی چاکی بۆ خۆی گرتووە، هـەروەکو ئـەوە بەگشـتی باسـکراوە، گـەلێك لـە فەیلەسـووف و گـەورە پیـاوان و زانـا دەروونییـەکانیش بەتایبەتی قسەیان لێوە کردووە، ئاشکرایە هەریەکەیان بـەپێی مـەودای ژیرێتـی و

چینایەتی و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی خۆی لێکیداوەتەوە ))[٢٢]، ئەگەر قووڵبینەوە بۆ ناو ئەدەبی نووسراوی کوردیش، ئەوا دەتوانین بڵێین بەهۆی سروشتی کۆمەڵگای کوردی، هەروەکو لەمەوپێش ئاماژەمان پێکرد، کە بەهۆی نەریتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانەوە لەڕووی سێکسییەوە تا ڕادەیەکی زۆر کۆمەڵگایەکی داخراوە، (( قەیرانی سێکس لەکۆمەڵگای کوردەواریدا، شایانی لەسەر نووسین و قووڵبوونەوەو چڕبوونەوەیە، چونکە هەندێ لەسۆسیۆلۆژەکان لەو باوەڕەدان پاشکۆیەتی و بەجێمانی میللەتەکەمان بۆ هەندێ هۆکار دەگەڕێتەوە، یەکێکیان قەیرانی سێکسە. بەو پێیە بۆ چارەسەرکردنی ئەم قەیرانە، پێویستمان بەگوتارو ئەدەبیاتێکی وەهایە، بتوانێت سەرە داوەکانی ئەو کلافەیە بداتە دەستمان، تاکو بتوانین شیبکەینەوە ... ئەمەیش کارێکی هەروا سانا نییە، بۆیە نووسەرو بیریاری ساناش ناتوانن خۆیانی لەقەرەبدەن. ئەوانەی لەسەر کۆچی کورد بۆ هەندەران دەدوێن، هەرگیز ئاگایان لەوە نییە کە یەکێك لەهەرە گەورەترین هۆکانی سەرهەڵگرتنی لاوی کورد، قەیرانی سێکسە، ئەو لەڕێی ڕاگەیاندنەوە، دنیای سەرنگون لەناو سێکسدا دەبینێت و خۆیشی تەمەنی لە سی ساڵ لایداوەو هێشتا ماچێکی نەکردووە، ئا ئەم جیاوازییە ترسناکەیە بەڕاستەوخۆ یاخود بەناڕاستەوخۆ، ئەو کۆچە بەربڵاوەی لەناو لاواندا بەرپاکردووە))[٢٣]، ئەم بابەتە کەرەستەیەکی خاوی زۆر بەرهەمی ئەدەبی کوردی پێکدەهێنێت، هەر بەهۆی ئەم هۆکارانەیە بەدرێژایی مێژووی ئەدەبی کوردی تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت، ((گرنگترین کێشە لەگەڵ سەرهەڵدانی شیعری کوردییەوە بەرجەستە بوویێت، کێشەی ئافرەتە. یەکێك لەکێشە کۆمەڵایەتییەکان کە هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆش بەردەوامە. کێشەی بەکەم زانینی نرخی مرۆڤە وەکو بوونەوەرێکی هۆشمەند بەتایبەتی ئافرەت، چونکە ئافرەت لای ئێمە هەتا ئێستا زانیاریی تەواو دەربارەی خۆی نازانێت و نەزانییەکەشی سەبارەت بە بەهای کۆمەڵایەتی، وای لێکردووە ئەرکی سەرشانی خۆی و مافەکەی وەکو (دایك ـ خوشك ـ ژن) دەستەبەر نەکات. هۆیەکەشی ئەوەیە کە هێشتا ئامێتەی کۆمەڵگایەکی شارستانی و پێشکەوتووی ئایدۆلۆژی نەبووە ))[٢٤]، بەم هۆیەوە سێکس و پەیوەندییە سێکسییەکان بەشێکی زۆری دەقی ئەدەبی پێکدەهێنن، بەڵام بەداخەوە بەهۆی ئەوەی بەهێڵی سوور

داندراوە، تەنانەت ڕەخنەگرانی بواری ئەدەبیش نەیانتوانیوە خۆیان لە قەرەی وەها باسێك بدەن.

لە جۆرەکانی شیعریشدا جۆرێك شیعر هەیە، کەوا هەندێك جار لەگەڵ ئیرۆتیکدا هاوشێوە دەبن، ئەویش بریتییە لەشیعری داشۆرین، لەبارەی سەرهەڵدانی ئەو جۆرەی شیعرەوە دەگوترێت: ⁽⁽ شیعر، هەر زوو بەگوێرەی میزاجی کەسێتی شاعیرەکانەوە، دوو لقی لێبۆتەوە، ئەوانەی بەرزو سەنگین بوون کەوتنە لاساییکردنەوەی کردەوەی بەرزو کاری کەسانی جوامێرو گەڕناس، کەچی ئەوانەی پەست و نزم بوون لەبارەی کەسانی نزمتری ئەم ژیانەیان نووسی. بەم چەشنە، جۆرێکیان ویردی ئایینی و پیاهەڵدانیان نووسی و ئەوانی تر دەستیان بەنووسینی توانج و داشۆرین کرد ⁾⁾[٢٥]، داشۆرین وەها پێناسە دەکرێت کەوا ⁽⁽جۆرێکە لە شیعر، پێچەوانەی ستایشە، کاتێك شاعیر دەیەوێت گوزارشت لە تووڕەیی و گاڵتەپێکردنی خوی بەرامبەر بەکەسێکی دیاریکراو بکات، بەپێچەوانەی ستایش کە لەسەر بنەمای ئارەزوو و سەرنجڕاکێشان دروستدەبێت، داشۆرین لەسەر بنەمای بەکەم سەیرکردن و گاڵتەپێکردن دێتەکایەوە، هەرچەندە زۆرجار کۆمیدی دەبێت، بەڵام بەئامانجی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگا دەنووسرێت⁾⁾[٢٦]، بەشێوەیەکی ڕوونتر دەشێت پێناسەی داشۆرین بەم شێوەیە بکەین: ⁽⁽ شیعری داشۆرین : ئەو شیعرەیە کە خەوشەکانی ئەو کەسە دەژمێردرێ و پیشانیان دەدات کە شیعرەکەی ئاڕاستە دەکرێ. ئەمەش لەئەنجامی سۆزی ڕق و کینە لای شاعیر لەدایکدەبێت ⁾⁾[٢٧]، ئەم جۆرەی شیعر جیاوازە لەشیعری ئیرۆتیك، چونکە بنەمای ئیرۆتیك خۆشەویستییەو نەك گاڵتەپێگرن و خەوش لێگرتن، بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونە کەوا ئەو دووجۆرە شیعرە تێکەڵدەکەن.

بەشێوەیەکی گشتی ⁽⁽ هۆنراوەی سێکسی لەچەند شێوەیەکی جیاوازدا خۆی دەبینێتەوە:

١. بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو ئاشکرا، باسی پڕۆسیسی سێکسی، نێوان نێرو مێ دەکات، لە ئەندامەکانی زاوزێی نێرینەو مێینە دەدوێ، وەك ئەو هۆنراوانەی هەردوو هۆنەری کلاسیکی کورد (ئەدەب و ناری) هۆنیویانەتەوە، یا ( قانع) لەهۆنراوەی (خاتوو شەیتان لە خەوا) نووسیویێتی⁾⁾[٢٨]، شاعیر بارێکی نائاگایی

دروستدەکات، دانەپاڵ شەیتان، لەرووی دەروونییەوە ئەوە دەگەیەنێت، کە ڕاستە بەحەزێك گەیشتووە، بەڵام وای دەردەخات کەوا شەیتان ئەمەی پێکردووە، بۆ ئەوەی دەروونی ئاسوودە بێت کارەکە دەداتە پاڵ شەیتان.

٢. « بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و بەهێما، لەپرۆسیسی سێکس دەدوێ، بەسەر ئەندامەکانی زاوزێی نێرینەو مێیینەدا هەڵدەدا، بەم شێوەیە کار لەمرۆ دەکا، هەستی ڕادەکێشێ، دەیهەژێنێ و ئارەزووی سێکسی لا پەیدا دەکا، وەکو (نالی) لەهۆنراوەی ( ئیلتیقای پۆڵا و ئاسن) و ئەو هۆنراوەیەی بۆ ( مەستوورە) خانمی نووسیوە »[٢٩] تا بەهانەیەك دەهێنێتەوە، دەڵێت ئەوە لەژێر کۆنترۆڵی خۆم نەبووە، خەونێکە بینیومە و وەك خۆی دەیگێڕمەوە، حەزو خولیا سێکسییەکانی خۆی بۆ جەستەی مەستوورە دەداتە پاڵ خەون، بۆ ئەوەی بڵێ ئەگەر خۆشم حەزم نەکردبێ ئەم کارە ڕوویدات، ئەوا لەژێر کۆنترۆڵی خۆم نەبووە، خەونەکەم وابووەو دەیگێڕمەوە.

٣. « لەپرۆسیسی سێکسی نادوێ، بەڵام باسی ئەندامە ناسکەکانی نێرو مێ دەکا، سەرنجی خوێنەر بۆ پرۆسیسی سێکس ڕادەکێشێ، لەم بوارەدا هێندێ لە هۆنراوەکانی ( گۆران، مەدهۆش، حەسیب قەرەداخی، کامیل ژیر، شێرکۆ بێکەس) لەم بەشەدا جێی خۆیان دەکەنەوە، یا ئەو دوو هۆنراوەیەی (کوردی) بۆ (قالە) ی گوتووەو (مەولەوی) بۆ ( شاگرد ئاسنگەرێکی نووسیوە)، هەر لەم بەشەدا پۆلێندەکرێن، پێم وایە ئەم جۆرەیان بەشی هەرە زۆری هۆنراوەی سێکسی لەوێژەی کوردیدا بۆ خۆی داگیر دەکا»[٣٠]، هەروەکو لەم لێکۆڵینەوەدا نموونەیەکی ئەمجۆرە شیعرە شیکراوەتەوە.

٤. « باسی هەموو پرۆسیسەکەو ئامرازەکانی سێکس دەکا، بەڵام شێوەی داشۆرین بەخۆیەوە دەبینێ بەهۆی هێرشکردنە سەر کەسی دووەمەوە، یا لەشەڕە هۆنراوەدا، دوو هۆنەر وەڵامی یەکدی دەدەنەوە، زۆر بەڕاشکاوی باسی پرۆسیسی سێکس، ئەندامەکانی زاوزێی نێرینەو مێیینەش دەکەن، وەك هۆنەران (شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شوکری فەزڵی) لە هۆنراوەکانیاندا پێڕەویانکردووە »[٣١]، هەموو ئەو شیعرانەش بەپێی تیۆرەکەی فرۆید دەتوانرێت لێکۆڵینەوەیان بۆ بکرێت، هەروەکو لەکۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا پیشاندراوە.

**تەوەرەی سێیەم : ئیرۆتیك و ڕۆمانسیزم :**

ڕۆمانســیزم یــان ڕۆمانتیــك، یــان زۆرجــاریش بەڕۆمانســی، ڕۆمانتیــك، ڕۆمانتیکییــەت، ناودەنرێـت، بریتییــە لــە ڕێبــازو قوتابخانەیــەکی ئــەدەبی(٣٢)، لەپێناسەکردنی ئەم ڕێبازە ئەدەبییـەدا دەگوترێت : ‹‹ ڕۆمانسـیزم Romantisme یـان ڕۆمـانتیزم بـەو بزووتنــەوە ڕۆشـنبیری و ئـەدەبی و هونەرییـە دەگـوترێ کـە لەئــەوروپا لــەکۆتایی ســەدەی ١٨م بــەملاوە بنــەماکانی ئــازادی و زاتییــەتیان Subjectivite بڵاوکردەوە دژی بنەماکانی کلاسیزم و عەقڵخوازیی فەیلەسووفانەی کلاسـیکەکان. ڕۆمانسـیزم بەڕێبازەکـە دەگـوترێ، بـەڵام ڕۆمانتیـك Romantique ئاوەڵناوە، هەروەها بـەداهێنی سـەر بەڕێبازەکـە دەگـوترێ. وشـەی ڕۆمانسـییەت هەمان واتای ڕۆمانسیزم دەگەیەنێ. وشەی ڕۆمانسـی واتـای ڕۆمانتیـك (نووسـەرو هونەرمەندی ڕۆمانتیك ) دەگەیەنێ. عەرەب و کـورد دایانهێنـاون››(٣٣)، لەبنەڕەتـدا ئەو ڕێبازەی کە ڕۆمانسیزم ناونراوە‹‹ بریتییە لە پارچەیەکی ئـەدەبی، یـا کـارێکی ئەدەبی، کە بەڕۆمانس Romance یان Romanz بچێت، وەکو لە فەڕەنسـی کـۆن واتای وشەکە بەم شێوەیە بـوو، Romance یـش وەکـو لەسـەدەکانی ناوەڕاسـت ئەوروپییــەکان پێناســەیان کــردووە: بریتــی بــوو لــەو چــیرۆکە درێــژەی وێنــەی کۆمەڵگای باڵا ـ ئەرستۆقراتی ـ، هــەروەها وێنــەی کـارە ئەسپسـوارییە بـەرزەکانی لەسەر بنەماکانی موغامەرات و پاڵەوانێتی و خۆشەویستی پاکی لەپەرستش چووە دەکێشا، ئینجا بەتێپەڕینی ڕۆژگار، واتای ئەوە ئەو وشەیە فراوانتر بـوو و ئیدیکـە هەموو ئەو داستانانەی گرتەوە، کە لەپێش ئەو جۆرە چیرۆکانە هەبوون، هەروەها ســەربردە ئاینییــەکانی پــڕ لەقوربانیــدان و تەنانــەت ئــەو چــیرۆکە واقیعیانەشــی گرتەوە، کە گیانی ڕۆمانسـییەتیان بەسـەردا زاڵـە››(٣٤)، سـەرەڕای ئـەم پێناسـانە، ئەگەر لەخاسیەتەکانی ڕۆمانسیزم ورد بینەوە، دەبینین یـەکێك لـەم خاسـیەتانەی ڕۆمانسـیزم لەکلاسـیك جیـا بکاتــەوە، ئەوەیـە کـە‹‹ کلاسـیکەکان ئـەقڵ و هـۆش بەبناغەی شیعری کلاسیك دەزانـن، کەچـی ڕۆمانتیکـەکان پـتر پابەنـدی هەسـت و خەیاڵپـەروەرین››(٣٥)، کەواتــە ئەگــەر بمانــەوێت لــەبارەی ڕۆمانسـییەتەوە بـدوێین ‹‹دەبــێ بزانــرێ، لای ڕۆمانســییەکان، لــەپاڵ عەقڵــدا، دڵ و هەســت و ســۆزیش دنیایەکی تایبەت و سەربەخۆی هەیە، لای مرۆڤ هەست و نەست پێش فیکرو عەقڵ

دەکەوێت، هەروەها ئارەزووش زیاتر لەهەقیقەت کاریگەرێتی هەیە. لەم ڕووەوە بەڕای ڕۆمانسییەکان، پێویستە هەست و هەوەسەکانی ڕۆح، پێشچاو بخرێن و لێیان بکۆڵدرێتەوە. ئەلفرێد دی مۆسیێ دەیگوت: ئێمە دەبێ وڕێنەکانیشمان بنووسین. واتە دڵ دەبێ بێ قەیدو بەند هەرچی شتێکی حەزدەکا بیڵێ، بیڵێت. دەربڕینی خەم، خەون، ئازادی، سۆزو هەستە خرۆشەکان، تەنیایی و خەڵوەت و خۆشەویستی، بابەتە دیارەکانی ڕۆمانسیزمن. لەئەنجامی ئەم بایەخدانەی نووسەری ڕۆمانسی بەدەروون، لەئەنجامی ئەم ڕۆچوونەی هونەرمەندی ڕۆمانسی بەناو کانگای تاکەکەسدا، دەبینین هونەر لەڕووی دەروونناسییەوە دەوڵەمەندتر دەبێت، ئەدەب قووڵاییەکی سایکۆلۆژیی بەبرشت پەیدا دەکات ››[٣٦]، لەشیکردنەوەی ئەم پێناسانەدا دەگەین بەو ڕاستییەی کە‹‹ هونەرمەندی ڕۆمانتیك خۆزی و پێداویستییە ڕوحییەکانی خۆی زۆر بەلاوە گرنگەو دەڵێت ئەوەی کە ئیلهام بە هونەرمەند دەبەخشێت و بەماناو چەمکی ژیان دەژمێردرێ (خۆشەویستی و پەیوەندییە) دەبێ ئەم پەیوەندییە ئازاد بێ. ئەگەر هونەرمەند بەهۆی گوشاری کۆمەڵگەو یاساکانی ڕەوشت یان هەندێ خورافاتەوە بەربەرەکانی بکرێ و تواناو بەهرەکانی بە پەنهانی بمێننەوە هەقی خۆیەتی کە دەربارەی کۆمەڵگەو یاسا ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگە داوەری بکات و حوکمی خۆی بدات و ژینگەو ئەخلاقێك فەراهەم بکات کە بۆ نەشونمای ئەو لەبار بێ ـ ئەدەبیات نابێ یاسایەك بێ بۆ سنووردارکردنی خۆشەویستی و پەیوەندییەکان. ئەدەبیات بۆی هەیە هەر گۆشەیەکی ژیان، چ جوان و چ ناشرین، چ بەرزو چ نزم، بکات بە بابەت و کەرەستەی خۆی. دەتوانێت لەهەر سەردەمێکی مێژوویی و لەهەر جۆرە دیمەنێکی دونیا وەربگرێ ››[٣٧]، لە ئەنسکلۆپیدیای ساڵی (١٧٥٥) نووسراوە، کە شێوەیەکە لە خۆشەویستیی ڕۆمانسی ئامێز مرۆڤ بەرەو هەوەسبازیی سێکسی ڕادەکێشێت، واتا شێوەیەکی باڵای ڕووتەمەنییە، بەڵام بەدەرهێنانێکی پوختەترو جوانترو پەسندترو پڕ وورووژاندن بە وەستاکارییەکی شاراوە[٣٨].

هەموو ئەو خاسیەتانەی لەڕۆمانسیزمدا دەردەکەوێت لەم شیعرەی شێرکۆ بێکەسدا بەرجەستە دەبن، کەوا لێکۆڵینەوەکەی بەردەستمان پێکدەهێنێت، هەروەکو لەبەشی داهاتووی لێکۆڵینەوەکەدا ڕوونی دەکەینەوە، لەوێدا هەموومان

ئـەو مافـە بـەڕەوا دەزانـین کـەوا شـاعیر بـەخۆی داوە کـەوا لـەپاڵ ناونیشـانی شـیعرەکەی ناونیشـانی ڕۆمانسـیزمی نووسـیوە، واتـە لـەم لێکۆڵینەوەیـەدا ڕوون دەبێتەوە کەوا ئیرۆتیك و ڕۆمانسـیزمی دەقەکـە لەکوێدایـە، چـونکە ڕۆمانسـییەت گرنگی بەسروشت و جوانی ئافرەت دەدات، زۆرجار لـەدەمی کەسـی ئاساییشـەوە دەبیسـتین کاتێـك لـە کەشـوهەوایەکی خـۆش و جـوان و دڵگـیر دابنیشـێ بەکەشوهەوایەکی ڕۆمانسـی ناویـدەبات، واتـا ئـاڵ و واڵایـی و جـوانی و ناسـکی و دیمەنی سروشـت و ئـافرەت و جـوانی لـەنێو کرۆکـی ڕۆمانسـییەتدان، بۆیـە دەقـە ئیرۆتیکییـەکان سـەودا لەگـەڵ ڕۆمانسـییەت و جوانیـدا دەکـەن و هەسـت و سـۆز دەبزوێنن.

هەڵبەتە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبی ڕۆمانسیزم ئەمانەن: ئافرەت، سروشـت، ڕەشـبینی، نـامۆیی، ...لـەو تایبەتمەندییـە نزیـك دەبێتـەوە کـە ئیرۆتیکـە، ڕۆمانسییەت گرنگـی بـەخودی تاکـەکان دەدات و شـۆڕدەبێتەوە بـۆ نـاخ، شـێرکۆ بێکـەس لـەڕێی کـوڕو کچـێکەوە شـۆڕبۆتەوە بـۆ نـاو نـاخی خـۆی و حـەزو خولیـا کپبووەکانی دەخاتە ڕوو.

## بەشی دووەم
## ئیرۆتیك له شیعری ( حەمام ) دا

### تەوەرەی یەکەم: بایەخدان بەڕێکپۆشی و چوون بەرەو ئیرۆتیك :

پێکهاتەی شیعرەکە بەچەند وێستگەیەك خۆی نمایشدەکات، بـەڵام ئێمـە بـۆ کارئاسـانیی توێژینەوەکـەمان، شـیعرەکە دەکەینـە چـەند وێسـتگەیەك و هـەر وێستگەیەکیش ناوێکی لێدەنێین، بۆ ئەوەی بۆ توێژینەکەمان بابەتەکـە بەرچـاوتر بێت و زنجیرەی بەسەرهات و ڕووداوی شـیعرەکە بخەینـە ڕوو و وێسـتگە وێسـتگە لێکدانەوەی بۆ دەکەین.

**یەکەم : دەستپێك:**

لەدەسـتپێکی ئـەم دەقـە شـیعرەدا شـاعیر لەسـەر زمـانی گـەنجێکی دەستگیراندار دێتە قسە، کەوا ڕۆژەکانی دوای دەستنیشانکردنی دەسـتگیرانەکەی دەژمێرێت و دەڵێت:

**ژماردوومە پازدە ڕۆژە دەزگیرانی و**
**ئەڵقەی پەنجەی دەستی ڕاستمان**
**دوو ئەستێرەی زێڕینن و**
**جریوەیان زۆر تازەیە،**
**ئاوێنەی پێکەنینیشمان**
**چون ڕوومەت و چاوی گەشمان**
**بۆ یەکتر ئەبریسکێنەوە !**
**لە ناوەوەش ماخۆلان و هەوەسی جنس ژیلەمۆیە و**
**بای گەنجێتی لێی ئەدات و**
**گڕ ئەگرێت و لرفەی دێت و**
**بەردەوامیش**
**کوورەیەکی داگیرساوی**
**شەوانەیەو ڕۆژانەیە !**
**هەموو ڕۆژێ دوو سێ جارێ**
**بە بیانووی جۆراو جۆرەوە،**
**کە کەس بڕوایان پێناکا،**
**دێمە ماڵتان !**
**ئەوا ئێستاش خۆم گۆڕیوەو**
**بەر ئاوێنەی دیوارەکە بەرنادەم و**
**لاجانگ درێژ...لە پەڕەی گوێش بەرەو خوارتر**
**جارێك لەسەر لا تەماشای خۆم ئەکەم و**
**جارێکی تر، ڕێك بەرامبەری ئەوەستم**
**ئەچمە پێشی و دێمە دواوەو**
**دەست ئەخەمە سەر کەمەرو ...** ل. ٧٥

لەم کۆپلەیەدا شاعیر باسی لە کوڕێکی گەنج دەکات کە پازدە ڕۆژە دەستگیرانی هەیە، دەستگیران لەناو ئەو نەتەوانەی پەیڕەوی شەریعەتی ئیسلامی دەکەن، بریتییە لە قۆناغێك پێش هاوسەرگیری، ئەو قۆناغە لەو کاتەوە دەستپێدەکات کە کوڕێك داوای هاوسەرگیری لەکچێك دەکات، واتە خوازبێنی

دهکات، ((خوازبێنی بریتییه لهداواکردنی پیاوێك بۆ هاوسهرگیری لهگهڵ ئافرهتێکی دیاریکراو، جا ئهم داوایه ئاڕاستهی ئهو ئافرهته بکات یان خێزانی ئافرهتهکه))[٣٩]، تـا ئهوکاتـهی هـهردوو هاوسـهر دهچـنه پـهردهوه. لـهم دهقـهدا شـاعیر بـاس لـه سـاتێکی ئـهو قۆناغـه ناسـکه دهکـات کـه بهدهسـتگیرانی ناسـراوه، لهسـهرهتادا وهسفی جلوبهرگ و جهستهی خۆی و حهزو ئارهزووهکانی دهکـات، بـهدوو وێنـهی نوێـوه شـۆڕ دهبێتـهوه نێـو جیهـانی خـهیاڵ، ههڵقـهی دهسـته ڕاسـتیان وهك ئهستێرهیهك وهسفدهکات، ئاشکرایه لهماوهی دهستگیرانیدا هـهردوولا ههڵقـهکانی پهنجهیان لهپهنجـهی دهسـتی ڕاسـتیان دهکـهن، و دوای هاوسـهرگیری ههڵقـهکان دهگوازرێنـهوه بـۆ دهسـتی چـهپ، لای شـاعیریش ئـهو ههڵقـه زێڕینـه تهزوویـهکی خۆش بهو گهنجه دهبهخشێت، دوای ئهو دیمهنه، بهردهوام دهبێـت و دهریـدهخات کهوا تهنانهت پێکهنینیشیان وهك ئاوێنهیهك مانـای ڕوونـی و جـوانی و چـۆنییهتی پێکهنینهکـهیان پیشـاندهدات، واتـه باسـی کوڕێـك دهکـات لـه هـهرهتی هـهره گهنجیدایه، پاش ئهوهی پازده ڕۆژ تێپهڕ بووه کهوا دهستگیرانی ههیه کهچـی زۆر شهرمنانه دهچێته ماڵی دهستگیرانهکهی.

ئـهو کهسـهی شاکهسـی چیرۆکه شـیعرییهکه پێکـدههێنێت، ڕێگـهی ئـهوهی پێنادرێت پیاسهیهك لهگهڵ دهستگیرانهکهی بکات و یهکتر بدوێنن و دهستی یهکتر بگرن، شاعیر باس لهگهنجێکی سـهردهمی خـۆی دهکـات، واتـا سـاڵانی شهسـت و هـهفتاکانی سـهدهی بیسـتهم، ڕهنگـه خۆشـی لهههنـدێ لـه وهسـفهکاندا ببێتـه شاکهسـی بهسـهرهاتهکان، بۆنموونـه وهك لـه گوتـهی (لاجـانگ درێـژ )دا دهردهکهوێت، سهردهمی گهنجیی شـێرکۆ بێکـهس مـۆدیلی لاجـانگی درێـژ بـووه، لهوێنه کۆنهکانی شێرکۆ بێکهسدا، ئهوانهی لهساڵانی شهست و ههفتاکاندا گـیراون ئهوه دهبینرێت، بهڵگهیهکی تر بۆ ئهو بۆچوونه دهکرێت بریتـی بێـت لـهو وتهیـهی خـودی شـاعیر کـهوا پرسـیارێکی ڕووبـهڕوو کراوهتـهوهو لێـی دهپرسـن: ((یهکـهم چـرپهی خۆشهویسـتی لـهژیانی تایبـهتی خۆتـدا!))[٤٠]، شـاعیر لهوهڵامـدا دهڵێـت: ((خۆشترین و زیندووترین ساته وهختهکانی ژیانی مرۆڤ بهلای منهوه سـاته وهختـه ڕۆمانسییهکانن، ئهو کاتانهی کـه جۆرێـك لهتوانـهوه لـه ئاوێتـهبوونی دوو جهسـته لهنێوان دوو خۆشهویستدا ڕوو دهدات، بهڵام قهتیش ئـهم تینوویهتییـه ناشـکێت و

وەك غەریزەیەکی ئەزەلی هەمیشە لە نوێبوونەوەدایە، هەروەکو (بایرۆن) ی شاعیری ئینگلیزی دەڵێت : (خۆزگە هەرچی دەم و لێوی ژنی جوانی ئەم دنیایە دەبوون بەیەك دەم و منیش ماچم بکردایەو تەواو بوایە)، بەڵام هەرگیز تەواو نابێت، یەکەم چرپە، یەکەم ماچ بێ، یەکەم نامە بێ، هەر هەموویان ئەو یادگارانەن کە بیرچوونەوەیان بۆ نییە. ئێمە زۆر ڕووداوی گەورەو بەسەرهات و وێنەی ژیانی ڕۆژانەی خۆمان بیر ئەچێتەوە، بەڵام یەکەم ماچمان هەرگیز بیر ناچێتەوە، یەکەم دەستگوشین و یەکەم ساتە وەختەکانی دڵداریی خۆمان بیر ناچێتەوە»[٤١]، دوورنییە هەر ئەم هەستە ڕۆمانسییەی شاعیر ئاماژەی پێکردووە، هەوێنی لەدایکبوونی ئەم دەقە شیعرە بووبێت، و دوای چەندین ساڵ بیرو هۆشی بۆ سەردەمی گەنجی دەگێڕێتەوە، هەروەکو دواتر لە کۆپلەکانی تردا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە شاعیر لەتەمەنی حەفتا ساڵی واتا لە ساڵی (٢٠١٠) ئەم شیعرەی نووسیوە، بەفلاش باك گەڕاوەتەوە سەردەمی هەڕەتی گەنجی خۆیی و باسی کۆمەڵگای ئەوسا دەکات، هەڵبەتە واقع هەمیشە لەبەرهەمە ئەدەبییەکاندا ڕەنگدەداتەوە، چونکە «ئەدەب و سەرجەم ژیانی ڕۆشنبیریی هەر نەتەوەو میللەتێك ڕەنگدانەوەی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییە»[٤٢]، هەربۆیە دەبینین شاعیر باس لە زەمەنێك دەکات، کە مۆبایل و ئینتەرنێت نەبووە، تاکە هۆکار تەنها ئەوە بووە کە کوڕ و کچ یەکتر ببینن، ئنجا دەتوانن قسە لەگەڵ یەکتر بکەن و سۆزو خۆشەویستی بەیەکتر ببەخشن.

**دووەم : خۆخەریککردن بە ڕێکپۆشی:**

لەچەند دێری دواتری دەقە شیعرییەکەدا، شاکەسی چیرۆکە شیعرییەکە خەریکی بایەخدانە بەجوانی و ڕێکپۆشیی خۆی، و لەبەرخۆیەوە دەڵێت:

**ئەمجارەیان بەتەنها هەر دەموچاوم**
**لە ئاوێنەکە زۆر نزیك ئەخەمەوە**
**لەولای لێومەوە زیپکەیەك بەدی ئەکەم**
**زۆر بچووکە، بەڵام ئەبێ بەمەراق و**
**خۆم لە دڵما گەورەی ئەکەم.**
**لە پڕ بەبیرم دێتەوە: نیو قولانجێ**

**پاژنەی پێمی بۆ هەڵئەبڕم، لەسەر ڕەفەی**
**گەچینی ژوور، شووشە بۆنی سەر نەکراوەی**
**مارکەی" پاریس" دائەگرم و کڵاوەکەی با ئەدەم و**
**ئەکرێتەوە و ئەمسەر ئەوسەر،**
**دوو کەڕەت ڕای ئەوەشێنم و دەمی ئەکەمە ڕوخسارم و**
**چوار پێنج جارێ پژ...پژ...پژ**
**لە ڕوومەت و لە سمێڵ و لە لاجانگ و**
**لە لامل و ملیوانی کراسەکەی ئەپرژێنم،**
**هەندێ شوێنی ڕیشی تاشراو**
**بۆ ساتێ ئەچووزێنەوەو**
**چووزانەوەیان زۆر تیژەو**
**چاوێکم پێ ئەنووقێنن!**
**ئەوسا ئیتر ئەچمە دواوەو قۆپچەی چاکەت دائەخەم و**
**ئێجگار دڵم بە خۆم خۆشەو**
**هەر خۆیشم خۆم هەڵئەکێشم ...** ل. ٧٧

ئەو گەنجەی لەشیعرەکەدا دەردەکەوێت، لە هەڕەتی گەنجیدایە، زۆر دڵی بەژیان خۆشە، زۆر خەریکی خۆ جوانکردنە، تەنانەت زیپکەیەکی بچووك لەلای لێویەوە دەرچووە، کە شتێکی وانییە کەچی پێی سەغڵەت بووە، گەنج هەمیشە بیر لە جوانی و نایابیی خۆی دەکاتەوە، کاتێ کە مرۆڤ تەمەنی هەڵدەکشێت سەرەتا مووی سەری وردە وردە سپی دەبن، تەنانەت مرۆڤ خەفەت لەتاڵە موویەکیش دەخوات کە سپی دەبێت، مرۆڤ پێی خۆشە هەمیشە گەنج بێت و هەمیشە جوان بێت، دواتر تاڵەموو لە دوای تاڵەموو سپی دەبن و ڕوخسار لۆچی تێدەکەوێت و نیشانەکانی پیری بەدەردەکەون، واتا مرۆڤ پلە بەپلە خۆی لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و بەرەو پیری چوون ڕادەهێنێت.

شاعیر لەڕێی ڕۆمانسییەت و جوانییەوە دەیەوێ بخزێتە نێو جیهانی شیعرەکەی، لێرەدا هونەرکارییەکی تر بەدیدەکرێت، کە بریتییە لەئابووریکردن لەبیرو وشەدا، ئەم حاڵەتەش لەوەدا بەدەردەکەوێت، کە وەسفی ڕیش تاشینی

ئـەم گەنجـە ناکـات، بـەڵکو ڕیشـەکە تاشـراوەو بـۆنی لێـداوەو دەبرژێتـەوە، واتـە وەسفێکی دووروردرێژی بەچەند وشەیەکی کەم دەربڕیوە.

**سێیەم : خودشەیدایی ( نەرگسییەت ):**

له بەشێکی دواتـری شـیعرەکەدا، گەنجەکـە لەوپـەڕی خودشـەیدایی و بـاوەڕ بەخۆبووندا دەبینرێت، هەروەکو دەڵێت:

**بەڕاستی تەواو گۆڕاوم و**
**بووم به " ئازاد" ێکی ترو**
**بەقەد"ڕۆك هدسن" قۆزم و**
**تۆش"جنیڤەر جۆنز"ی خۆمیت،**
**ئەوەتا وا**
**"کافی"یەکەم حەرفی ناوە جوانەکەشتم**
**خستۆتە ناو دڵێکەوەو**
**داومە لەیەخەی چاکەتم! ...** ل. ٧٧

نەرگسییەت یان خودشەیدایی بوونی کوڕەکە لەوەدایە کە زۆر سەیری ئاوێنە دەکات و زۆر ڕای لەخۆیەتی، هەڵبەتە narciss ناوی کوڕێکی ئەفسوناوی جوانە لە ناو ئاودا وێنەی دەموچاوی خـۆی دەبینێـت و شـەیدای خـۆی دەبێـت و خـۆی بـە ئاوەکەدا دەدات و دەخنکێت(٤٣)، دواتریش وەك زاراوەیەك بەواتای خـود شـەیدایی جێگیر بووە. لەدەقە شیعرییەکەدا گەنجەکە لەهەرەتی گەنجی دایـەو زۆر شـەیدای خۆیەتی، هەڵبەتە گـەنج جەسـتەیەکی تۆکمـەی هەیـەو نەخۆشـی کـەمتر زەفـەری پێدەبا، هەڵچوون و لایەنی سۆزداری هەمیشە لەناخیدا جـۆش دەخـوات، هەمیشـە گەنج خۆی لەشوێن پاڵـەوانی فیلمـەکان دادەنێـت و خـەیاڵ و زیندەخـەونی زۆرە، چـێژێکی زۆر لـەم خـەیاڵ و زینـدە خەونانـە وەردەگرێـت، هـەروەك لەبەشـەکانی دواتری شیعرەکەدا ئەو زیندەخەوانە دەگۆڕێن بۆ خەوو خـەیاڵی سێکسـی و زیـاتر هەڵوەستەیان لەسەر دەکەین.

**چوارەم : ڕاوە وێنەی ڕۆمانسییانە:**

دواترو لەبەشێکی تری دەقە شیعرییەکەدا، جۆرێك لەوێنەکاری بەدیدەکرێت، کەوا لەهۆڵێکدا چەند وەسفێکی یەکبەدوایەکی گەنجەکە بەدیدەکرێت:ـ

**وا ئەمجارەش قاچ لەسەر قاچ**
**لە هۆڵەکەدا دانیشتووم**
**قۆندرەی باتەی قاوەیی**
**پێش هاتنم بۆیاخکراو**
**گەردێ چییە پێوەی نییەو**
**لەسەر تاکی هەڵبڕاویان**
**کە لە چەرمی بە بریسکەی ورد ئەبمەوە،**
**نیوەی دەموچاوم دیارەو**
**ئاوێنەیە!**
**قژی ڕەش و پڕی چەند جار شانە شکێن،**
**هێشتا کزرەو بۆ پشتەوە داهاتووە،**
**" لەم ساتەدا تەپڵی سەرم**
**خوروویەکی زۆر نەگریسی تێئەکەوێ،**
**هەرچۆنێك بێ، خۆم ڕائەگرم ، نایخورێنم**
**بۆ ئەوەی قژم تێکنەچێ "! ...** ل. ٧٩

هەروەك لەمەوپێش سەرەتایەکمان لەبارەی ڕۆمانتیکەوە خستەبەرچاو، « وشەی رۆمانتیك کە لەسەدەی هەڤدەدا، لە ئینگلستان دەربارەی دەربڕینی شاعیرانە بەکاردەهات، لەساڵی ١٦٧٦دا هاتە فەرەنساوە. تا ماوەیەکی زۆر بەرانبەر بەخەیاڵئەنگێزو ئەفسانەیی بەکاردەبراو تا ساڵی ١٧٧٥ بەواتاکەی ئەمرۆی بەکارنەهاتووە. لەو کاتانەدا کلاسیکە شکست خواردووەکان بۆ گاڵتەکردن بەلایەنگرانی ڕۆمانتیزم ئەو زاراوەیان بەکاردێنا. لێ نووسەرانی تازەش ئەو زاراوەیان پەسند کردو بەوپەڕی شانازییەوە بەکاریان دەهێنا »(٤٤)، ئەوەی لەم کۆپلەیەی دەقەکەدا دەبینرێت، جۆرێك لە ڕۆمانسییەت پێکدەهێنێت، چونکە« ئەوەی رۆمانسییەکان وەك ڕێباز هێنایانە ئارا ئەوە بوو کە ڕاستییە

بیرییەکانیان نەدەکردە سەرچاوەی دەربڕینەکانیان، ئـەوان وایـان دەردەبـڕی کـە جـوانی ئاوێنـەی دەربڕینـی ئـەو ڕاسـتییەیە. ئـەم جوانییەشـیان لەهـەموو توێـژو بەشێکی کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا دەبینی. شیعر، لای ئەوان چەند ناسـکترو سـادەترو ئازادترو دڵبەندتر بووایـە هێنـدە زیـاتر دەچـووە دڵـەوە. شـیعری ڕۆمانسـی واتـاو مەبەستەکانی لەسنووره دیاریکراوەکانی ئەو سەردەمە دەربـازکرد. بڵاوتـرین بـوار لەهەڵبەستی ڕۆمانسیدا خۆشەویستی بوو))[٤٥]. ڕازیبـوونی ئـەم گەنجـە بـەجوانیی خـۆی و خۆڕێکخسـتن و بایـەخ بـەخۆدانی بـەنیازی بینینـی دەسـتگیران، پڕپـڕە لەحـەزی جـوانی و شـەیدابوون، وێنـە وەسـفکراوەکان مانایـان ڕوون و ئاشـکراو جوانە، کە وەسفێکی زۆر وردو سەرنجڕاکێشی پێشکەشکردووە، گەنجێك لەهـەموو ڕوویەکەوە لەجەستەی خۆی ڕازییە.

**پێنجەم : گەڕانەوە بۆ زەمەنی گەنجیی شاعیر( فلاش باك):**

فـلاش بـاك وەك هونـەرێك لـە ئەدەبـدا بـەکاردێت، بـەواتای گەڕانـەوە بـۆ زەمـەنێکی ڕابـردوو، بـەزۆری ئـەم هونـەرە لەچـیرۆك و ڕۆمانـدا بـەکاردێت، بـەڵام شـاعیر وەك هونـەرێك لـەم دەقـە شـیعرەدا بەرجەسـتەی کـردووە، بـەهۆی ئـەم هونـەرەوە لـەکاتی ئێسـتای ڕووداوەکانـەوە بـەرەو کـات و زەمـەنێکی ڕابـردوو دەگەڕێتەوە، هەروەکو دەڵێت:

**کراس تازە ئوتووکراو**
**بەحاڵ بۆنی دوای ئوتووەکەی هێشتا لێدیٚ**
**خەتی پانتۆڵ دەمی تیژەو بە شاقووڵی،**
**تا پشتی پیٚ، ڕێك ڕاوەستاو**
**درەلنگی لە خوارەوە پان و پۆڕەو**
**دوو ئەوەندەی سەرو پووز و لای ڕان ئەبیٚ،**
**چاکەتی قات، دوو قڵیشەو...** ل. ٧٩

لـەم چـەند دێـرەدا شـاعیر لەڕێگـەی فـلاش باکـەوە لـە زەمـەنی ئـەمڕۆی دەقەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ زەمەنێکی ڕابـردوو، کـە بریتییـە لەسـەردەمی گـەنجیی خۆی، وێنەی ئەو گەنجە دەکێشـێت کـەوا هێنـدە جـوان و بەشـەوق و ڕەونەقـەوە خۆی ڕێکخستووە، وەسفی جلوبەرگی دەکات، بەڵام لەجۆری ڕەنگدا تـەنها باسـی

ڕەنگی پێڵاو و پانتۆڵەکەی دەکات، نازانین چاکەتەکەی چ ڕەنگێکە بۆینباغی بەستووە یانا؟ قایشەکەی چ جۆرە ڕەنگێکە؟ شێرکۆ بێکەس لە گونجاندنی ڕەنگەکاندا زۆر گرنگی بە هەماهەنگی جلوبەرگەکانی خۆی نەدەدا، تەنها لە لەبەرکردنی کراسی سپی و هێلەگ و پانتۆڵی ڕەشدا جۆرە ڕێکخستنێکی جوانی هەبوو، هەرچەندە لەتەمەنی گەنجیدا بۆینباغی بەستووەو ڕێکپۆش بووە، بەڵام لەم دواییانەدا ئەوەندە گرنگی بەجلوبەرگ نەدەدا، کەواتە ئەوەی لەو دەقەدا دەبینرێت ڕوانینی شاعیرە لە گونجاندنی ڕەنگەکان لەگەڵ یەکتریدا، لەجۆری پانتۆڵەکەشدا وەسفی ئەو مۆدیلە دەکات کە لەسەردەمی خۆیدا باو بووە، پانتۆڵی شاڵستۆن، شاعیر بەفلاش باك گەڕاوەتەوە سەردەمی گەنجیی خۆی و باسی جۆری ستایل و جلوبەرگی ئەوکات دەکات لەوەسفی ماڵ و کۆڵان و ... کار لەسەر فلاشباك دەکات.

**شەشەم: دڵەڕاوکێ:**

خاسیەتێکی گرنگ لە خاسیەتەکانی مرۆڤی کامڵ بریتییە لە دڵەڕاوکێ و نیگەرانی، کەوا زۆرجار هەریەکەمان لەبڕیاردان لەژیانی ڕۆژانەماندا هەستی پێدەکەین و بەهۆی ئەم هەستەوە زۆرجار ناتوانین بەجارێك بڕیارێکی دیاریکراو بدەین، (( نیگەرانی بابەتێکی ترە لەو بابەتانەی کە بەڵگەن بۆ سەلماندنی بوونی مرۆڤ لەناو جیهاندا، نیگەرانی هۆکارێکی ئاشکرای نییە، لەوەدا لەترس جیادەبێتەوە، بۆ نموونە تاکێك لەگورگێك دەترسێت، بەڵام نیگەرانی و دوودڵی بابەتێکی دیاریکراویان نییە، بەشێك لەژیانی ڕۆژانەمان پێکدەهێنێت ))[٤٦]، ئەم هەستەش لەدێرەکانی دواتری دەقە شیعرەکەدا بەرچاو دەکەوێت، هەروەکو دەڵێت:

**هەندێ جاریش لەسەر کورسی چایخانەکان**
**چمکیان لە درزێ گیرئەبێ،**
**لە خۆمەوە**
**زوو زوو دەست ئەبەم بۆ ملم،**
**بێ ئەوەی شل بووبێتەوە،**
**بۆینباخ توند ئەکەمەوە!**

**هیچ نەبووەو لە خۆمەوە شڵەژاوم**
**پاكەتی درێژی"سۆمەر" لە گیرفانم دەرئەهێنم**
**"قیسارە" كەی لە ناو خەیاڵدا ئەژەنم،**
**لەو ساتەدا**
**– دەمم لەلای دەمی ئەوەو –**
**پێی نازانم جگەرەیەك**
**سەرەو قنگ دائەگیرسێنم،**
**تووتن ئەچێتە دەممەوەو**
**بە زمانمەوە ئەنووسیٚ و**
**ئەوسا سەرێك بائەدەم و**
**خۆشم بەخۆم پێئەكەنم!**
**لەسەر تەپڵەكی تەنیشتم**
**دەست ئەدەمە گۆڤارێك و ئەیكەمەوە،**
**"مارلین مۆرۆ"دەرئەكەویٚ**
**"با"یەك كراسە سپییەكەی،**
**بەرەو ژوور هەڵداوەتەوەو**
**ئەویش ئەیەویٚ بە دوو دەست**
**كراسی هەڵفڕیو بگریٚ،**
**گۆڤار لە چاوم نزیكتر ئەخەمەوە**
**بەشكو سەرووتر ببینم!**
**ئەوسا تفێك قووت ئەدەم و**
**لە جێی خۆی دائەنێمەوە! ...** ل. ٨٢

نیگەرانی و دڵەڕاوكیٚ لەوكاتەدا ڕوودەدات، كە ترسێك یەخەی مرۆڤ بگرێت، یان خەیاڵ و لێكدانەوەی زۆر بە زەیندا بێت، هەڵبەتە نیگەرانی و شڵەژانەكەی كەسی سەرەكی دەقە شیعرەكە لەوەدایە كە دەیەوێت زوو بگاتە لای دەستگیرانەكەی، شڵەژاوەو دەیەویٚ كات تێپەڕبێت تا بگاتە ساتی گەیشتن بە دەستگیرانەكەی، نیگەرانی و شڵەژانەكەی تێكەڵ بەدونیای سۆزو خەیاڵات بووە،

فـەزای هـەموو شـیعرەکە لـە فـلاش بـاکی شـاعیرەوە هـەڵقوڵاوە، هـەروەکو بـاس لەجۆرە پاکەتە جگەرەیەك دەکات کە هی زەمەنی گەنجیی خۆیەتی، ئـەوەتا هـەر بەخـەیاڵ و بیرکردنـەوە لـە دەسـتگیرانەکەی، وێنـەی ئـامێرە قیسـارەکەی نێـو پاکەتی جگەرەی سۆمەر پیشاندەدات و ئـەو پاکەتـە جگەرەیـە وا دەبینێـت کـەوا مۆسیقا دەژەنـێ، جگەرەکـە بەسـەراوبن لەسـەر لێوەکـانی دادەنێـت، دیسـان لـە دەستدانە گۆڤارێك وێنەی (مارلین مۆرۆ) دەبینێ و شەیدای دەبێ، هەڵبەتە ناوبراو هونەرمەنـدێکی بـەناوبانگی سـینەمای ئەمریکییـە، خـانمێکی زۆر جـوان بـووە، لەساڵی (١٩٥٤) مارلین مۆرۆ سەردانی کۆریای کرد لەبەر جـوانی شـوهرەتی کـاری سینەمایی بە هەزارەها گەنج پێشوازییان لێکرد.

**حەوتەم: دوور لە تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو:**

ئاشکرایە ئەمڕۆ تەکنـەلۆژیا سـەراپای ژیـانی مرۆڤـی داگیرکـردووە، زۆربـەی کارەکانی ڕۆژانەمان بـەئامێرو داهێنانـەکانی تەکنـەلۆژیا دەورە دراوە، بـەڵام لـەم دەقە شیعرەدا ژینگەیـەك پیشـاندەدرێت، کـەوا لەگشـت هۆکارەکـانی تەکنـەلۆژیا بێبەشـە، لـەو دیمەنانـەی دەرکـەوتووە هـیچ ئـامێرێکی تەکنـەلۆژی یـان هۆکـارو دەرئەنجامەکانی تەکنەلۆژیا بەدی ناکرێت، تەنها ئەوەندە نـەبێت، کـەوا ڕادیۆیـەك دەردەکەوێت وەك بەرهەمێکی تەکنەلۆژیا، ژینگەیەکی سادەی دوور لە تەکنەلۆژیا دەبینرێت، هەروەکو دەڵێت:

**لە ڕادیۆی ماڵێکی دووری گەڕەکەوە**
**لەسەر باسکەکانی هەوا**
**وەك هەورازو نشێو بکا،**
**جارێ بەرزو جارێ نزم**
**دەنگی سۆزی شەماڵ سائیب**
**" ئەرێ لەیلێ "**
**سەربانەو سەربان ڕێ ئەکاو**
**لەگەڵ حەزێکی فێنکدا**
**ئەگاتە گوێ،**
**لەملاشەوە**

**بۆنی ئاوڕشێنی نزیك**
**لەسەر گڵە سووری حەوشە،**
**تێکەڵ بە گۆرانی ئەبیٚ و**
**کونه لووتم**
**مشەمشی بۆنی خۆشی تیٚ ئەکەویٚ**
**لەم ساتەدا من دەنگ و بۆنی دڵداری**
**بەیەکەوە هەڵئەمژم!** ... ل. ٨٣

لەم چەند دێرەی دواییدا، شاعیر شۆڕبۆتەوە بۆ زەمەنی سالآنی شەست و حەفتاکان، ڕۆچۆتە نێو خەیاڵێکی ڕۆمانسییانە، لەوەسفی دەنگی ڕادیۆکەدا کە گوێی لەگۆرانی شەماڵ سائیب دەبێت و گۆرانییەکەش گۆرانییەکی عاشقانەیە، (ئەریٚ لەیلیٚ)، ئەوکات ژیان وەك ئێستا ئاڵۆز نەبووە، لە شەقامەکاندا دەنگی ئۆتۆمبیل و هاتوباتی خەڵك ئەوەندە زۆر نەبوو، ماڵەکانیش زۆری یەك نهۆم بوون، بۆیە دەنگەکە سەربانەو سەربان هاتووە، کوردەواریش دەڵێن: (دەنگی دەهۆڵ لەدوور خۆشە)، ئەم مۆسیقاو ئاوازە خۆشە چێژێکی ڕۆمانسییانەی ئارامیی پێبەخشیوە، ئەوەندەی تر دەیخاتە بارێکی سۆزداریی خۆش و بەجۆش، هەروەکو دواتر لەوەسفی ئاوڕشێنی گڵەسووری حەوشەش دیسانەوە دێتەوە ناو بۆنێکی سروشتی وەك بۆنی یەکەم بارانی پایز دڵڕفێن، لەڕێی هەستی بۆنکردن و بیستن و بەرکەوتن ئارەزووی سۆزداری و حەزی جوانی دەبزوێت و زیاترو زیاتر بیروهۆشی بۆ لای دەستگیرانەکەی دەچێت.

**هەشتەم: سۆزی عیشق:**

عیشق وەك دوا پلەی سۆزو خۆشەویستی بەشێکی گرنگ لەژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ پێکدەهێنێت، ئەم بابەتەش لەکۆنەوە خاڵی سەرەکی بنیاتی داستان و ئەفسانەو چیرۆکەکان بووە، ئەگەر گوزەرێك بەمێژووی ئەدەبی کوردیشدا بکەین، چەندین نموونەی بالآ دەدۆزینەوە کەوا بەدەوری عیشقدا دەسووڕێنەوە، تا ئەمرۆش گشت ژانرەکانی ئەدەب لەعیشق بێبەش نین، بەهەمان شێوەش عیشق خاڵێکی سەرەکییە کەوا لەم دەقە شیعرەدا بەرجەستەکراوە:

**لە پەنجەرەوە تیلماسکێ**
**لە هەتاوی گەنج هاتۆتە**
**باوەشمەوەو**
**لەبەر ئەودا، ڕەنگی شینی پانتۆڵەکەم**
**گەلێ جوانتر دەرئەکەوێ!**
**کە دەست ئەدەم لەناوچەوان و ڕوومەتم**
**گەرم گەرم**
**وا هەست ئەکەم**
**گڕی مۆمێ لەناو خوێنما بەهێواشی**
**دەسووتێت و**
**بەرە بەرە پلەی گەرمام سەرئەکەوێ!،**
**من ئێستاکە دڵم بەقەد دڵی سێوی**
**سەر لقی باخەکە خۆشە**
**ئەڵێی شەربەیەکی تازەم،**
**قاقام پڕەو پێکەنینم لێ ئەڕژێ!**
**حەزو ئارەزووم غوبابەو**
**کەڵەشێری ئەم تەمەنەم**
**وەخت و ناوەختی بۆ نییە و**
**هەر ئەخوێنێ ...** ل. ٨٥

یەکێك لەو خاڵانەی کەوا ڕۆمانتیك پێی دەناسرێتەوە، ئەوەیە «ڕۆمانتیکەکان هەست و سۆزیان لەسەرووی عەقڵەوە دەبینی و بەباشترو جوانترینیان دەزانی، هەروەها مەیلێکی زۆریان هەبوو بۆ دەربڕینی خەم و پەژارەو ماتەمین، کەدواتر ئەم خەم و پەژارە ماتەمینییە باڵیان کێشا بەسەر هەموو ئەدەبیاتی ڕۆمانسیدا و بووە یەکێك لەنیشانەکانی، تەنیایی و گۆشەگیری و ڕەشبینی خاسیەتی دیاری ڕۆمانتیکەکانن»(٤٧)، ئەو خاسیەتەی ڕۆمانتیك لەو کۆپلە شیعرەدا دەردەکەوێت، لەم وێنە خەیاڵییەدا بەرجەستە بووە، کەوا هەتاو بە هەتاوی گەنج ناودەبرێت، لەگەڵ ئەو تیشکە پانتۆڵە شینەکانی دەبریسکێنتەوە، پڕپڕە لەحەزو خولیاو گەرمدا هاتنی جەستە، لەوبارە سۆزدارییەو جوانە پیشاندەدرێت کە هەمیشە

کەڵەشێری تازەی تەمەنی گەنجی دەخوێنێت، لەو کاتەدا ڕوانینی ئەم گەنجە بۆ سروشت و دەوروبەری هەمیشە جوانی و خۆشی تێدا دەبینرێت، ئەوەتا تاڵە تیشکێك ڕۆشنایی پێدەبەخشێت، گڕی مۆمێ لەنێو خوێنیدا دەسووتێنێت، خەیاڵفراوانی شاعیر لەڕاوە وێنەی نوێدا بەدەردەکەوێت، کە دڵی گەنجەکە بەقەد سێوی سەرلق خۆشە، دیارە سێوی سەر لق بەشنەبا دەجووڵێتەوە جوانییەکی بێوێنە پیشاندەدات، وەها هەستدەکرێت سێوەکە بەکەیفەو سەما دەکات، کاتێ ئاو لە شەربەیەکی ئاو بەتاڵ دەکرێت جۆرە دەنگێکی هەیە کە بەقاقای پێکەنینی چواندووە، هەموو ئەم جوانییانەش خوێنی دڵی گەرمتر دادەهێنن و پڕپڕی دەکەن لەسۆزی عیشق و زیاتر بیروهۆشی بۆ لای دەستگیرانەکەی پەلکێشی دەکەن.

**نۆیەم: دیمەنی ماڵی دەستگیران:**

گەنجە دەستگیراندارەکە هەر لە هزر و خەیاڵەکانیدا بەردەوام دەبێت، بەخەیاڵ بەرەو ماڵی دەستگیرانەکەی دەڕوات :

**خێرا خێراش**
**ئەڵقەی پەنجە با ئەدەم و**
**قاچی سەر قاچ، ئەلەرزێنم**
**دایکیشت وا بەرامبەرمەو**
**لەسەر بەڕەی نەخش و نیگار**
**درشت و زەق،**
**بەڕەیەکی زیاد لە پێویست درێژکۆڵە،**
**بە چوار مەشقی دانیشتووەو**
**کراسێکی گوڵ باتمانی لەبەردایەو**
**قۆڵەکانی هەڵکردووەو**
**جلی شۆڕاو قەد ئەکات و**
**بە دەنگێکی تۆزێ بەرزیش**
**– وەك بۆ یەکێکی گوێگران قسە بکا –**
**باسی گوڵزاری کچێنی**
**خۆیم بۆ ئەگێڕتەوەو**
**چاویشی هەر لەسەر جلە**

**"بەسەزمانە وائەزانیٚ گوێم لێگرتووە ،**
**بەڵام نە سەرو نە دڵ و نە گوێچکەشم ،**
**لای ئەو نییە و**
**خەیاڵم هەر لەلای تۆیە"...** ل. ٨٦

خەیاڵێکی گەنجانە بەرەو ماڵی دەستگیرانی دەبات، بەڵام لەماڵی دەستگیراندا ئەوەندەی تر شڵەژاوە خەیاڵی هەر لای دەستگیرانەکەیەتی، خودی خۆی دەدوێنێت، شاعیر لەوەسفی ماڵی دەستگیراندا دیسان بۆ ئەو زەمەنە بەسەرچووەی گەنجیی خۆی دەگەڕێتەوە، کە هێشتا دانیشتن لەسەر بەڕەو ڕایەخ باو بووە، هەرچەندە دایکی کچە قسەی بۆ دەکات و قسەکانیشی بەتۆنێکی بەرز گۆ دەکات، کەچی ئەو دەیەویٚ لەو جیهانە پڕ ڕۆمانسییەت و خەیاڵە خۆشەی خۆی دانەبڕێت، تاکە هۆکاری ئەمیش بۆ ئەم ماڵە بینینی دەستگیرانەکەیەتی کە تەواو شەیدای بووەو تێکەڵ بەخوێن و ژیانی بووە. دەستگیرانەکەی تەواو خەیاڵ و ژیانی داگیرکردووە، ئیتر بڕوانێتە هەر شوێنێك لەگڕی عیشقی خۆی چێژ لە جوانییەکان وەردەگرێت، ئەمە سەرەتای چوونە نێو خەیاڵ و نزیکبوونەوەیە لەزیندەخەون، نایەوێت لەخەیاڵە خۆشەکانی خۆی دابڕێت و گویٚ لەدایکی دەستگیرانەکەی بگرێت، بەلایەوە گرنگ نییە ئەو چ دەڵێت، چونکە ئەو ئێستا لەماڵی دەستگیرانەکەیەتی، هەست بەترپەی لێدانی دڵی دەستگیرانەکەی دەکات، دەیەوێت بەچاوەکانی خۆی لەنزیکەوە بیبینێت، بەڵام جاریٚ بەر لەو بینینە هەر بیری لێدەکاتەوەو ناخی خۆی دەدوێنێت و دەیەوێت لەدەوروبەر دوور بکەوێتەوەو بچێتە نێو جیهانی تایبەتی خۆی.

هەر لەم چەند دێرەدا ئەوە بەدیدەکەین، کەوا لەوەسفی قسەکردنی دایکی کچەکەو گویٚ لێنەگرتنی گەنجەکەدا جۆرێك لەتەنزو بزەبەخشین هەیە، شاعیر وەسفێکی وردی هەیە لەوەسفکردنی شوێندا، هەروەکو لەپاڵ وەسفی ئەو شوێنەی کەماڵی دەستگیرانەکەیەتی ئەو وەسفە تەنزئامێزە تێکەڵ دەکات، وەك لەپێناسەکردنی شوێن لەئەدەبدا دەگوترێت: (( شوێن تەنها نەخشاندن و ڕازاندنەوەو چوارچێوەیەکی دەرەکی نابێت، بەڵکو دەبێتە توخمێکی کاریگەرو ڕەهەندو دەلالەتی زۆرتر ))(٤٨).

**دەیەم : وێنەی ڕۆمانسی :**

لەمەوپێش پێناسەو لێکدانەوەی پێویست بۆ ئەو ڕێبازە ئەدەبییە خرایەڕوو، کەوا بەڕۆمانسییەت ناسراوە، ئەو بابەتە دیسانەوە لە بەشێکی تری دەقە شیعرەکەدا دەردەکەوێتەوە، هەروەکو دەڵێت:

**تۆش لەو سەری ڕاڕەوێکی**
**نیوە ڕووناکی تەنکەوە،**
**پشت لە منی و چاوم لێیە**
**بە ڕۆبێکی پشتێن بەربووی سپییەوە**
**– ڕۆبەکە کەمێ سپیتر لە پا و پووز–**
**وا خەریکە دەسکی دەرگاکە بگریت و**
**بچیتە ناو حەمامەوە.**
**ئیتر ئەبێ وەکو کراسی داکەنراو**
**تا ئەو وەختەی تەواو ئەبێ، چاوەڕوان بم!**
**لەم ساتەدا**
**ئەبم بەگڵۆپی سفرو**
**کزۆڵەم و ئەڵێی خاولی بەجێماوم ...** ل. ٨٧

لەم چەند دێرەی سەرەوەدا دیمەنێکی ڕۆمانسییانەی ورد بەدیدەکرێت، وەك ئاشکرایە «ڕۆمانسیزم وەکو بزووتنەوەیەکی یاخی لەدژی دەسەڵات و یاسا تیۆرییە ڕووتەکانی سەدەی هەژدەم دەستی پێکرد، ئەم یاخیبوونە بەناوی ئازادیی تاکەوە کرا، بۆیە کۆت و یاساکانی کلاسیزم چەند توند بوو، چەند نووسەری پابەند دەکردو ئازادی بۆ تەسك دەکردنەوە، نووسەرانی ڕۆمانسیزم لێی ڕاپەڕین، هاتن خۆیان ئەوەندە ئازاد کرد، کە بەئارەزووی خۆیان، چۆن دەتوانن داهێنان بکەن، لەهیچ نەسڵەمینەوەو لەمەوە بوو نووسەرانی بەئازادی دەیاننووسی...»[(٤٩)]، لەم دەقەشدا ئەو ئازادییە دەردەکەوێت، بینینی پا و پووزی یارەکەی کە هێندە سپی و جوانن، یەکەم سەرنج و خاڵی ورووژاندنێکی سەرەتاییە، کە کسپەیەکی گەرم بەدڵی دادەهێنێت، لەشوێن خۆی کزۆڵە دەبێت و خۆی دەخواتەوە، چواندنی خۆی بەگڵۆپی سفر مانای کزۆڵەیی خۆی

نیشاندەدات، مانای وایە لە فەزایەکی ڕۆمانسییەتی شێوە نیوە تاریك، کە تەنها گەرمایی گلۆپەکە ناخی خۆیەتی، دەیەوێ شۆڕبێتەوە ناو فەزایەکی خەیاڵاوی و چێژبەخش، لەدایکی کچەو دەوروبەر دابڕێت و چێژ لەخەیاڵە جوانەکانی خۆی ببینێت و بیر لەو پا و پووزە جوانانە بکاتەوە.

**تەوەرەی دووەم : بەرەو ئیرۆتیك و گەیشتن بە ئۆرگازم:**

لەم تەوەرەی لێکۆڵینەوەکەماندا چەند دێڕێکی تری دەقە شیعرەکە شیدەکەینەوە، کەوا خەیاڵێکی ئیرۆتیکییانەی ڕوونی تێدا بەدیدەکرێت، لەڕێگەیەوە شاعیر بەرەو چەقی ئیرۆتیك هەنگاو دەنێت، «هەندێ جار حەزو ئارەزووە کپکراوەکانی نەست لەمیانەی خەوبینینەوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی هێماوە تێردەکرێن و دێنە بواری هەستی مرۆڤەوە. بە بڕوای فرۆیدو هاوبیرانی ئەمانەی سەرەوە بەڵگەی بوونی نەستی مرۆڤن»(٥٠)، نەستیش لە جیهانی خەون و زیندەخەونەوە بنەوان هەڵدەبەستێت بۆ تێرکردن و خستنە ڕووی حەزە چەپێندراوەکان، ڕوون و ئاشکراشە «مەسەلەی جینس لەوڵاتی ئێمەدا و لەزۆری وڵاتانی دیکە دوو لایەنی هەیە، لایەنێکی شەرعی کە نەریت و دابی ئایینی یا کۆمەڵایەتی ڕێگای داوەو ژن و پیاو پێکدەگەن و دەبێتە بەردی بناغەی دروستکردنی خێزان، جینس لەو کاتەدا دەبێتە جووتبوونێکی سەربەست لەنێوان دوو کەسی کامڵدا، لایەنەکەی دیکەیان بۆ ئەوەی جینس بکرێت، ئەوەیە کە پیاوی شەرواڵ پیس خۆی بگەیەنێتە ئافرەتی سۆزانی، بێگومان ئەمەش وەك گشت دیاردەکانی دیکەی ژیان هۆی تایبەتی و مەوزووعی هەیە ...»(٥١)، کەواتە لەناو زۆر لەنەتەوەکاندا، بەتایبەتی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، تەنها لەهاوسەرگیریدا پڕکردنەوەی غەریزەی سێکسی هەیە، ئەمەش بەهۆکارێك دادەنرێت بۆ نەوە خستنەوەو بەردەوامبوونی ژیان و بەدیهێنانی ئاسوودەیی و ئارامی بۆ هەردوو هاوسەرەکە، «سێکس لەژیاندا چ وەك کارەکەو چ وەك ئامانج شتێکی پیرۆزو پاکە، نکوڵی لەوە ناکرێ بەهۆی ئەوەوەیە وەچەو میراتی جۆری ئادەمی دەپارێزرێ و هۆیەکی هەرە گرنگ و پێویستە بۆ دڵنیایی دەروون و هێمنیی دڵ و ئارامگرتنی ویژدان، ئەمە لەکاتێکدا دروستدەبێ کەئەو چەشنی جینسە لەسەر بنچینەی ژن و مێردایەتییەکی دروست دابمەزرێ، دەنا کە بەبەرەڵایی و بێ یاسا

بوو لەبری هەموو ئەو چاکانە بەباری خراپیدا قلّپ دەبێتەوەو مرۆڤ تووشی سەرگەردانی دەکاو نرخی ڕاستەقینەی بزر دەبیّ ››[٥٢]، هەروەکو خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت ‹‹ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ››[٥٣]، لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەگوترێت: ‹‹ یەکێك لەنیشانەو بەڵگەکانی تری ئەوەیە کە هەر لەخۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوەو تێدەفکرن ››[٥٤]، هەروەها لە ئایەتێکی تردا هەر لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموویێت: ‹‹ وَ اللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ أَفَبِالْبَطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ››[٥٥]، لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەشدا هاتووە: ‹‹ خوا هەر لەخۆتان هاوسەری بۆ فەراهەم هێناون، هەر لەڕێگەی هاوسەرانتانەوە کوڕو کوڕەزای پێبەخشیون و لەهەموو رزق و رۆزییەکی چاك و پاك و بەسوود بەهرەوەری کردوون، لەگەڵ ئەو ڕاستییانەدا ئایا ئەوانە هەر بڕوا بەشتی پووچ و ناحەقی دەکەن و لەبەرامبەر نازو نیعمەتەکانی خواوە ئەوانە هەر ناشکورو سوپاس نەپەزێری و بیّ باوەڕ دەبن؟ ››[٥٦]، کەواتە هۆکاری بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیری بۆ ئاسوودەیی و نەوە خستنەوەو ئارامی بەخشینە بەمرۆڤ [٥٧]، هەر لەسەر ئەم بنەمایەش تەنها لەنێوان هەردوو هاوسەردا ڕێگە بەکرداری سێکس دراوە، بەڵام ئەگەر قسە لەسەر ئارەزووبزواندن بکرێت، ئەوا دەبینرێت کەوا بەشێوەیەکی گشتی‹‹ هێنانە خەیاڵی هرووژێنەر کەپەیوەندی بەکەسێکی دی لە توخمەکەی دیکەوە هەبێت یان پەیوەندی بەیەکتری بینین و هەستە نوێیەکانەوە هەبێت، لای زۆربەی پیاوان ورووژاندن دروستدەکەن، بەڵام لەکەمێك لەژناندا ئەم کارە دەکەن››[٥٨]، بەلای زۆربەی پیاوانەوە ‹‹ ئەندامەکانی جەستەی ژن، هەموویان شایانی ئەوەن، پیاو سەرنجیان لێبداو پێیانەوە سەرسامبیّ، بەڵام هەموو ئەندامەکان دیمەنێکی سێکسی وەك یەکیان نییە، بەڵکو هەندێکیان هەن ئەو دیمەنەیان زۆر بەزەقی و ڕوونی پێوە دیارە، بۆ نموونە: سمت و کەفەڵ، سینەو مەمك، پا و پووز.. پتر لەئەندامەکانی دیکەی جەستەی ژن، ئەو

خه‌سڵه‌ته‌یان پێوه دیاره»(٥٩)، ئه‌م سه‌رنج و بایه‌خدانه بۆ له‌ش و لاری ئافره‌ت له ئه‌ده‌بداو لای نووسه‌رو شاعیرانی پیاویش زۆر هه‌ر به‌م شێوه‌یه‌ش له‌ئه‌ده‌بدا ئیرۆتیك شوێنی خۆی ده‌کاته‌وه، چونکه« شتێکی زۆر سه‌یر نییه، گه‌ر هه‌موو مرۆڤێ، بۆ ئه‌ندامێکی دیاریکراوی جه‌سته‌ی ژن، به‌شێوه‌یه له‌شێوه‌کان، ئاره‌زووی سێکسی بجوولێ، دیاره هۆنه‌ریش وه‌کو مرۆڤ، هه‌رگیز له‌م یاسایه به‌ده‌رنه‌بووه‌و به‌ده‌ریش نییه» (٦٠)، هه‌رچه‌نده ئه‌و بابه‌ته‌ش که له‌ئه‌ده‌بدا ده‌رده‌که‌وێت، له‌هه‌موو ده‌قێکی ئه‌ده‌بیدا هاوشێوه نییه‌و جیاوازه، هه‌روه‌کو له‌م به‌شه‌داو له شیکردنه‌وه‌ی دێربه‌دێری ده‌قه شیعره‌که‌ی شێرکۆ بێکه‌سدا ئه‌و بابه‌ته ڕووونده‌که‌ینه‌وه، له‌م ته‌وه‌ره‌شدا هاوشێوه‌ی ته‌وه‌ره‌ی پێشوو، ده‌قه شیعره‌که ده‌که‌ین به‌چه‌ند پارچه‌یه‌که‌وه، که‌وا پارچه‌کان هه‌موویان یه‌کبه‌دوای یه‌ك ته‌واوکه‌ری پارچه‌کانی پێشوون، به‌هه‌موویان مه‌به‌ستی لێکۆڵینه‌وه‌که‌مان ته‌واو ده‌که‌ن:

**یازده‌هه‌م : به‌ره‌و ئیرۆتیك:**

له دێرو لاپه‌ڕه‌کانی پێشوودا ئه‌وه ڕوونکرایه‌وه، که‌وا سێکس هۆکارێکی سه‌ره‌کییه بۆ هاوسه‌رگیری و به‌رده‌وامیی ژیان، ئه‌و گه‌نجه‌ش که‌وا گه‌نجێکی خاوه‌ن ده‌ستگیرانه، و هه‌روه‌کو له‌چه‌ند دێره شیعره‌که‌ی پێشوودا سه‌ره‌تایه‌ك سه‌باره‌ت به‌ماڵی ده‌ستگیرانه‌که‌ی خرایه به‌رچاو، له‌م چه‌ند دێره شیعره‌ی داهاتووشدا، ئه‌وه ده‌بینرێت که‌وا گه‌نجه‌که به‌هه‌موو بیرو هۆشییه‌وه بیر له‌گه‌یشتن به له‌شولاری ده‌ستگیرانه‌که‌ی ده‌کاته‌وه، هه‌روه‌کو ده‌ڵێت:

**زه‌وقم گڕه‌و بۆشم نییه‌و قه‌ده‌غه‌یه**
**له‌گه‌ڵ تۆدا بچمه ژووری حه‌مامه‌وه،**
**له‌و دیوه‌وه تۆ سورگی ده‌رگات ڕاکێشاو**
**وا ئێستاکه**
**له مابێنی دره‌وشی چاوی دایکت و**
**چه‌ند ده‌رگایه‌کی پاسه‌وان،**
**چه‌ند دیوارێکی زاڵم و**
**خوشك و برای گزگڵ گزگڵ،**

**چاوزیت چاوزیت، سه‌رزل سه‌رزل،**
**ژماره پێنج، ژماره شه‌ش، ژماره حه‌وت،**
**كه‌لوپه‌ل و سانسۆری ماڵ،**
**هه‌ر هه‌موویان به ده‌سته دارینه‌كه‌یان،**
**به ده‌سته به‌ردینه‌كه‌یان،**
**هه‌ردوو چاویان توند توند گرتووم**
**ئه‌ڵێی ته‌لبه‌ندی دڕكاوین.**
**ڕێگه‌ی حه‌مامیان لێ به‌ستووم،**
**له حه‌مام دایت و ناتوانم بێمه ژووری.**
**قه‌ده‌غه‌یه من به‌ڕووتی تۆ ببینم! ...**                ل. ٨٩

له‌م به‌شه‌ی شیعره‌كه‌دا، گه‌نجه‌ی عاشق، له خه‌یاڵاتدا ده‌ژی، له‌و خه‌یاڵه‌یدا وایده‌بینێت، كه ده‌ستگیرانه‌كه‌ی ده‌چێته ناو حه‌مامه‌كه‌و ده‌رگاكه پێوه‌ده‌دات، ئه‌م خه‌یاڵه‌ش خاسیه‌تێكی تری ڕۆمانسییانه‌یه كه‌وا له‌م ده‌قه‌دا ده‌بینرێت، ((ئه‌گه‌ر نووسه‌رانی كلاسیزم بڕوایان به‌ئه‌قڵ هه‌بوو و كردبوویانه هۆكارێك بۆ گه‌یشتن به‌ڕاسته‌قینه‌كان، ڕۆمانسیزمه‌كان خه‌یاڵیان له‌شوێنی ئه‌قڵ داناو وایان دانا كه تاكه گه‌یێنه‌ره به‌ڕاسته‌قینه‌كان، له‌به‌رئه‌وه بوو، ده‌هاتن خه‌یاڵیان به فراوانی به‌كارده‌هێنا ))(٦١)، ئه‌م گه‌نجه‌ش ڕێگه‌ی ئه‌وه‌ی پێنادرێت هاوشانی ده‌ستگیرانه‌كه‌ی بچێته حه‌مامه‌وه، له‌به‌رئه‌وه‌ی جگه‌له‌وه‌ی دارو دیوارو ده‌رگاكان وه‌ك ته‌لبه‌ندی دڕكاوین و ڕێگرن، چاوه‌كانی دایك و خوشك و برای ده‌ستگیرانه‌كه‌شی وه‌ك سانسۆر به‌رامبه‌ری وه‌ستاون، بۆیه ته‌نها به‌خه‌یاڵ ده‌توانێت به‌و ئاره‌زووه‌ی دڵی بگات، هه‌روه‌كو فرۆید باس له‌وه ده‌كات كه‌سێ به‌حه‌زی سێكسی نه‌گات هه‌وڵده‌دات له‌ڕێی خه‌ون و خه‌یاڵه‌وه پێداویستییه سێكسییه‌كانی دابینبكات، پێشیوایه به‌شێكی زۆری خه‌ون ڕه‌نگدانه‌وه‌ی لایه‌نی چه‌پاندنی سێكسییه. له‌م ده‌قه‌شدا شاعیر وه‌ك تاكێكی ئه‌م كۆمه‌ڵگایه له‌م حه‌زه سێكسییه بێبه‌ش بووه، له‌به‌رهه‌مه‌كانیدا ڕه‌نگیداوه‌ته‌وه، هه‌ڵبه‌ته ((سێكس له‌كاری ئه‌ده‌بیدا ڕه‌نگدانه‌وه‌یه‌كی زۆری ده‌بێت، چونكه هه‌موو شته چه‌پێندراوه‌كان، هه‌رچه‌نده خه‌فه‌بكرێن، ناتوانرێت به‌ته‌واوه‌تی له‌ناو ببرێن، به‌ڵكو

لـەنێو خـەون و کـارە ئەدەبییەکانـدا ڕەنگدەدەنـەوە، چـونکە ڕەمـەکی جنسـی پەیوەندی بەلایەنی دەروونییەوە هەیە))(٦٢)، ئیتر ئەم گەنجە وروژاوە لەبـەربوونی ئەم هـەموو سانسـۆرە نـاتوانێ جووڵـە بکـات، ناچـار شـۆڕدەبێتەوە نێـو جیهـانی خەیاڵات و دەیەوێ لەوێوە بگات بەچێژ، دەیەوێت بەخەیاڵ بگـات بـەم کـەتوارەی کە قەدەغەیەو تەنها لەڕێی خەیاڵەوە دەتوانێت پێیبگات.

**دوانزدەهەم : مەنەلۆگ :**

لـەم بەشـەی شـیعرەکەدا هونەرکارییـەکی تـر دەبینرێـت، ئـەویش بریتییـە لەخۆدوانـدن یـان مەنـەلۆگ، (( مەنـەلۆگ دەربڕینـی دەنگێکـی نـاڕەزایی خـودە بەرامبەر بەهەموو کێشەو حەزە چەپێنراوەکان، ڕاسترین و واقیعیترین دەربڕینـە، ناتوانرێ بەئاشکراو پڕ بەدەم هاوار بکرێ و دەربـبڕدرێ. بۆیـە باشـترین ڕێگـە بـۆ ئەم دەربڕینانە مەنەلۆگە ))(٦٣)، گەنجەکە ناتوانێت ئـەو هەسـت و سـۆزەی لـەبیرو خەیاڵیـدا پەنگدەخواتـەوە، بەشـێوەی ئاشـکرا دەریببڕێـت، بۆیـە ناچـارە پشـت بەمەنەلۆگ ببەستێت، لەڕێگەیەوە ئەو هەستە دەردەخات، هەروەکو دەڵێت:

**من نازانم ئەمە ماڵە،**
**یان خانی کاروان سەرایە؟!**
**من نازانم ئاخر ئەم ماڵە جەنجاڵە،**
**کەی چۆڵ ئەبێ؟**
**ئەو ڕاڕەوەو، ئەو ژوورانەو، ئەو حەوشەیە،**
**لە سووچێکدا لە ژێر پلیکانەو دارێکدا،**
**لە گۆشەی سەر تەنوورێکدا**
**کەی دەست بازی و ماچێك و باوەشێکم**
**لای خۆیان بۆ ئەکەنەوە؟!**
**داڵدەی ئەم هەوەسە گەنجەم،**
**کەی پێ ئەدەن؟**
**من نازانم!**
**زەردە زیڕەو سەرە مێکوتەی منداڵان**
**چ وەخت ئەڕۆن؟! چ وەخت ئەنوون؟!**

**ئەم هەمو میوانە زۆرە،**
**کوللەو سوننە زەردو سوورە،**
**کەی دەست لە قرتەقرتی خواردنی**
**گوڵە بەرۆژە هەڵئەگرن؟! ماڵیان هەیە؟!**
**کەی هەڵئەستن؟! ئەڕۆنەوە؟!**
**ئاخر من کەیی و لە کوێوە**
**قومێ دوو قوم، لەو ناو دەمە بخۆمەوە؟! ...** ل. ٩٠

ئاشکرایە کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵات بەگشتی، کۆمەڵگای کوردەواریش وەك یەکێك لە کۆمەڵگاکانی ئەو ناوچەیە، هەر لەکۆنەوە کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی بوون، لەو کۆمەڵگایانەشدا پێویستییان بەوە هەبووە بەهەرەوەزی کاربکەن، بۆیە کۆمەڵ کۆمەڵ، یان لەماڵێکدا دە دوازدە کەس یان زیاتر پێکەوە ژیاون، واتە خێزانەکان خێزانی گەورە بوون، هەموویان پێکەوە ئیشوکارەکانی ڕۆژانەیان جێبەجێ کردووە، هەروەها لەکۆمەڵگای کشتوکاڵی و شوانکارەییدا مندالْ زۆر دەخەنەوە، ئەوەش بۆ ئاستی ڕۆشنبیرییان دەگەڕێتەوە، لەبەرئەوەی ئەوان دەستی کاریان گەرەکە، هەروەکو لەم خێزانەدا دەبینرێت، ئەو گەنجە داماوە کەوتۆتە ناو ماڵێکی وەها جەنجالْ و بەردەوام هاتوچۆو قەرەباڵغی بەبەرچاوییەوە دێت و دەچێت، ئەویش تامەزرۆی ئەوەیە پەناگەیەك بدۆزێتەوە، تا لەدەستگیرانەکەی نزیکبێتەوە، تا دەرفەتی ماچ و دەست لەملانێی هەبێت، وەك ئاشکرایە ((ماچ : وێستگەیەکی ناوەڕاستە لەنێوانی ڕۆمانسییەت و کۆنتاکی جەستەیی، بەڵام ماچکردن پرۆسەی بەرکەوتنی لێوەکانە بە شت یان تەنێکی تر. ماچ لەهەموو کولتوورە لێك جیاکاندا سیمبۆلە بۆ خۆشەویستی و ئیرۆتیك و سێکس. ئەو گوزارشتکردنە لەخۆشەویستی و ئیرۆتیك و سێکس بەماچ، تەنیا لای مرۆڤەکان سنووربەند ناکرێ، بگرە لای زۆر لەئاژەڵانیش هەڵگری هەمان چەمکە))[٦٤]، ماچ جگە لەوەی چێژ دەبەخشێت، لەکردەی سێکسیشدا خاڵێکی سەرەکی پێکدەهێنێت، بەشێوەیەك (( لەکاتی سێکسکردن لەگەلْ ئافرەتدا، پێویستە ماچ و کردارەکانی تری پێش سێکس، بەرێکوپێکی و یەکبەدوای یەك

ئەنجامبدرێن، بەشێوەیەکی گشتی ئەو ئەندامانەی لەش ماچ دەکرێن، ناوچەوان، چاوەکان، ڕوومەت، مل، سینگ، مەمك، لێوەکان، ناو دەم، هەروەها لای هەندێك لەنەتەوەکان نێوانی ڕانەکان و جومگەکانیش ماچ دەکرێن))[٦٥]، هەروەها لای عەرەبەکانی کەنداو لووت ماچکردن ڕەمزی سڵاوکردنە، کەچی لای ئەڵمان و فەرەنساییەکان گۆنا ماچکردن بەمانای سڵاوکردن دێت. تا ئێستا دەستنیشانی دووسەد جۆری ماچکردن کراوە، بەڵام بەرچاوترینیان بریتین لەماچکردنی سەر: ئەو جۆرە ماچە بەزۆری لەلایەن کەسێکی بەتەمەنەوە لەیەکێکی لەخۆی کەم تەمەنتر یا لەلایەن پیرەوە لەمنداڵ دەکرێ، کە سیمبولێکە بۆ بەخشندەیی و بەزەیی پیاهاتنەوەو خۆشەویستییێکی ناسێکسی، هەروەها ماچکردنی دەست: سیمبولە بۆ ڕێزگرتن، هەندێ جاریش وا ڕێك دەکەوێ لەچوارچێوەی خێزاندا (مێ) دەستی (نێر) ماچ بکات، بەڵام لەکردەی سێکسیدا ماچکردنی گۆنا یا ڕوومەت: ئەو جۆرە ماچە ڕەمزە بۆ سۆزو خۆشەویستی و سڵاوکردن، بێگومان لە کولتوورێك بۆ کولتوورێکی تر دەگۆڕدرێت، و جگە لەوەش ماچکردنی ئەندامەکانی تری لەش: وەك لێو، زمان، لامل، مەمك، ران، بن هەنگڵ، ناوك، سك. ... تاد، ڕەمزی ئیرۆتیك و سێکسن چ لە (مێ) وە لە (نێر) بکرێ، یاخۆ بەپێچەوانەوە[٦٦]، بەڵام ئەو گەنجە داماوە هەرچەندەی چاوەڕێ دەکات، ئەو کەسانە دەوری چۆڵناکەن، دانیشتوون و خەریکی گوڵەبەڕۆژە قرتاندنن، قرتاندنی گوڵەبەڕۆژە لەناو کوردەواری زۆر باوە، بەکۆمەڵ دادەنیشن و چەند کاتژمێرێك گوڵەبەڕۆژە دەقرتێنن، لەکۆمەڵگای پیشەسازیدا مرۆڤەکان پەرت و بڵاون تاك تاك و جووت جووت پێکەوە دەژین، تەنها لەکاتی کارکردندا دەبنەوە گرووپ، ئێستاش لەم سەردەمەی ئەمرۆماندا لەئەنجامی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا دەبینین وەك ساڵانی ١٩٧٠–١٩٨٠ سەدەی ڕابردوو نییە، کەوا دە دوازدە کەس پێکەوە لەیەك ماڵ بژین، بەڵکو جۆری کارکردنی تاکەکانی کۆمەڵگا گۆڕاوە، بۆیە ئەندامی خێزانیش کەمتر بوون و زووتر پەرت دەبنەوەو دوو دوو سێ سێ پێکەوە دەژین، بەڵام شاعیر گەڕاوەتەوە سەردەمی هەرزەکاریی خۆی و ئەو سەردەمە لەسەر زاری ئەو گەنجە دەستگێراندارە دەگێڕێتەوە.

**سێنزدەهەم : پەرێشانی:**

لەدێرەکانی دواتری شیعرەکەدا، ئەو هەر لە خەیاڵ و بیرکردنەوەیەداو لەترسی ئەوەی کە بەئارەزووەکانی دڵی نەگات و وەك هەموو جارەکانی تر بەدەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە، هەست بەدڵەڕاوکێ و پەرێشانییەکی زۆر دەکات:

**من نازانم هەموو جارێ لەم سەرەوە،**
**بە خەیاڵی چەند دەرفەتی ڕەنگاو ڕەنگی**
**دەست گوشین و مەم گوشین و ڕان گوشین و**
**ماچ و مووچەوە، خۆم ئەکەم بەم ماڵەداو**
**بەڵام لەوسەر درەنگانێ**
**کە هەڵئەستم، لۆژ لۆژ لەگەڵ**
**دوو دەستی زۆر نا ئومێدو**
**لچێکی شۆڕو باوەشێ**
**پڕ لە هەوەسی ڕووخاو و...کوژراودا**
**ئەگەڕێمەوە بۆ ماڵێ ! ...** ل. ٩١

هەروەك چۆن«پاڵەوان لە ئەدەبی ڕۆمانسیزمدا، کە زۆربەی جاران نووسەرەکە خۆیەتی، لەواقیع بێزارە، لەخەودا دەژیت، دەیەوێت شتی نموونەیی بێنێتە بوون، بەڵام بەتەواوەتی دەستەوەستانە لەوەدیهێنانی ئەو مەبەستەی، بۆیە هەڵوێستە پڕ لەهەڵچووەکانی پاڵەوانی ڕۆمانسی هەمیشە لەڕەشبینی و هەستە تووڕەکان و غەمی گەورەو دڵتەنگی و باری دەروونی نائارامەوە سەرچاوە دەگرن، ... بۆیە کاتێك تروسکاییەك لەواقیعەکەی نابینێتەوە تیایدا بحەسێتەوە، بەڕەشبینییەوە پەنا بۆ خەون، یان خۆ مەستکردن دێنێت، بۆ ئەوەی لەسای ئەمانەدا ئارامییەك بۆ دەروونە ماندوو، و شکستخواردووەکەی خۆی زامن بکات»[٦٧]، ئەویش دەیەوێت ئەو ئارەزووەی لەواقیعدا پێی ناگات بەخەیاڵ بەدەستی بهێنێت، ئەو خاڵەش خاڵێکی سەرەکییە لەبونیاتی زۆر دەقی ئەدەبیدا، «هەڵبەتە زۆربەی زۆری هۆنەران، لەهۆنراوەکانیاندا، بە چ ئەندامێکی جەستەی ژنانەوە سەرسامبووبن، پتر باسی ئەو ئەندامەیان کردووە، بۆ نموونە: کاتێ باسی مەمکی ژنیان کردووە، هەروا بەخۆڕایی نەبووە، بەڵکو زۆر ڕێی تێدەچێ، لەهەموو

ئەندامەکانی دیکەی جەستەی ژن، کاری لە هەست و هۆشیان کردبێ، بەهرەی داهێنانی هونەری و وێژەیی تەقاندبنەوە، لەرەی مەم هەژاندبنی، جوولاندبنی، جۆش و خرۆشێکی بێ وێنەی لا پەیداکردبن و ئارەزوویەکی بەهێزی سێکسی، لەناخیاندا چاندبێ، تا بەو شێوەیە، ڕاڤەیان لەسەرسامبوونی خۆیان کردبێ، تابلۆیەکی ڕەنگینی ڕیالیزمی، یان ئەندێشەیی مەمکیان کێشابێ))[٦٨]، هەربۆیە ئەویش هەموو هەستوسۆزی لەوەدا کۆبۆتەوە، کەوا ئەو دەرفەتە بەدەستبهێنێت دەست و مەمکی خۆشەویستەکەی بگوشێت، مەمك وەك یەکێك لەئەندامە سێکسییەکان ئەژمار دەکرێت، و لەبنەڕەتدا (( مەمك لەهەشت بەش پێك دێت کە ئەم بەشانەی خوارەوەن : ١. سینگ : بناغەی مەمك پێك دێنێت. ٢. ماسوولکەی سەرەکی سینگ. ٣. گرێی مەمك. ٤. سەری گۆپکە. ٥. گۆپکە. ٦. مەمەڕی شیر. ٧. دونگ = بەز. ٨. پێست.))[٦٩]، هەریەك لەم بەشانە گرنگی و بایەخی خۆیان هەیە لە چێژبەخشین بەهەردوو ڕەگەزەکە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بەشداری لە ئارەزووبزواندنی سێکسیدا دەکەن، بەهەمان شێوە لەم دەقە شیعرەدا، شاکەسی سەرەکی دەقەکە کە شێرکۆ بێکەس خۆیەتی، زۆر بەشەوقەوە ڕوو دەکاتە ماڵی دەستگیرانەکەی، پڕ لە ئومێدو هیوایە بۆ دەستگرتنێك و ڕوانینێك و گۆڕینەوەیەکی سۆزو خۆشەویستی، بەڵام دواتر بێهوودە دەبێت و لەگەڕانەوەیدا بەدەروونێکی شکاو بەرەو ماڵ دەبێتەوە، بێبەشبوونی ئەم گەنجە لەم حەزو خولیا جوانانەی خۆی بارێکی دەروونی خراپی بۆ دروستکردووە، خۆ کچەکەش هەمان حەزو خولیای هەیە بۆ کوڕەکە، بەڵام ئەوان لەنێو سنوورێکی قەدەغەو لەنێو چوار دیواری پڕ لەسانسۆردان، دیارە کە دەستگیرانیەتی و حەلاڵی یەکترن، بەڵام هەر ڕێگری زۆر هەیە لەبەردەم ئارەزووەکانیان، هەرچەند جارێك کە دەچێتە ماڵی دەستگیرانەکەی شەرمنانە دەچێتە ماڵەکە، حەزو خولیای لەوەندە زیاتر نییە کە بەخەیاڵ لەدەستگیرانی نزیك بێتەوەو لەمە زیاتر هیچ شتێکی تر ڕێگە پێدراو نییە، تەنانەت ناتوانێت لە تەنیشتیشی دابنیشێت و بەدڵی خۆی قسەی لەگەڵدا بکات، چ جای ئەوەی داوای لێبکات پێکەوە پیاسەیەك بکەن و بچنە پارکێك و ڕازی دڵیان بۆ یەکتری بەیان بکەن، هەڵبەتە شاعیر باس لەزەمەنێك دەکات کە هێشتا هۆکارەکانی

پەیوەندیکردنی وەك تەلەفۆن و مۆبایل و هۆکارەکانی تر بەم شێوەیەی ئەمڕۆ بڵاوبوونەتەوەو بەهۆی نەبوونی ئەو جۆرە پەیوەندییانە لەوپەڕی تامەزرۆییدایە بۆ گەیشتن بەدەستگیرانەکەی، ئارەزووی گەیشتن بەمەمکەکانیشی بەشێك لەم ئارەزووە پێکدەهێنێت، بەڵام دوای چاوەڕوانییەکی بێهوودە نە دەستی بەمەمك ڕادەگات و نە ماچ و گوشینەکانی تری پێدەبڕێت و بێئەنجام دەگەڕێتەوە.

**چواردەهەم: وروژانی سێکسی:**

حاڵەتی وروژاندنی سێکسی و خەیاڵکردن و نەگەیشتن بەئارەزووەکان لەچەند دێڕێکی تری شیعرەکەدا هەر بەردەوام دەبێت:

**من ئێستاکە لەم دیوەوە،**
**ئارەزوویەکی پڕحیلەو**
**شەهوەتێکی داگیرساوی پەل و پۆداری**
**بێ ئۆقرەم،**
**ماخۆلانێکی بێ دەنگم، لە گێژەنێکی قووڵ ئەچم،**
**کە لوول ئەخوا،**
**لە عەزرەتا هەر سمێڵ و لێو ئەجووم و**
**دەمێ هێواش... دەمێ خێرا،**
**بەناو هۆڵدا دێم و ئەچم،**
**وەك بەلووعەی ئاو لێ بڕاو،**
**قرخە قرخکەر،**
**یان پرتە پرتی چرایەك،**
**لەبەر خۆمەوە بۆڵەم دێ.**
**نەکەوتووم و نە خۆڵاوەی بووم و نەهیچ ،**
**کەچی زوو زوو بەهەردوو دەست،**
**بەرسینگی خۆم ئەتەکێنم ...** ل. ٩٣

لەم چەند دێرەدا گەنجەکە هەر لەخەیاڵکردندا دەژی، دەیەوێت لەدونیای دەوروبەر دابڕێت، وروژاوەو بەبێ ئاگا دێت و دەچێت و لێوەکان و سمێڵی خۆی دەگەزێت، هەر لەخۆوە جلەکانی خۆی دادەتەکێنێت بەبێ ئەوەی هیچ

پیسییەکیان پێوە بێت، ئەمە حاڵـەتی دڵـەڕاوکێ و پـەرێشـانی پیشـاندەدات، وەك ئــەوەی کەســێك لــەم حاڵەتانــەدا لچــی خــۆی دەکرۆژێــت یــان نینــۆکی خــۆی دەخوات...، ئیتر بواری نییە جووڵەی تر بکات لەشوێن خۆی تەنها هەرئەوەنـدەی لەدەسـت دێ وەك ( گـۆران) ی شـاعیر وتـەنی پێشکەشـی بکـا یـەك هەناسـە پـڕ لەپەرستن لە تاسە، هەناسەی پڕ لە حەزو ئارەزووی کپکراو هەڵدەمژێت.

**پانزدەهەم : خەیاڵی ئیرۆتیکی:**

مرۆڤ لەژیانی ڕۆژانـەی خۆیـدا زۆرجـار لەخەیاڵاتـدا دەژی، و بەشـێکیش لـەو خەیاڵانە سەبارەت بەسێکسە (( هەموو مرۆڤێك خـەیاڵی سێکسـی تایبـەت بـەخۆی هەیــەو کەســێتی مــرۆڤ لــەو خەیاڵــەدا ڕەنگدەداتــەوە، تەنانــەت بــڕی خەیاڵــە سێکسییەکان دیسانەوە ڕەنگدانەوەی کەسێتی ئەو کەسەیە لەڕووی سێکسییەوەو بەویستی خۆی))[٧٠]، ئەو ڕێژەیەش لەنێوان هەردوو ڕەگەزدا هاوشێوە نییە، بـەڵکو لەنێوان ژن و پیاویشدا جیاوازی دەربارەی خەیاڵە سێکسـییەکان هەیـە، و پیـاوان خەیاڵی سێکسییان لە ژنان زیاترە، و خەیاڵی سێکسیی ژن زیاتر بریتییە لـە ڕووی سۆزو ڕۆمانسییەت و لەم ڕووەوە لەپیاو بەهێزترە [٧١]، ئەو حاڵەتـەش لـەم چـەند دێرەی خوارەوەی شیعرەکەدا بەرچاو دەکەوێت:

**لە دوایشداو لە پڕێکدا،**
**لەبەردەمی وێنەیەکی هەڵواسراوتا**
**ڕائەوەستم، ڕائەمێنم ... ڕائەمێنم**
**وێنە چوارچێوەی لائەداو**
**وێنە هەموو جلەکانی پارچە پارچە دائەکەنێ و**
**وێنە هەنگاو هەڵئەهێنێ و**
**دێتە دەرێ و**
**تەنهاو تەنها،**
**بەیەك دەرپێی گوڵی چەسپی سوور باوەوە،**
**لەبەردەمما ڕائەوەستێ!**
**لەناکاوێ یەکیان دێتە هۆڵەکەوە،**
**منیش دووسێ جار ئەکۆکم،**

**تۆش جل لەبەر ئەکەیتەوە،**
**بە پەلە پەل ئەچیتەوە ناوچوارچێوە !...** ل. ٩٤

لە رووی هەستە سێکسییەکانەوە، ژن و پیاو جیاوازن، (( پیاو ئەو کاتە هەستە سێکسییەکانی دەورووژێن و چێژ وەردەگرێ کە ژن خۆی بۆ ئەم برازێنێتەوەو بەنازو خۆنواندن و بەلەنجەو لارو خۆ بەدەستەوە نەدان و خۆبواردن لەکردەی سێکس، تاسەی پیاو ببزوێنێ و لەداوی بخا ))[٧٢]، لێرەشدا ئەو گەنجە ناتوانێت ئەم هەموو سانسۆرانە ببەزێنێت و دەستی بەجەستەی دەستگیرانەکەی بگات، بۆیە سەرنجی بۆ وێنەیەکی کچە دەچێت، کەوا بە وێنەیەکی هەڵواسراو لە شیعرەکەدا ناوی هێنراوە، هەرچەندە بەلای ئێمەوە لەم زەمەنەدا کەوا زەمەنی دەقەکە پێکدەهێنێت، لە کۆمەڵگایەکی وەکو کۆمەڵگای ئێمەدا، کچی کورد نەیتوانیوە وێنەی خۆی لەماڵەوە هەڵبواسێت، بەڵام دەشێت شاعیر لێرەدا مەبەستی وێنەیەکی خەیاڵی بێت، و بەهۆی بیرکردنەوەی بەردەوامی لەدەستگیرانەکەی بەخەیاڵ وێنەی ئەوی لەبەرچاو بێت، بەهەرحاڵ ئەو وێنەیە سەرنجی رادەکێشێت، ناچارە بەسەرنجدان لەوێنەکەو لەرێگەی خەیاڵ و زیندە خەونەوە حەزو خولیاو ئارەزووەکانی دابمرکێنێتەوە، چونکە چەپێندراوەکان بەتەواوەتی سەرکوت ناکرێن، هەر مرۆڤێك هۆکاری راستەقینەو واقیعێك نەبوو بۆ تێرکردنی حەزەکانی ئەوا پەنا دەباتە بەر خەیاڵ، دەیەوێت لەرێگەی خەیاڵەوە حەزەکانی تێر بکات، خەیاڵ ئەو ساتەیە کە مرۆڤ دەخزێنێتە نێو دونیایەکی تر واقیعێك دروستدەکات لەپەردەی خەیاڵدایەو لەدەوروبەر دادەبرێت و بەشێك لەحەزەکانی پێ دابین دەکات، سیگمۆند فرۆید لەبارەی خەون و خەیاڵەوە دەڵێت: ((خەون گەیشتنە بەو شتانەی کە مرۆڤ لەژیانی رۆژانە پێیان ناگات))[٧٣]، هەرچەندە ئەو پێناسەیەی ئەو دەروونناسە ناشێت بەسەر هەموو خەونێکدا بسەپێنرێت، بەڵام بۆ ئەو خەون و خەیاڵەی لەم شیعرەدا دەبینرێت دەشێت پێناسەیەکی گونجاو بێت، چونکە ئەو گەنجە ئەوەی لە واقیعدا پێی ناگات دەیەوێت بەخەون و خەیاڵ بەدەستی بهێنێت، و هەرچەندە لەخەیاڵاتدا دەژی بەڵام لەناو خەیاڵیشدا ترسی هەیە، ئەوەتا دەکۆخێت بۆ ئەوەی کچەکە بچێتەوە نێو چوارچێوەی وێنەکە، هەڵبەتە مرۆڤ کە خەیاڵیش دەکات نایەوێت تەواو بچێتە

نێو وەهمەوە، بەڵکو دەیەوێت لەنێو خەیاڵدا واقیعێك بخوڵقێنێت، ئەویش لەناو ئەو خەیاڵەدا دەستگیرانەکەی بەجلی ژێرەوە دەبینێت و چاوەڕێی ئەوە دەکات ئەو چەند پارچە جلەشی دابنێت تا تەواوی جەستەی دەربکەوێت، لەو وێنەیەدا کچەکە تەنها دەرپێیەکەی (گوڵی چەسپی سوورباو) ی لەبەردایە، هەڵبەتە ڕەنگی سوور کار له چێژو ئارەزووی مرۆڤ دەکات، و کاتێك دەرپێی ئەم کچە گوڵداری سوور بووە، کەواتە کوڕەکە زیاتر وورووژاوە، چونکە ((ڕەنگی سوور بەگشتی هێمای ژیانە، هێمای هێزە، ڕەنگی خوێنە، ڕەنگی ئاگرە، ڕەنگی شەهوەت و دڵە، ... ڕەنگی چالاکی، جوانی، هێز، گەنجی، تەندروستی، ئیرۆسە ))[(٧٤)]، ئەو ڕەنگە لەژیانی ئاسایی مرۆڤدا، ((کاریگەری لەسەر هەستەکان دادەنێت، ئەگەر زۆر تەمەشای بکەین دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و ڕێژەی هەناسەدان زیاد دەکات ))[(٧٥)]، کەواتە ڕەنگی سوور وورووژاندنی سێکسی بەگوڕتر دەکات، واتە شاعیر لەهەڵبژاردنی ڕەنگی سوور بۆ جلوبەرگی ژێرەوەی کچەکە مەبەستێکی ئیرۆتیکی هەبووە، و هەڵبژاردنەکەی لەجێگەی خۆی بووە.

**شازدەهەم : وورووژاندن :**

لەم بەشەی دەقە شیعرییەکەدا وورووژاندنی سێکسی زیاتر لای گەنجەکە بەدیدەکرێت، ئەویش لەچەند خاڵێکدا دەردەکەوێت :

**حیله زۆرم بۆ ئەهێنێ**
**یاڵ ڕەپ ئەبێ،**
**گڕی شەهوەت، بڵێسەیەکی ئاگرەو**
**تێم بەرئەبێ !**
**ئەوسا ئیتر**
**چاوەکانم ئەنووقێنم،**
**له پەنجەرەی خەیاڵێکی سوور باوەوە،**
**بەبێ خشپە، وەك بڵێسەیەکی بێدەنگ و**
**یا سکڵێکی زۆر گەشاوە،**
**بەدەرپێیەکی ڕەشەوە،**
**دێمە ژووری حەمامەوە ...** ل. ٩٥

لەدێری یەکەمدا ئاماژە بەهەستان و ڕەپبوون دەکرێت، ئـەویش ئاماژەیـەکی ئاشکرایە بۆ ئەوپەڕی ورووژاندن لەڕەگەزی نێردا، لەحاڵەتی وورووژاندنی سێکسـیدا چـەند پەرچـەکردارێك لەجەسـتەی مرۆڤـدا بەدیـدەکرێت، بەشـێوەیەکی گشـتی سووڕی سێکس Sexual cycle لەسەرەتاوە تا کۆتایی دەتوانرێت بکرێت بەچوار قۆناغی سەرەکییەوە، لەهەریەك لەم قۆناغانەدا کۆمەڵێك هۆرمۆن ڕۆڵـی سـەرەکی دەبینن، یەکەم قۆناغ بریتییە لەسەرهەڵدانی ئارەزووی سێکسی libido or sexual desire [٧٦]، بـەڵام ئەگـەر بـاس لەجەسـتەی پیـاو بکـەین، دەردەکـەوێت کـەوا ((لەپیاودا لـەقۆناغی هرووژانـدنی سێکسـیدا، هروژمـی خـوێن بـۆ نـاو ئەندامـەکانی زاوزێ زیـاد دەکـەن و گەڕانەوەشـی لەهـەمان کاتـدا کـارێکی گرانـە، بـەهۆی تەسکبوونەوەو پەستاوتنی خوێن هێنەرەکانەوە، بەمجۆرە بەخێرایی چوك گـەورە دەبێـت و دەگاتـە سـێ ئەوەنـدەی قەبارەکـەی خـۆی لـەکاتی سیسـبوونیدا، ڕەق دەبێت و درێژییەکەشی بە بڕی ٧–٨ سم زیاد دەکات و جێگەی خۆشی دەگۆڕێـت و ڕوودەکاتە سەرەوە نزیك دیواری سك، (هـەر لەمەشـەوە نـاوی کردارەکـە نـراوە هەسـتان Erigere )و بـەڕوودانی هەسـتان یـا ڕەپبـوون ئـیتر پیاوەکـە ئامـادەی جووتبوونـە، واتـە داخڵکردنـی ئەنـدامی سێکسـی (چـووك) بـۆ نـاو زێ، لەگـەڵ ڕوودانی ڕەپبوونەکەشدا ئارەزووی کارەکەو خۆ ڕزگارکردن لەو شڵەژانە سێکسییە زۆر دەبێـت))[٧٧]، ئـەویش لەخەیاڵەکەیـدا وایـدەبێت کـەوا بەدەرپێیـەکی ڕەشـەوە بـەرەو نـاو حەمامەکـە دەچـێت، بـۆ گەیشـتن بەجەسـتەی دەسـتگیرانەکەی، هەڵبژاردنی ڕەنگی ڕەش بۆ ئەو جلانە مەبەستی خۆی هەیە، چونکە ڕەنگـی ڕەش ڕەنگـی هێـزە، ڕەنگـی هـەوری باراناوییـە کـەوا هۆکـاری بووژاندنـەوەی زەوییـە، بۆچوونێك هەیە پێیوایە ڕەنگی ڕەشی شەو بنچینەی هەموو خوڵقێنراوەکانـە، کـە بەڤینۆس ناویدەبەین، ئەو ڕەشە لەناو جەرگەی گەردووندا لەگەڵ ڕەنگـی سـووری ئاگرو خوێندا تێکەڵ دەبێت و ڕەمزی هێزو ژیان پێکدەهێنێت، هەر بۆیە لە هەموو جیهاندا لەزۆر کاری هونەریدا ڕەنگی سوورو ڕەش پێکەوە تێکەڵدەکرێن [٧٨].

**حەڤدە : لەزەتی زیندە خەون:**

لەم چەند دێرە شیعرەی دواتردا، هەوڵدان بۆ تێرکردنـی حـەزو ئارەزووەکـان لەڕێگـەی خـەیاڵ و زیندەخـەوەوە بـەردەوام دەبێـت، بێگومـان هـەر کاتێـك مـرۆڤ

ئـەوەی لا دروسـت بـوو لـەژیانی واقیعـدا ناتوانێـت ئارەزووەکـانی بهێنێتـە دی، بەناچاری پەنا بۆ زیندەخەون و خەیاڵی خۆش دەبات و هەوڵدەدات لەڕێگەیانـەوە حەزو ئارەزووە تێـر نـەکراوەکانی ژیـانی واقیعـی تێـر بکـات، لەلایـەکی تریشـەوە ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە خەو و خەیاڵ زۆر ئاسانترو بێ کێشەترە[٧٩]، خەسڵەتە تایبەتییـەکانی زیندەخـەون ئەمانـەن یەکـەم: لەهـەواری زینـدە خەونـدا خـەوبین هەمیشە مەیلی گۆشەگیری و تـەنیایی و دوورە پـەرێزی هەیـەو لـە دەنگـەدەنگ و ئاپۆڕەی خەڵك دوور دەکەوێتەوە، ئەم جۆرە ژینگەکەی هـێمن و کـپ و خامۆشـی پێویستە، ... دووەم : لەم دیاردەیـەدا پرۆسـەی خـەوتن و خـەوبینین ڕاسـتەقینە لەمانا زانستییەکەی قۆناغ بە قۆناغ ڕوونادات، کەواتـە گۆڕانکارییـە سـایکۆلۆژی و فسیۆلۆژییەکانی پرۆسەی خـەوبینین لـەدڵ و دەروون و جەسـتەدا ڕوونـادەن [٨٠]، کەواتە (( زیندەخەون لە هەموو قۆناغێکی ژیاندا هەیە، بەڵام زیاتر لەقۆناغی منداڵی و هەرزەکاریـدا بـاوە ))[٨١]، لـەم قۆناغـەدا مـرۆڤ خـەیاڵی زۆر بـەربڵاوەو مەسـەلە سێکسییەکانیش تەواوی ژیـانی لاوان کـۆنترۆڵ دەکـەن، کوڕەکـە بەخـەیاڵی خـۆی تەنها دەرپێیەکی ڕەشی لەبەربووەو دەچێتە نێو حەمامەوە، هەروەکو لەمـەوپێش ڕوونکرایـەوە، سـایکۆی ڕەنگـی ڕەش ئەوەیـە کـە توانـای داگیرکردنـی هەسـتی بەرامبـەری هەیـە[٨٢]، ئـەمیش بـەم دەرپـێ ڕەشـەوە دەیـەوێ هەسـتی دەستگیرانەکەی ڕابکێشێ و ئازایەتی خۆی بنوێنێت :

**ئێستا بە تەنها چاوی خواو**
**چاوەکانم وا بەڕووتی، ڕووت و قووتیی**
**لە حەمامدا تۆ ئەبینن؟!**
**بەژنێکی بەرز، ئەڵێی نووری سپی و تەڕە،**
**ئەوەتا وا بە پێوەیەو سەرتاپاشی**
**هاڵاوێکی زۆر تەنکی ئەفسووناوی لێهەڵئەستێ،**
**پرچی زەردی نووساوە بەشان و ملییەوە،**
**خاڵی پەپوولەیی سەر سنگ،**
**کەفێك بووە بەدەوەنی و**
**باڵی جووتەو وەك حەزبکا هەر لەوێ بێ و**
**ئیتر نەفڕێ!**

لەپاش تۆزێ،
هەردوو باسکە نەرم و نۆڵ و سپیەکانی
بۆلای سەری بچکۆلانەی هەڵئەبڕێت و
بەهێواشی...زۆر هێواشی،
هەردوو مەمی گوڵ بەدەمی،
قنج و قوتی خۆی ئەگلۆفێ
لەو ساتەداو لەتاواندا، دەستەکانم
واخەریکن شێت ئەبن و
پەنجەکانم واخەریکن یاخی ببن و
لە عەزرەتا هەردوو مەچەك جێبێڵن و
بەرەو بناری مەم بفڕن!
ئای خودایە، چی نابینم؟!
لەناکاوێ جامە ئاوێ،
بەسێ چوار جار تۆپەڵە کەفی سەر مەمك،
سەر کەفەڵ و سەر ناوك و سەر بانەگا،
بەرەو بەرپێ ڕائەماڵن.
ئیتر هەرچی هێڵی سنگ و ڕان و
قەوسی سمت و خەت و خاڵی قۆڵ و باسك و
تووکە بەری نەرم و نۆڵی، تۆزێ لوولی بەبریسکەی
دەوروبەری سێگۆشەکەی کانی حەیاتی نێوانی
شلەی ڕانی، ڕوون ئەبنەوەو دەرئەکەون!
سێگۆشەیەك سەربەرەو خوار،
سێگۆشەیەکی ئەزەلی،
تەلیسمێکی بەرجەستەی خوا.
سێگۆشەیەك هەرچی گۆشەی جوانی "بوون"ە
لە درزێکی ناوەڕاستا جێی بۆتەوەو
لەوێشەوە ئەم ژیانە،
هەڵدەقوڵێت و هەڵدەقوڵێ
سێگۆشەیەك سەربەرەو خوار،

**کە بە ڕووتی تەماشای پیاو کەوتە ناوی**
**ئیتر بینین گڕئەگرێت و ئەسووتێت و**
**لەدوای سووتان، خۆڵەمێشی ژیلەمۆیەك**
**لەناو لەشیا بەجیٚ دیٚڵیٚ!**
**من ئێستاکە...گۆشتی ئاگر،**
**ستوونەکەی ناوەڕاست و خوار ناوکم،**
**ڕاست بۆتەوەو سوور بۆتەوەو**
**دەرپێی کردووە بە چادر!**
**تەقەی جام و خوڕەخوڕی ئاو لەولاوە، ... ل. ٩٧**

لـە سـەرەتای ئـەو بەشـەی شـیعرەکەدا دوای ئـەوەی وەسـفی جەسـتەی دەستگیرانەکەی دەکات، لەبەرخۆیەوە دەڵیٚ تەنها چاوەکانی من و خودا بـەڕووتی ئەم ئافرەتە لەنێو حەمامدا دەبینن، دەیەویٚ زۆر دڵنیا بێت کە دونیای دەوروبەری کشوماتە، تەنها خۆی بە ڕووتی ئەو دەیبینێت، بینینی ئافرەتێکی جوان بـەڕووتی و بەم ئەندازە جوانە، پڕاوپڕ دەبێت لەحەزو خولیاو وروژاندن، بـەڵام زیـاتر نزیـك نابێتەوە، لەترسی سانسۆر، ترسی ئەندامانی خێزانەکە، ترسی کچەکە کـە ڕەنگـە ئەو ڕەفتارانە قبولٚ نەکات، هەرچـەندە ئـەم بەخـەیالٚ وای نیشـانداوە کـە ماڵەکـە چۆڵە، چونکە هەر لەو کاتـەدا کـە دایکـی کچـەکە قسـەی بـۆ دەکـات، ئـەم گـوێی بەقسەکان نەداوەو کەوتۆتە جیهانی خۆیەوە، چـونکە زیندەخـەون ئـەو حاڵەتەیـە کە تاك خـۆی لەدەوروبـەری خـۆی دادەبڕێـت و نـاخی خـۆی دەخواتـەوەو بـەرەو قووڵایی هەست و ناخی خۆی شۆڕ دەبێتەوە، ئەوەتا لەم زیندەخـەوەدا دەیـەوێت بگات بەلەزەتی جەستەی دەستگیرانەکەی. لـەوێوە وەسـفی ئەنـدامێکی سێکسـی ئافرەت دەکرێت، ئەو بەشەی کەوا بەسێگۆشەی جوانی ژیان و بوون ناوبراوە، ئەو وێنەیەك بریتییە لەئەندامی سێکسی ئافرەت، ئەو ئەندامەی لەشی ئافرەت لەچەند بەشێك پێکدێت،《 بەکۆی ئەندامە دەرەکییەکانی زاوزیٚ، واتە ئەوانەی دیارن پێیان دەوترێـت دۆڵان (ئەنـدامی مـیٚ). دۆڵان لەپێشـەوە سـەرینێکی گۆشـتنی کـەمێك هەڵئاوساو بەری گرتووەو لەخانەی چەوری پێکهـاتووە. دۆڵان لەپێشـەوە بەچـەند ماسوولکەیەك کۆتایی دێت کە لـە کـۆم جیـای دەکەنـەوە، واتـە پێیـان دەوترێـت

نێوانــه ماســوولکه یــا (عــەجان). ئــەو ماســوولکانه واتــه عــەجان ئــەو ئەندامانــه ڕادەگرێت که کەوتوونەته ژێـر سـکەوه ))(٨٣)، ئەمـە ئـەم بەشـەیه کـەوا لەشـێوەی سێگۆشەیەکی سەر بەرەو خواردا دەبینرێت، خاڵی سـەرەکی لـەکردەی سێکسـیدا پێکدەهێنێت، ئەویش لـەجۆرێك ماسوولکه پێکدێت، لـه لەشـی مرۆڤـدا دوو جـۆر ماسوولکه هەیە، ماسوولکەی خۆویست و ماسـوولکەی خۆنەویسـت، ماسـوولکەی خۆویست لەژێر کۆنترۆڵی مرۆڤدایە، وەك ماسـوولکەکانی دەسـت و قـاچ و مـل...، بەڵام ماسوولکه خۆنەویستەکان لەژێر کۆنترۆڵی مرۆڤـدا نـین، وەك ماسـوولکەکانی گەدەو دڵ، ماسوولکەی ئەندامەکانی نێرینه یان مێینه ڕاسته لەژێر ویستی مرۆڤـدا نییە، هەرچەندە مرۆڤ که مەیلی سێکسی بزواو بـیری لێکـردەوە ئـەم ماسـوولکەیە ئامادە بێت، بەڵام خۆ وەك ماسوولکەی دەست نییە، بـەئارەزووی خـۆی لەهـەموو ئانوسـاتێکدا بیـەوێ بجوولێتـەوە، ئـەو گەنجـەش کـە لـەم حاڵەتـەدا دەژی و بـێ ویسـتی خـۆی ماسـوولکەی ئەنـدامی نێرینـەی کەوتۆتـە حاڵـەتێك کـە ڕەپبـوونی دروسـتکردووە، هــەروەکو لەشــیعرەکەدا لــەم دەربڕینــەدا بەدیــدەکرێت کــەوا بەستوونێکی خوار ناوك ناویدەبات کەوا هەڵساوە، بەهۆی ئەم حاڵەتەوە دەیەوێت تەواو شۆڕبێتەوە بۆ جیهانی خۆی، پەنا دەباتە بەر داخستنی چـاوەکانی، یـاخود ڕوانینی بەشێوەیەکی وا که لەشوێنێکدا چاوەکانی دەچەقێنی که تەواو چاوەکانی لەبینین دەکەون و ناخی خۆی دەدوێنێت، مەنەلۆگێك لەگەڵ خـۆی سـاز دەکـات و کۆمەڵێك پرسیار دەردەبڕێت و بەسەرسوڕمانەوە لەبەرخۆیەوە ئاخ هەڵدەکێشێت، هەڵبەتــه هــەروەك ئامـاژەمــان پێکــرد، خۆدوانــدن یــان ((مەنــەلۆگ قســە لەگــەڵ خۆکردنە لەناخەوە، واتە: بێـدەنگ تـەنها لـەنێو زەینـدا))(٨٤)، ئەمجارەشـیان هـەر بەهۆی بوونی ئەم هەموو سانسۆرە، هەست بەشکست و ڕووخانی دەروونـی خـۆی دەکــات، دیســان لــەڕێی هەســتە پــەنگخواردووەکانی خەمــە زۆرەکــانی خــۆی دەردەبڕێت، که لـە زۆر شـوێندا هەسـت بـەم دەنگـە کپـەو ئـەم جـۆرە مەنەلۆگـە دەروونییــە دەکرێــت، و ئاواتــەخوازە کــە سانســۆر لــەو ماڵــە نــەمێنێت و لەگــەڵ یارەکــەی بچــێتە حەمامــەوە...، لەوەســفی حەمامەکەشــدا دەردەکــەوێت کــەوا حەمامێکی کۆنە کە تێیـدا جـام بـەکاردەهێنێت، دەرگـاش ئاسـنەو گرمـەی دێـت، دواتر دەستگیرانەکەی بەڕازاوەترین شێوە دێتە دەرەوە، بەڵام ئـەو لەخەیاڵەکـەی

ڕادەپەڕێت و دەبینێت ماڵەکە هێشتا هەر هەمووی سانسۆرەو ڕێگەی جووڵەکردنی پێنادرێت، وەك ڕۆژانی تر کە بەدەستی خاڵی گەڕاوەتە ماڵەوە.

**هەژدەهەم : ترۆپکی ورووژاندن:**

وەك ئاشکرایە ورووژاندن و ئارەزووەکانی سێکس لەسەرەتاوە تا کۆتایی بەیەك ئاست ڕەت نابن، بەڵکو لەچەند ئاست و قۆناغێك پێکدێت، و دوای قۆناغی سەرەتا کە قۆناغی ورووژاندنی سەرەتاییە، قۆناغی دووەم دەستپێدەکات، ئەو قۆناغە (( ئەو گۆڕانکارییە دەگرێتەوە کەوا ڕوودەدەن. لەئەندامەکانی زاوزێی نێرو مێ ئەوانیش: ڕەپبوونی ئەندامی زاوزێ لەنێردا errection و گەورە بوون و دەردانی ماددەیەکی لینج لە ئەندامی زاوزێی مێدا ))(٨٥)، ئەو قۆناغەش لەورووژاندن لەچەند دێرێکی تری شیعرەکەدا بەرچاو دەکەوێت:

**لە خوار ژووری ناوکەوە،**
**چەپۆکانی ئەسپێکی زۆر چەمووش و هار،**
**سمکۆڵانی گلاراوی،**
**چەخماخەدار،**
**هەتاکو بێ هەر زیاد ئەکا،**
**وا ئێستاکە حیلەی ئەسپم**
**کوڕژنەکەی تەواو بەرزەو**
**سەری ڕەپی بەحەواوەو**
**خەریکیشە پشتی سەری**
**بدا لەبەرایی سکم!** ... ل. ١٠٠

لووتکەو ترۆپکی ورووژاندن دەبێتە هۆی ڕەپبوونی ئەندامی نێرینەی کوڕەکە، هەروەکو لەمەوپێش ئەم حاڵەتە ڕوونکرایەوە، دەتوانرێت بگوترێت: ((فسیۆلۆژی ڕەپبوون errection بریتییە لەیەکەم گۆڕان کە ڕوودەدات لەئەنجامی ورووژاندنی سێکسییەوە، پلەی ڕەپبوون ڕاستەوانە دەگۆڕێت لەگەڵ پلەی بزواندن، جا ئایا ئەوە بزواندنێکی ڕاستەقینەی چووك بێت یان تەنها ورووژاندنێکی لایەنی دەروونی بێت وەك بیرکردنەوە لەسێکس. هەستە سێکسییەکان بەهۆی دەمارەکانەوە دەگەنە سەنتەرەکەی خۆیان لەدرکە پەتك کە ئەمەش

وەلامدەدرێتەوە بەدەمار دەگوازرێنەوە بۆ ئەندامی زاوزێ، دەبێتە هۆی زیادبوون و کشانی نیوەتیری خوێنبەرەکان بۆیە خوێن لەشانەکانی چووکدا کۆدەبێتەوە لەژێر پەستانێکی زۆردا، شانەکانی چووك پێکهاتووە لەبۆشایی زۆر گەورە کە لەکاتی ئاساییدا خاڵین، بەڵام کە دەکشێن خوێنێکی زۆر لەخۆ دەگرن بۆیە ڕەق و درێژ دەبن »(٨٦)، ئەندامی کوڕەکە ڕەپ بووە، ڕەپبوونێکی باش وەك ئاماژەی پێکردووە کەوا شێوەی چادرێکی دروستکردووە، چونکە« جۆری وریاکەرەوەی سێکسی و بڕەکەی کە پێویستن بۆ ڕوودانی ڕەپبوون لە پیاوێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆڕێن، هەروەها بەپێی تەمەنیش جیاوازن، بە زۆری هەرزەکارو لاوان بەدەست کێشەکانی ڕەپبوونەوە نانالێنن، بە وریاکەرەوەیەکی ساکار یا بەبێ وریاکەرەوەش ڕەپبوون تیایاندا ڕوودەدات بۆ نموونە لاوێکی تەندروست باش لەتەمەنی ١٨ ساڵیدا لەوانەیە تەنها لەڕێگای خەیاڵکردنەوە یا وریاکەرەوە سێکسییەکانی دیکەی نابەرکەوتنەوە ڕەپبوونی تیادا ڕووبدات »(٨٧)، ئەویش لەهەڕەتی گەنجیدایە، بۆیە وەك لەشیعرەکەدا دەریدەخات، ئەندامەکەی وەك ئەسپێك بەرز دەبێتەوە، واتە زۆر بەباشی ڕەپ بووە، هەر لەدرێژەی ئەم دێرە شیعرانەدا کە لەسەرەوە ڕیزکراون، قۆناغێکی سێکسیی تر بەرچاودەکەوێت، ئەویش قۆناغی سێیەمە، ئەم قۆناغە پێی دەوترێت: « ئۆرگازم لووتکەی چێژ orgasm بریتییە لەوپەڕی خۆشی لەئەنجامی کاری سێکسییەوە، کە هەریەکە لەنێرو مێ پێیدەگەن، هەموو ماسوولکەکانی لەش توند دەبنەوەو ناوچەی حەوز دەستدەکات بە تەوژمدان کە هەموو (٠,٨) چرکەیەك دووبارە دەبێتەوە »(٨٨)، ئەم حاڵەتەش لەچەند دێرێکی تری شیعرەکەدا بەدیدەدەکرێت، کە لەخوارەوە ئاماژەی پێکراوە.

**نۆزدەهەم : ئۆرگازمی ناکام:**

لەڕووی فیسیۆلۆجییەوە ئەوە سەلمێنراوە، کەوا لەدوای ئەنجامدانی کردەی سێکسی و گەیشتن بەوپەڕی ورووژاندن، قۆناغێکی تر لەپرۆسەکەدا دێتە ئاراوە، ئەویش بریتییە لەقۆناغی چوارەم و کۆتایی، کەوا بریتییە لە ئەوپەڕی ورووژاندن و گەیشتن بە ئۆرگازم، لەم قۆناغەدا « هەست بەخاوبوونەوەیەکی گشتی لەش دەکرێت Resolution لەم قۆناغەدا پیاوان توانای ڕەپبوون و ئۆرگازم بۆ

ماوەیەکی کاتی لەدەستدەدەن تەنانەت ئەگەر بزاوندێکی سێکسیش هەبێت Sexual Stimulation ‹‹[٨٩]، لەم حاڵەتەدا›› خوێنبەرو گیرفانەکان لەچووکدا پاش گەیشتنە سەرگەرمی و ڕژاندن تەسك دەبنەوە، یا کاتێك کە وریاکردنەوەی جەستەیی و دەروونی دەوەستێت. خوێنهێنەرەکان دەکرێنەوەو خوێن لێڕۆیشتن لە چووکەوە زۆر دەبێت. ئیتر کۆتایی بە ڕەپبوونەکە دێت ‹‹[٩٠]، ئەم حاڵەتەش زۆر جوان لەچەند دێریکی تری شیعرەکەدا بەرجەستە کراوە :

**چرکەساتیّ و**
**ئاوێکی سارد ئەکریّ بەپشکۆی هەوەسداو**
**چزەیەکی درێژکۆڵەی لێهەڵئەستیّ،**
**چرکەساتیّ و**
**ڕەنگی ئالّ ئەبیّ بەڕەنگی خۆڵەمێشی و**
**پۆپنەی کەڵەشێر ئەکەویّ بەلایەکداو**
**ئاگرەکە ئەکوژێتەوە.**
**حیلە دائەمرکێتەوە.**
**هەناسە خاو ئەبێتەوە.**
**گلاراوی، جێگە بۆ ویقار چۆلّ ئەکاو**
**لە دوایشدا،**
**لە پەنجەرەی خەیاڵێکی شین باوەوە**
**وەکو هیچم نەبیستبیّ و نەکردبیّ،**
**بە ئەسپایی دەچمەدەریّ**
**من هێشتا هەر چاوەڕوانم** ... ل. ١٠١

ساتی فڕێدانی تۆ ( مەنی ) و گەیشتن بە پلەی ئۆرگازم، بەئاوێکی سارد دەچوێنرێت کە ئاگر دەکوژێنێتەوە، ئەمە ئەو ساتەیە کە‹‹ هرووژاندنی سێکسی زیاد دەکات، پیاوەکە دەگاتە چێژی سێکسی، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك گۆڕانی فسیۆلۆژی ڕوودەدەن، وەك خێرابوونی هەناسەدان، بەرزبوونەوەی زیاتری گونەکان و گەورەبوونیان و خاوبوونەوەیەکی ماسوولکەیی سەراپاگیریش ڕوودەدات، لەوانەیە پەڵە یا سووربوونەوە لەسەر هەندێك ئەندامی جیاوازی جەستەش ڕووبدات ... ››[٩١]، ئەویش کەوا خەونە خۆشەکەی زوو دەڕەوێتەوەو

ڕەنگی کاڵی جوان لەبەرچاوەکانی دەبێت بەخۆڵەمێشی، ڕەنگی خۆڵەمێشی ڕەنگێکی مردوو دەگەیەنێت، پۆپنەی کەڵەشێر مەبەست لە ئەندامی نێرینەی گەنجەکەیە کەوا ڕەنگی گۆڕاوە، ئەسپە هارەکەش کە ئەندامە ڕەپبووەکەیە حیلەی نامێنێت و دادەمرکێتەوە، دواتر بەپەرێشانییەوە لە زیندە خەونەکە دەگەڕێتەوەو چاوەڕێی گەڕانەوەی یارەکەی دەکات، بەڵام کە گەیشتە پلەی ئۆرگازم، کە پلەی ئۆرگازمێکی ناکامە، واتا ئەم خۆشییەی نییە کە بەسروشتی لەگەڵ ئافرەتێك جووت بێت، زۆر لە توێژەران پێیان وایە (( خۆش ڕابواردن و ورووژاندنی دەماری، پاش تێپەڕبوونی خاڵی لووتکە، جۆرێك لەهەستی خەم لەدوای خۆیان بەجێدێڵن ))[٩٢]، بەڵام بەکامی دڵ گەیشتن بەلووتکەی ئۆرگازمی سێکسی بەلامانەوە ئارامی دەروونی دەبەخشێت، هەرچەندە (( لە کاتی کردەی سێکسیدا پێویستە هەردوو لا مۆڕاڵێکی باشیان هەبێ، پەرێشانی ڕۆحی دەبێتە گیران و نا ئارامی ماسولکەکان ))[٩٣]، ئەمانە لەکاتی کردەی سێکسیدا نەك بە خەیاڵ و زیندەخەون، هەڵبەتە پاش ورووژاندنی سێکسی مێشك لە ڕێگای دەمارەکانەوە هەڵدەستێ بەهاندانی لێشاوی خوێن لەو خوێنبەرانەی کە لە کۆئەندامی نێرینەدا کۆوبونەتەوە (penis) پڕ دەبن لە خوێن، لەناو شانە ئیسفنجییەکانی ناو ئەندامەکە وردە وردە دەئاوسێن و پڕخوێن دەبن پاشان خوێنبەرو خوێنهێنەرەکان زمانەی تایبەتییان هەیە بۆ ڕێگەگرتن لەگەڕانەوەی خوێن لە ئەندامی نێرینەدا، کەواتە بەگشتی ئەندامی نێرینە تاڕادەیەك لە تەڕکردنی پارچە ئیسفنجێك دەچێت، پاش ئۆرگازم و دامرکانەوەی ورووژانی سێکسی، خوێن بەرەبەرە لە ئەندامی نێرینە دەکشێتەوەو وەك پێش توندبوونی لێدێت[٩٤]، ئەم خاوبوونەوەی ئەندامی گەنجەکە لەم بەشەی شیعرەکەدا بەرچاو دەکەوێت وەك بەدەربڕینەکانی ئاوی ساردو کپبوونی حیلەی ئەسپەکەدا گوزارشتی لێکراوە.

**بیستەم : خەم و بێهوودەیی:**

دوای ئەوەی گەنجەکە بێئەوەی بگاتە جەستەی دەستگیرانەکەی، دەگاتە حاڵەتی ئۆرگازم، هەست بەپەرێشانی و نائارامی دەکات، هەڵبەتە لەکرداری سێکسیدا کاتێك کە جەستە خاو بووەوە مێشك مادەیەك دەڕێژێت، ئارامی

بەدەروون دەبەخشێت، بەڵام لەم جۆرەی گەیشتن بەپلەی ئۆرگازم هەست بەپەرێشانیی دەروونی دەکرێت، چونکە جووتبوونێکی ئاسایی نییە، ئەمەش لەدوا دێرەکانی دەقەکەدا بەڕوونی دەرکەوتووە:

**لە هۆڵەکەدا دانیشتووم**
**بەدەم وتنەوەی ژێر لێوی**
**گۆرانییەکەی " ئەی نارەوە و ئەی نارەوە"**(٩٥)
**سەر هەڵئەبڕم،**
**لە پڕێکدا،**
**دوای گرمەیەك، دەرگای حەمام ئەکرێتەوە،**
**لەگەڵ هورژمی هاڵاوێ،**
**بە سیمای پەمەییییەوە،**
**بە بریقەی ڕوومەتەوە،**
**بە ڕۆبێکی سپی پشتێن بەڕەڵڵاوە،**
**کە چمکێکی لە ئەرز ئەخشێ،**
**دەستگیرانم دێتە دەرێ،**
**لەم ساتەدا لەدڵی خۆمدا وا ئەڵێم:**
**خودایە کەی ئەو ڕۆژە دێ**
**سانسۆر لەمماڵەدا بمرێ و**
**بەم کەف و کوڵی جەستەوە،**
**لەگەڵ ئەودا...**
**بچمە ژووری حەمامەوە!** ... ل. ١٠٢

لێرەدا هەموو خەون و خەیاڵەکانی گەنجەکە کۆتاییان دێت، ئەمەش خۆی لەخۆیدا یەکێکە لە سیفەتە هەرە باوەکانی ڕۆمانسییەت، هەروەکو شاعیر خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت: « لەڕاستیدا ڕۆمانسییەت گەڕانەوەیە بۆ ناو ناخ، بۆ قووڵاییەکانی غەریزە (خود) یان زاتی مرۆڤ لەڕۆمانسییەتدا یەکەمین خانەی بوون پێکدەهێنێ. ڕومانسییەکان هەمیشە لەگەڵ سروشتدا ئەو جمکەن کە جیابوونەوەیان بۆ نییە. گۆرانییە هێواشەکان ماچێك لەبەر مانگەشەودا، شەپۆڵە دەست لەملەکانی ڕووبارێ، دارستانێکی کپ و خوێندنەوەی شیعرێ، بێدەنگییەك

له‌ناو تێڕامانێکی قووڵدا، مۆمێك و ڕوخساری دوو عاشـق له‌سـه‌ر مێزێـك، ئـاگرێکی نارنجی له ئێواره‌یه‌کدا که سـه‌رو ملـی تـۆ و دڵداره‌کـه‌ت له‌بـه‌ریا نـارنجی بنـوێنن، به‌کورتی هه‌موو سـاته‌وه‌خته ڕۆمانسـییه‌کان ناسـکن و له‌خـه‌وێکی خـۆش یـان لـه سه‌مایه‌کی هێواشی نێوان دوو جه‌سته‌ی تێکئاڵاو ئه‌چن ))[٩٦]، هه‌ر به‌م هۆیه‌شـه‌وه شاعیر ناونیشانی ڕۆمانسییه‌تی داوه‌ته پاڵ شیعره‌که‌یه‌وه‌و له‌م ڕووه‌وه ناوه‌ڕۆك و ناونیشانه‌که له‌گه‌ڵ یه‌کتریدا هاوته‌ریبن.

**پیشاندانی ئه‌م شیعره له ڕێی بۆچوونه‌کانی (سیگمۆند فرۆید) دا**

به‌هۆی بوونی په‌یوه‌ندییه‌کی به‌هێز لـه‌نێوان ئـه‌و ده‌قـه شـیعره‌ی سـه‌ره‌وه، له‌گه‌ڵ ده‌روونی مـرۆڤ، به‌پێویسـتی ده‌زانـین له‌ڕێگـه‌ی پیشـاندانی سێگۆشـه‌یه‌کی تایبه‌تی سیگمۆند فرۆید ده‌قه‌که شیبکه‌ینه‌وه، به‌ڵکو زیاتر په‌یامی لێکۆڵینه‌وه‌کـه به خوێنه‌ر ده‌گات:

**سێگۆشه‌ی فرۆید:**

منی باڵا
Super Ego
أنا العليا
من
Ego – أنا
ئه‌و
هو – I . D

**ده‌قه شیعره‌که به‌پێی سێگۆشه‌که‌ی فرۆید**



وەك لەسێگۆشـەدا دیـارە، لایـەنی سێکسـی و (کـچ ) یـش دەکەونـە نەسـت، (مـن) منێکـە هـی کەسـێکی گەورەیـەو زەبـت و ڕەبتـی هەیـە، نایـەڵێت غـەریزەو حـەزەکان سـەربکەن بـەرەو منـی بـاڵا، چـونکە (مـن) لەشـێوەی فلتەرێکدایـە پارێزگاری لـە (منـی بـاڵا) دەکـات، (مـن) ئـەو سانسـۆرەیە کـە ڕێگـا نـادات مـرۆڤ ئاژەڵانـە ڕەفتـار بکـات[٩٧]، واتـە (منـی بـاڵا) ئـەو کوڕەیـە کـە لـەناو خێزانەکـەدا ناسـراوەو دەبینرێـت، (مـن) ئـەم سانسـۆرە خـودی و دەرەکییانەیـە کـە لـەناخی کوڕەکـەدا پـەنگیان خواردۆتـەوە، (ئـەو) ئـەو حـەزە سێکسـییە کپکراوانـەن کـە کوڕەکـە هەیـەتی بەرانبـەر کچـەکە، بـەڵام لەبـەر ترسـی (مـن) کـە سانسـۆرە بەسـەریەوە، ناچـار دەبێـت پەنابباتـە بـەر زیندەخـەون بـۆ ئـەوەی لەوکاتـەدا سانسۆرەکە نەمێنێت و (ئەو) دزە بکات و حەزە خەفـەکراوەکان بێنـەوە جیهـانی (منی باڵا) بەو مەرامەی حەزەکان تێر بکرێن.

## ئەنجام

لەم لێکۆڵینەوەیەدا چەند ئەنجامێك بەدەستهاتوون، کەوا گرنگترینیان لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورتدەکەینەوە:

١- سێکس و ئیرۆتیك پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بەبابەتە ئەدەبییەکانەوە هەیە، حەزە کپتبووەکانیش لەڕێی خەون و خەیاڵ و بابەتە ئەدەبییەکانەوە بەتاڵ دەبنەوە، چ بەئاگایی چ لە بێ ئاگایی لە نەستەوە دزە دەکەنە نێو بابەتە ئەدەبییەکان، هەروەکو لەم دەقە شیعرەی شێرکۆ بێکەسدا دەردەکەوێت.

٢- ئیرۆتیك پەیوەندییەکی زۆری بەڕۆمانسییەتەوە هەیە، چونکە ڕۆمانسییەکان گرنگی بەخەون و خەیاڵ و لایەنی سۆزو نەست دەدەن، ئەم بابەتانەش ئیرۆتیك و حەزە کپتبووەکانیان لێدەچۆڕێتەوە، ئەو دەقە شیعرەش کەوا خاڵی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە پێکدەهێنێت، لەلایەن شاعیرەوە ناونیشانی ڕۆمانسییەت و ئیرۆتیکی بەیەکەوە بۆ دانراوە، هەروەکو لەلێکۆڵینەوەکەدا دەرکەوت ئەم دوو ڕەگەزە بەیەکەوە ئەو دوو پایەن کەوا دەقەکەیان لەسەر بنیاتنراوە.

٣- ئیرۆتیك جیادەکرێتەوە لەو جۆرە شیعرەی کەوا بەداشۆرین ناودەبرێت، چونکە مەبەست لە داشۆرین تەنها شکاندن و بەکەم سەیرکردنی کەسی بەرامبەرە، بەڵام مەبەست لەئیرۆتیك چێژوەرگرتن و خۆشی بەخشینە، بۆیە دەتوانین دەقە شیعرەکەی شێرکۆ بێکەس بەدەقێکی ئیرۆتیکی ناوبنرێت، و دوورو نزیك هیچ پەیوەندی بەم شێوازەی شیعرەوە نییە کەوا بە داشۆرین ناودەبرێت.

٤- شێرکۆ بێکەس لەم دەقەدا کارێکی زۆری لەسەر یادەوەریی خۆی کردووە، لەڕێی ئەم کورو کچەوە سەردەمی گەنجێتی خۆی هێناوەتەوە بیرو حەزە کپتبووەکانی خۆی لەم شیعرەدا دارشتۆتەوە، هەر لەدیمەنی ماڵی کوڕەکەو دەرەوەو ناوەوەی ماڵی دەستگیرانەکەی و ناو حەمام و شوێنەکانی تر، کەوا هەموویان هی سەردەمی گەنجیی شاعیرن.

٥- لەم دەقەدا لەزۆر شوێن پەنا دەبرێتە بەر خەیاڵ و زیندە خەون، ئەویش لەبەرئەوەیە کە ئەم گەنجە نەیتوانیوە لەواقیعدا بەو ئامانجانە بگات، بۆیە لەڕێی خەون و خەیاڵ و زیندە خەونەوە حەزەکانی خۆی تێردەکات.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:


1. Grand,L., Laws and Attitudes towaedes towards Homosexuality from Antiquity to the modern Era ponte 43:4-5 (1987)pp.122-129 .
2. The Symposium, in Benjamin Jowett trans, The Essential plato 1999-p. 746
3. http:en.wikipedia.org/wiki/pornography
4. http: dictionary.reference.com/browse/erotics

٥. پێشڕەوی سەید برایم، ڕووتەمەنی لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا، ٢٠٠٨، ل. ٣٦.

٦. سێکس لە مرۆڤدا (١–٥)، پەرچڤەی دانا محەمەد، گۆڤاری زانستی سەردەم، گۆڤارێکی زانستیی گشتی وەرزییە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات، ژمارە ٣٣، ل. ١٥٥.

٧. پێشڕەوی سەید برایم، ڕووتەمەنی لە ئەدەبی کوردیدا، ٢٠٠٨، ل. ٢٢.

٨. هەمان سەرچاوە، ل. ٢٥.

٩. ئافرەت لەچیرۆکی کوردیدا ١٩٢٥- ١٩٧٠، صەباحی غالب، کۆماری عێراق، وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، دار الحرية للطباعة، بەغداد، ١٩٧٩، ل.٢٧١.

١٠. ئافرەت لە فێمینیستی شیعرەکانی عەبدوڵڵا پەشێودا، ناسیح حوسێن سلێمان، عەبدوڵڵا پەشێو شاعیرێك لەڕەگەزی سەربزێوی، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی زیاد نادر عاڵلایی، لەبڵاوکراوەکانی خانەی ئەربیل بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣، ل. ٥٠.

١١. إيروتيكية الجسد في ملحمة كلكامش، مركز نور، حكمت مهدي جبار:
www.alnoor.se/article.asp

١٢. ئافرەت و جوانی لەشیعری گۆراندا، کەمال مەمەند، گۆڤاری نووسەری کورد، گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی کورد، ژمارە ١، ئەیاری ١٩٧٩، ل. ١١،١٠.

١٣. سێکوچکەی حەرامکراو، لێکۆڵینەوەیەکە لەمەڕ ئایین و سێکس و کێشەی چینایەتی، نووسینی بوعەلی یاسین، وەرگێڕانی سیروان محمد، ل. ٢٣.

١٤. قەیرانی ڕووبەری سێکس لە پێدەشتی کارمامزە کوژراوەکاندا، نەوزاد ئەحمەد حسین، گۆڤاری ئایندە، گۆڤاری ئەدەب و هونەری هاوچەرخە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات، ژمارە ٣٠ ئاداری ٢٠٠٢، ل. ٣٦.

١٥. ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا، ل.٢٧١، ٢٧٢.

١٦. قەیرانی ڕووبەری سێکس له پێدەشتی کارمزه کوژراوەکاندا، ل. ٣٦.
١٧. ئیرۆتیك لە شیعری نالیدا، زانا خەلیل، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ل. ١٩.
١٨. سێکس و پیری و گۆشەگیری له شیعرەکانی هێمندا ( ١٩٦٨– ١٩٨٦ ز)، د. فەرهاد قادر کریم، گۆڤاری زانکۆی کۆیە، گۆڤارێکی ئەکادیمییە زانکۆی کۆیە دەریدەکات، ژمارە ٢٣، حوزەیران، ٢٠١٢، ل. ١١٨.
١٩. ألأيروتيكا، www.alimbratur.com
**20.**Erotic-Literature www.en.m.Wikipedia.org/wiki/
٢١. ڕوخساری ڕووتی ئافرەتی عەرەب، نەوال سەعداوی، وەرگێڕان زەروان، دەزگای وەرگێڕان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل. ١٠٨.
٢٢. ئافرەت لەچیرۆکی کوردیدا، صەباحی غالب، ل.٢٧٢، ٢٧٣.
٢٣. قەیرانی ڕووبەری سێکس له پێدەشتی کارمزه کوژراوەکاندا، ل. ٣٦، ٣٧.
٢٤. سۆسیۆلۆژیای ئەدەب، لەڕوانگەی پێوەرە ئاکاری و ئایینییەکانەوە (شیعری کوردی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە) بەنموونە، د. ئازاد عەبدلواحید کەریم، لەبلاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك، چاپی دووەم، ٢٠١٣، چاپخانەی کارۆ، کەرکوك، ل. ٢٧٦.
٢٥. هونەری شیعر (شیعر ناسی)، ئەرەستۆ، وەرگێڕانی لە ئینگلیزی و پێشەکی و پەراوێزی عەزیز گەردی، لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل. ٢٢.
٢٦. هجاء، شعر، من ویکیبیدیا الموسوعة الحرة WWW.wikipedia.org
٢٧. ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، دکتۆرە شوکریە رسول، مطابع التعلیم العالي، أربیل، ١٩٨٩، ل. ٤٦.
٢٨. یاقووت و زمرووتی کوردی، دکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز، بەرگی چوارەم، چاپی یەکەم، کوردستان، سلێمانی، ٢٠١١، ل. ١٣٣، ١٣٤.
٢٩. هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.
٣٠. هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.
٣١. هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.
٣٢. هەمان سەرچاوە، ل. ٤٦، ٤٧.
٣٣. ڕێبازە ئەدەبییەکان، وەرگێڕان و توێژینەوەی فەرهاد پیربال، دەزگای وەرگێڕان، چاپی دووەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل. ٥١.

٣٤. قۆناغی پێش رۆمانسیزمی شیعری کوردی ١٨٥١–١٩٢١، لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی مێژووییە، ئیدریس عەبدوڵلا مستەفا، وەزارەتی رۆشنبیری، بەڕێوەبەرایەتیی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦، ل. ٦١.
٣٥. قوتابخانە ئەدەبییەکان، رەزا سەید حسێنی، و. حەمە کەریم عارف، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٦، ل. ٥٨.
٣٦. رێبازە ئەدەبییەکان، ل. ٧١.
٣٧. قوتابخانە ئەدەبییەکان، ل. ٥٩.
**38.** Andrea Dworkin.(n.d).Brainy Quote.com.Retrieved August 18-2011 - from Brom Beainy Quote.com
٣٩. الوسيط في شرح قانون الأحوال الشخصية العراقي رقم ١٨٨ لسنة ١٩٥٩ وتعديلاته، (عقد الزواج، والفرقة وآثارها، وحقوق الأقارب)، طبع على نفقة جامعة السليمانية، جامعة السليمانية، ٢٠٠٤، ل. ٢٣.
٤٠. شێرکۆ بێکەس گفتوگۆ، گۆڤاری رۆمانسی، گۆڤارێکی رۆشنبیریی گشتی وەرزییە، ئا: جەبار سابیر ، ژمارە ١، بەهاری ٢٠٠٧ی زایینی، ل. ٥.
٤١. هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.
٤٢. بزووتنەوەی ڕوانگەو شیعری نوێی کوردی، شادمان قادر حەسەن، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٥، ل. ٧.
٤٣. نەخۆشی گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان، د. کەریم شەریف قەرەچەتانی، چ. ٢، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی،٢٠١٠، ل. ١٨٢.
٤٤. قوتابخانە ئەدەبییەکان، ل. ٥٦.
٤٥. رێبازە ئەدەبییەکان، ل. ٦٢.
٤٦. جیهانبینی شیعری هاوچەرخی کوردی (کرمانجی ناوەڕاست) لەباشووری کوردستاندا، د. دەریا جەمال حەوێز حەوێزی، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی ژمارە (٢٦٨)، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤، ل. ١٩٦.
٤٧. رێبازە ئەدەبییەکان، ل. ٦٢.
٤٨. گێڕانەوە لەچیرۆکەکانی ئەحمەد محەمەد ئیسماعیلدا، د. پەری ساڵح موفتی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل. ١٧٥.
٤٩. قۆناغی پێش رۆمانسیزمی شیعری کوردی ١٨٥١–١٩٢١، ل. ٦٩.
٥٠. سایکۆلۆژیای گشتی، د. کەریم شەریف قەرەچەتانی، چ. ٢، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٣١٣

٥١. ئافرەت لەچیرۆکی کوردیدا، ل. ٢٧٦.
٥٢. هەمان سەرچاوە، ل. ٢٧٦.
٥٣. قورئانی پیرۆز، سورەتی الروم، ئایەتی ٢١.
٥٤. تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، نووسینی بورهان محمد أمین، پێداچوونەوەی لیژنەیەك، لەبلاوکراوەکانی کتێبخانەی ڕۆشنبیر، سلێمانی ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٤، ل. ٤٠٦.
٥٥. قورئانی پیرۆز، سورەتی النحل، ئایەتی ٧٢.
٥٦. تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان ، ل. ٢٧٤.
٥٧. بڕوانە : الوسيط في شرح قانون الأحوال الشخصية العراقي رقم ١٨٨ لسنة ١٩٥٩ وتعديلاته، ل. ٣٨.
٥٨. سێکس له مرۆڤدا ٢-٢ ، ل. ١٢٤.
٥٩. یاقووت و زمڕووتی کوردی، ل. ١٣٥.
٦٠. هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.
٦١. قۆناغی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی ١٨٥١-١٩٢١، ل. ٧٠.
٦٢. ڕەهەندی دەروونی لەشیعرەکانی لەتیف هەڵمەتدا، د. هاوژین صلیوە، چ. ١، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٣، ل. ٢٠٣.
٦٣. گێڕانەوە له چیرۆکەکانی ئەحمەد محەمەد ئیسماعیلدا، ل ٢٣٠.
٦٤. ئیرۆتیك له شیعری نالیدا، ل. ٢٣.
٦٥. الكاماسوترا Kama Sutra- علم الجنس الهندي، هو كتاب قديم وجد في الهند، يعتبر أول كتاب في التأريخ عن طرق ممارسة الحب ( الجنس )، تأليف : Vatsayayana ، نسخة عربية منقحة، كاستون فاتول، تقديم كلود دوزون، مكتبة قميصي نت للكتب المجانية http://www.qassimy.com/book. ل. ٣٣.
٦٦. بڕوانە : ئیرۆتیك له شیعری نالیدا، ل. ٢٤ ،٢٥، ٢٦ .
٦٧. قۆناغی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی ١٨٥١-١٩٢١، ل. ٧٤.
٦٨. یاقووت و زمڕووتی کوردی، ل. ١٣٥.
٦٩. ئیرۆتیك له شیعری نالیدا، ل. ٥٣.
٧٠. خەونە سێکسییەکان، د. فەوزیە دریع، گۆڤاری سەردەم، ژمارە ٣٩، ل. ٣٣.
٧١. بڕوانە : هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.
٧٢. ژن له فەلسەفەی سیاسی ڕۆژئاوادا، سۆزان مۆلێر ئۆکێن، ئامادەکردن و وەرگێڕانی بۆ فارسی نووری زادە، وەرگێڕانی ڕەسول سوڵتانی، دەزگای توێژینەوەو بلاوکردنەوەی موکریانی ، ٢٠٠٨، چاپخانەی خانی، دهۆك، ل. ١٣٣.

٧٣. بنيات السردية، اندري بريتون، ترجمة صلاح برمدا، منشورات وزارة الثقافة والارشاد القومي، دمشق، ١٩٧٨، ل.٢٢.
٧٤. الألوان، (دورها، تصنيفها، مصادرها، رمزيتها، ودلالاتها)، كلود عبيد، نقيبة الفنانين التشكيليين في لبنان، مراجعة و تقديم د. محمد حمود، مجد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ٢٠١٣م. ، ل. ٧٦ ،٧٧.
٧٥. دەروونزانی گشتی، هانی سلێمان، و. ئامانج محەمەد، چ٣، چاپخانەی کارۆ، ٢٠١١، ل ١٧٠.
٧٦. بڕوانە: فسیۆلۆژی سێکس، شاخەوان حمە أمین سعید، گۆڤاری زنە، گۆڤارێکی پزیشکی گشتییە خوێندکارانی کۆلیژی پزیشکی زانکۆی سلێمانی دەریدەکات، ژمارە ٢ ، ساڵی ٢٠٠٤، ل. ١٩.
٧٧. سێکس لە مرۆڤدا ٢-٢، پەرچڤەی دانا قەرەداخی، گۆڤاری زانستی سەردەم، ژمارە ٣٤، ساڵی ٩، مایسی ٢٠٠٨، گولانی ٢٧٠٨ی کوردی، ل. ١٢٧.
٧٨. بڕوانە: الألوان، ( دورها، تصنيفها، مصادرها، رمزيتها، ودلالاتها)، ل. ٦٥،٦٦.
٧٩. سایکۆلۆژیای گەشە (منداڵ و هەرزەکار)، د. کەریم شەریف قەرەچەتانی، چ١، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل. ٤٨٣-٤٨٤.
٨٠. ڕەهەندی خەون لەشیعری کوردیدا، فازیل شەورۆ، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤، ل.٤٢.
٨١. سایکۆلۆژیای گەشە (منداڵ و هەرزەکار)، د. کەریم شەریف قەرەچەتانی ، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل.٤٨٣
٨٢. دەروونزانی گشتی، ل. ١٧١.
٨٣. سوودەکانی ماچ لەنێوان هاوسەرەکاندا، ناسیح سەوابی، گۆڤاری خود، یەکەمین گۆڤاری سیکسۆلۆژییە لەڕوانگەی ئایینی و کۆمەڵایەتی و دەروونییەوە، هەموو پانزەی مانگێك دەردەچێت، ژمارە ٥ ، ئەیلولی ٢٠١٠، ل. ٣٦.
٨٤. گێڕانەوە لە چیرۆکەکانی ئەحمەد محەمەد ئیسماعیلدا، د. پەری ساڵح موفتی، ل ٢٢٩.
٨٥. فسیۆلۆژی سێکس، شاخەوان حمە أمین سعید، گۆڤاری زنە، گۆڤارێکی پزیشکی گشتییە خوێندکارانی کۆلیژی پزیشکی زانکۆی سلێمانی دەریدەکات، ژمارە ٢ ، ساڵی ٢٠٠٤، ل. ١٩.
٨٦. هەمان سەرچاوە، ل. ٢٠.

٨٧.فسیۆلۆژی ڕەپبوون، پەرچڤەی سەرهەند محەمەد، گۆڤاری زانستی سەردەم، ژمارە ٣٩ ، ساڵی ٩، تشرینی دووەمی ٢٠٠٢، خەزەڵوەری ٢٧٠٨، ل. ١٤٨.

٨٨.فسیۆلۆژی سێکس، ل. ١٩.

٨٩. هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٩٠. فسیۆلۆژی ڕەپبوون، ل. ١٥١.

٩١. هەمان سەرچاوە، ل. ١٤٦.

٩٢. لاوازی سێکسی و هۆکارو چارەسەر، نووسینی دەستەیەك، وەرگێڕانی: شێرزاد موکریانی، چ. ١، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل. ٢٧.

٩٣. هەمان سەرچاوە، ل. ٤٦.

٩٤. سێکس و دووسەد نهێنی، د. عادل حوسێن عەبدوڵڵا، چاپی پێنجەم، سلێمانی، چاپخانەی چوارچرا، ٢٠٠٦، ل. ٢٢.

٩٥. بەبۆچوونی ئێمە، ئەم گۆرانییەی شاعیر لێرەدا ئاماژەی پێدەکات، بریتییە لە گۆرانی (ئەی نار ئەی نار باوانم یار، هات و ڕۆیی بەلەنجەو لار)، کەوا بۆ یەکەمجار لەلایەن هونەرمەند حەسەن زیرەك گوتراوە، دواتریش هونەرمەند تاهیر و چەند هونەرمەندێکی تر دووبارەیان کردۆتەوە، لەزەمەنی دەقەکەدا گۆرانییەکی باو بووە لەسەر زاری گەنجانی کورد.

٩٦. شێرکۆ بێکەس گفتوگۆ، گۆڤاری رۆمانسی، ژمارە ١، ل. ٥.

٩٧.ڕەهەندی دەروونی لەشیعری لەتیف هەڵمەتدا، ل. ٢٠٨.

## ملخص البحث

إن الغريزة الجنسية والرغبة الإيروتيكية موجودة عند كل الفرد من المجتمع، وهذه الغرائز والرغبات تتجسد في كل المواضع الأدبية، خاصة في الشعر. أسباب إختيارنا لهذا الموضوع يرجع إلى عدم وجود أية البحوث الأكاديمية حول هذا الموضوع ، بالرغم من إنها قد شغلت جزءاً لا بأس به في الآثار الأدبية الكوردية من الفولكلور حتى أدبنا المعاصر.

حدود البحث: إن المادة الخامة لهذا البحث مأُخوذة من أحد أشعار الشاعر المعاصر الكوردي شيركو بيكەس بعنوان (الحمام)، المنشور في آخر دواوينه الشعرية بعنوان ( إسرعي الموت يكاد يصل ).

ميتود البحث: ميتود هذا البحث هو الميتود الوصفي والتحليل النفسي، في الجزء الاول: أخذنا الميتود التحليلي النفسي وفي الجزء الثاني إختلطنا الميتودين معاً.

ستراكتور البحث: يتكون البحث من فصلين: الفصل الاول: يتكون من عدة مباحث، المبحث الأول: يتحدث عن مفهوم (الإيروتيك) ومدلولاته، وفي المبحث الثاني نتحدث عن علاقة السكس والإيروتيك وعلاقتهما بالأدب. و أخذنا بأُعتبار آراء عدة باحثين وعلماء النفس في هذا الصدد. وفي المبحث الثالث : نتحدث عن الإيروتيك والرومانسية والنقاط المتشابهة المشتركة بينهما ، لأن الرومانسيون يهتمونَ بالناحية العاطفية اللاشعور والكبت الجنسي وهنا يتداخل مع العالم الإيروتيكي.

والفصل الثاني خاص بتحليل الإيروتيك في شعر شيركو بيكەس والذي يتكون من المبحثين الرئيسيين، شرحنا فيهما كل المراحل التي يمر بها الإيروتيك إلى ما تسمى بالأورجازم، وفي الأخير نحلل النص بالمثلث الفرويدى الشهير. وفي النهاية وصلنا إلى مجموعة استنتاجات ووردنا المصادر والمراجع التي استفدنا منها وأخيراً ملخص البحث باللغتين العربية والانجليزية.

## Abstract

Everyone has sexual instinct and erotic desire, these instincts and desires, as areal subject, come into the literary subjects. They stay in the literary genres through the literary language, poetry gets the lion's share .The reason of choosing this subject relates to the inadequacy of the research about this subject, however, the erotic texts have conquered a large area of the Kurdish literature from the folkloric works up to now.

The scope of the research:

The scope of the research is a poetry by (Sherkobekas ) entitled Hamam "Bath" which he published in his latest divan. The poetry has a form of story, and is a possible text to this research.

The method of the research:

We have used a descriptive psychoanalytical method. In the first chapter the descriptive method, and in the second chapter the psychoanalytical method are used, in some parts of the second chapter both of the methods have been mixed.

The structure of the research:

This research consists of two chapters, the first chapter is divided into some subchapters .the first subchapter, is the concept of erotic in which the term of erotic is talked about, and its meaning and connotations are presented. The second subchapter entitled the "relatedness of sex and eroticism to literature", adducing the views of some scientists and psychologists, erotic and sexual sides, and to what extend they reflect in literature are explained. The third subchapter indicates the relation of erotic to romanticism which have a common world and share arelevant atmosphere, because the romantics paid a great attention to the feelings, emotions,the unconscious of the individual and the sexual taboos all of which come into the eroticism world. The second chapter is special to the sherkobekas's poetry entitled hamam"Bath"Which is gradually interpreted and analyzed starting at first from the passionate and romantic imagesto the last degree of erotic orgasm of the poetry.

# یەکەمین ژمارەی (خەبات)ی نهێنی لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١

پ. ی. د. ئازاد عوبێد ساڵح
بەشی مێژوو – کۆلێجی ئاداب –
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**بەرایی**

مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردی و پارتی دیموکراتی کوردستان، هێشتا ساخکردنەوەی زۆر دەوێت. ڕۆژنامەی "خەبات"یش وەك ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان مێژووەکەی ئاڵۆزی تێدایە.

ئەم توێژینەوە باس لە یەکەمین ژمارەی "خەبات"ی نهێنی سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١ و ساخکردنەوەی شوێنی دەرچوونی و ئەوانەی لە پشت دەرچوونی بوونە و پوختەیەکی چڕی ناوەڕۆکی ئەو ژمارەیە دەکات.

پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦، دامەزرا، ڕۆژنامەی (ڕزگاری)[1] وەك زمانحاڵی[2] پارتی دیموکراتی کورد پاشان (کوردستان)، کە وەك میراتی حزبی ڕزگاری هەر بەو ناوەوە مایەوە، ئەویش بەهۆی ئەو ناو و ناوبانگە باشەی کە لە نێو کۆمەلانی خەڵکی کوردستاندا هەیبوو. ڕزگاریی ژمارە (١) لە ئەیلوولی ١٩٤٦ دەرچووە[3].

ئەوەی ساخ بووەتەوە تا ساڵی ١٩٥٦ تەنیا گۆڤاری (ڕزگاری) کە بە عەرەبی و کوردی دەرچووە زمانحاڵی پارتی بووە، پاشان بووەتە (خەباتی کوردستان)، پاشان لە سەردەمی ئاشکرا (خەبات) زمانحاڵ بووە[4].

لە دوای ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ پارتی دیموکراتی کوردستان ئۆرگانی ئاشکرای بەناوی (خەبات) دەرکردووە، ژمارە (١)ی لە ٤ی نیسانی ١٩٥٩ لە بەغدا سەرەتا بە زمانی کوردی و دواتر بە زمانی عەرەبی تا ١٩٦١/٣/٢٨، (٤٦٢) ژمارەی لێ دەرچوو[5].

سەبارەت بە ناوی (خەبات)، ئەوەی تا ئێستا زانراوە حوسێن حوزنی موکریانی (١٨٩٣ – ١٩٤٧) زوو لە نووسینەکانی بەکاریهێناوە[٦]، جەلال تاڵەبانیش دەڵێت: "خەبات ووشەیەکی کوردییە زۆرتر لە زاراوەی کرمانجی ژووروودا بەکاردێت. خەبتن، دەخەبتی، خەبات، ووشەی سەرزاری خەڵکەکەن و پڕ بەپێستیش مانای (کفاح نضال) دەدەن. هەر لە خەبتن بۆ ژیان و گوزەرانەوە بگرە تا خەباتکردن لەپێناوی ڕزگاری گەل و نیشتماندا. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نووسینە سیاسییەکانی چلەکان زۆر کەم وشەی خەبات بەرچاومان دەکەوێت، بەڵکو ئەوسا (تێکۆشان و تێکۆشین) زۆرتر بەکاردەهاتن. بۆ نموونە (وحدة النضال) لەو سەردەمەدا بە (یەکێتی تێکۆشین) تەرجومە کرابوو. وەك لەبیرم بێت یەکەمین جار بەکارهێنانی ئەم وشەیە لە ڕۆژنامەگەری پارتیدا دەگەڕێتەوە بۆ گۆڤارەکەی (خەباتمان) کە لە بەغدا لەلایەن لقی بەغدا، شەهید عەلی حەمدی و مامۆستا ساڵح ڕۆشدیەوە دەرچوو. پاشان لە پەنجاکاندا کە بڕیاردرا گۆڤاری کوردی لە عەرەبی جیابکرێتەوە لەدوای کۆنگرەی دووی پارتیەوە بڕیاردرا گۆڤاری (ڕزگاری) ئۆرگانە کوردییەکەی پارتی بێت و بە عەرەبیش گۆڤارێك بەناوی (خەباتی کوردستان)ەوە دەربکرێت...... لە دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزیش کە داوای ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانە کرا مامۆستا برایم لەگەڵ مامۆستا سدیق شەنشەلی خوالێخۆشبوو وەزیری ئیرشادی کۆماری عیراق لەسەر ناوی (خەبات) پێکهاتبوون بێ (کوردستان)ەکە بەم جۆرە (خەبات) بووە بە ڕۆژنامەی سیاسی و ئۆرگانی پارتی لە ساڵی ١٩٥٩دا لەوساوەش بەهەمان ناو و بە ئۆرگانی هەمان پارتییەوە دەردەچێت"[٧].

هەروەك تاڵەبانی گوتوویە: دوای ئەوەی "ڕزگاری" تەنیا بە زمانی کوردی دەرکراوە، گۆڤارێکی عەرەبیش پێویست بووە بۆ بادینان و کوردانی فەیلی لە بەغدا و هەندێ خوێندەواری هەولێر کە لەگەڵ زمانی کوردی سەروکاریان لاواز بووە، هەروەها بۆ عەرەبەکانیش و بە پێشنیازی جەلال تاڵەبانی ناوی "خەباتی کوردستان" لەو ئۆرگانە عەرەبییە نراوە، پێشتر لقی بەغدای پارتی دیموکراتی کوردستان، بڵاوکراوەیەکی بەناوی "خەباتمان" دەرکردووە، جا ناوی "خەبات" لەوەوە هاتووە و "کوردستان"یشی خراوەتە سەر. زۆربەی وتارەکانی ئەم گۆڤارە

ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی نووسیویانە، چاپەکەشی، جەلال تاڵەبانی بە هاوکاریی خورشید شێرە بووە، دابەشکردنیشی عومەر مستەفا (دەبابە) بووە لەو ماوەی کە لە کەرکووك بووە، کاری چاپەمەنییەکەی بە تایپ و ڕۆنیۆ بووە، پاشان گوازراوەتەوە سلێمانی(٨).

وادیارە پارتی دیموکراتی کوردستان هیچ ڕۆژنامەیەکی بە ناوی (خەبات) بەر لە ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ دەرنەکردووە، بەڵکو تەنیا بەناوی "خەباتی کوردستان" بووە(٩).

زۆر لە سەرچاوە و شارەزایانی ئەو ڕۆژگارە دووپاتی ئەمە دەکەنەوە کە "ڕزگاری" لە دوای یەکگرتنەوەی باڵەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە بە "خەباتی کوردستان" و کلێشەی ژمارەکانی ئەو خەباتەی کوردستان لەبەردەستە، بەڵام هیچ دانەیەك بەناوی "خەبات" بە تەنیا لە پێش ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لەبەردەست نییە(١٠).

هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ بۆ کورد و پارتی دیموکراتی کوردستان، کارێکی ناچاری بێ ئەوەی خۆی بۆ ئامادە کردبێت(١١). هەر ئەوەبوو وایکردووە شۆڕشی کوردستان لە سادەترین ئامرازی ڕاگەیاندنی ئەو ڕۆژگارە بێبەش بێت کە ڕۆژنامەیە و نەتوانن وەك پێویست دەری بکەن.

لە ساڵی یەکەمی شۆڕشدا و تا هەشت مانگ بەسەر هەڵگیرسانی شۆڕش تێپەڕیوە هێشتا نەتوانراوە دامودەزگاکانی شۆڕشی ڕێك بخرێن و بکەونە کار و ئەرکەکانیان ڕابپەڕێنن، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە پارتی دیموکراتی کوردستان نیازی شەڕی نەبووە(١٢).

ئینجا با بێینەوە سەر دەرچوونەوەی (خەبات) لە شۆڕشی ئەیلوولدا، ئەوەی هەتا هەنووکە ساخ بووەتەوە، یەکەم ژمارەی (خەبات) لە سەرەتای نیسانی ١٩٦٢ بە ژمارە (٤٦٥) دەرچووەتەوە(١٣).

لەگەڵ ئەوەی سەرچاوە هەیە ئاماژە بەوە دەکات کە (خەبات) لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی (دەرگەزێن) لە ژێرزەمینی ماڵی ئەحمەد خەیات ناسراو بە (ئەحە بچکۆلی خەیات)، کە ماڵی نهێنیی پارتی بووە، "لە سەرەتاکانی شۆڕشی

ئەیلوولی ١٩٦١" بە نهێنی دەرچووە و دواتر لە كۆتایی ساڵی ١٩٦٢ بردراوەتە ناوچە ئازادكراوەكان لە ماوەت[١٤].

هەرچی محەمەد شاپەسندییە[١٥] كە سەروكاری لەگەڵ چاپ و چاپخانەی نهێنی و ئاشكرا زۆربووە، لە بیرەوەرییەكانیدا ئاماژە بەوە دەكات كە لە هاوینی ١٩٦٢، یەكەم ژمارەی (خەبات) بە نهێنی لە سلێمانی چاپ و بڵاوكراوەتەوە، بەڵام دواتر سدیق ساڵح بۆی ڕاست كردۆتەوە، كە ژمارەیەكی دیكە پێشی ئەوەی سلێمانی لە بەغدا بە ژمارە (٤٦٥) لە سەرەتای نیسانی ١٩٦٢ بە (١٢) لاپەڕە (ڕاستییەكەی (١٤) لاپەڕە– ئازاد) دەرچووە.[١٦].

وێڕای ئەمانەش هەر ئەو كەسەی بۆ یەكەم جار ئەو ژمارەی ڕۆژنامەكەی لا دۆزراوەتەوە دەڵێت: "ڕۆژنامەكە لە گوندی (مالوومە)ی نزیك سلێمانی بە چاپ گەیەندراوە"[١٧].

ئەوەی لێرەدا گرنگە و مەبەستی ئێمەیە لە بەسەركردنەوەی مێژووی (خەبات)، دەرچوونی یەكەمین ژمارەی نهێنییە لە ڕۆژگاری سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١دا، كە بووەتە جێی مشتومڕ و تا ئێستا ساخ نەبووەتەوە لەكوێ و چۆن دەرچووە. ئەوەتا یەك دەڵێت لە سلێمانی و ئەوی دیكە دەڵێت لە بەغدا[١٨].

بۆ پەردەلادان لەسەر ئەو نهێنییە، پەنا دەبەینە بەر بیرەوەرییەكانی یەكێك لەوانەی خۆی ئەو ژمارەیەی (خەبات)ی چاپ و بڵاوكردووەتەوە و زۆر بە ڕاشكاوانە باس لە دەرچوونی (خەبات)ی ئەو سەردەمە بەنهێنی دەكات لە شاری هەولێر، وەك نووسیویە: لەسەر ڕاسپاردەی مەكتەبی سیاسی پارتی دیموكراتی كوردستان داوایان لێكراوە ڕوونووسی ڕۆژنامەی (خەبات) چاپ بكەن كە (١٤) ستێنسڵ بووە، ئەمەش دەق ئەو چواردە لاپەڕەیە كە ژمارە (٤٦٥)ی نیسانی ١٩٦٢ی (خەبات)ی پێ دەرچووە، هەروەها بەپێی زنجیرەی گێڕانەوەی ڕووداوەكان، دروست كاتەكەش هەمان ئەو كاتەیە كە ئەو (خەبات)ی پێ دەرچووە لە بەهاری (نیسان)ی ١٩٦٢. لەوكاتەی قادر شۆڕش[١٩] ئەندامی ناوچە و لێپرسراوی كرێكارانی پارتی دیموكراتی كوردستان بووە لە هەولێر و ڕۆنیۆی حزبی لا بووە كاری چاپكردنی بڵاوكراوەكانی پارتی پێ كردووە، لە سەروبەندی هاتنی نەورۆزی ١٩٦٢ بەیاننامەیەكیان چاپ و بڵاوكردووەتەوە و ڕۆژێك پێش

نەورۆز بەسەر شانەکانی پارتیدا بڵاویانکردووەتەوە. ئینجا لە درێژەی ئەو کارانەدا دێتە سەر چاپکردنی ڕۆژنامەی (خەبات)، لەبەر گرنگیی زانیارییەکان سەبارەت بەو ژمارەیەی (خەبات) بۆ زیاتر ئاشنابوون و تێگەیشتن لە وردەکارییەکان ئەوا دەقی گێڕانەوەکەی قادر شۆڕش لێرەدا دەنووسینەوە:

"پاش ماوەیەك لەلایەن لێپرسراوی کۆمیتەی ناوچەوە[٢٠]، ئاگادار کراین کەوا مەکتەبی سیاسی ڕوونووسی ڕۆژنامی (ڕۆژنامەی — ئازاد) خەباتی ناردووە و دەبێ بە ڕۆنیۆ چاپیان بکەین. ئێمەش ڕوونووسەکەمان برد بۆ لای هەڤاڵێکیتر کە شارەزا[٢١] بوو لە ستێنسڵ چاپکردن. تایپێکی پارتیمان هەبوو لە گەڕەکێکی دوور لەلای هەڤاڵێك. بەخێزانەکەم[٢٢] تایپەکەم گواستەوە کە لە ژێر حەباکەیدا (عەباکەیدا — ئازاد) شاردبوویەوە بۆ ماڵی هەڤاڵی شارەزا، ئەو هەڤاڵەش بە شەو و ڕۆژێك توانی زۆر بە هێمنی ١٤ چاردە ستێنسڵ چاپ بکا و بۆمان ڕەوانە بکا، تایپەکەش هەر بە شێوەی پێشوو گواستمانەوە بۆ شوێنێکیتر. لەگەڵ هەڤاڵێکیتر دەستمان کرد بە چاپکردنی ڕۆژنامەی خەبات. ماوەی سێ ڕۆژ لە ماڵێك بووین. خەریکبوو ئاشکرا بین. ناچار ڕۆنیۆ و کاغەزەکانمان گواستەوە بۆ گەڕەکێکیتر و لەوێ چوار ڕۆژ ماینەوە و خەریکی چاپکردن بووین تا تەواومانکرد کە فەردەیەکی پڕ لە ڕۆژنامە بوو. ڕۆژنامەکە (١٤) لاپەڕە بوو. تەتەرێکی زۆر هێمن و باشمان هەبوو. ئەو هەڤاڵە[٢٣] نیو فەردەی بۆ سلێمانی، کەرکوك و بەغدا برد، هەروەها بۆ موسڵ و شوێنەکانی تریشمان نارد. ئیتر بەو شێوەیە خەریکی خەبات و کاری ڕێکخستن بووین، وازمان لە هەموو کارێکی تایبەتی هێنابوو، شەو و ڕۆژ دایك و خێزانەکانیشمان خستبوە کار بۆ چاکتر ڕاپەڕاندنی کارەکان. پارتی مانگی (٧) حەوت دیناری پێ دەداین. ئەو پارەیەش بەشی ئەو هەموو جموجۆڵەی ڕێکخستن و خەرجی ماڵەوەی نەدەکرد، بەڵام هەرچۆنیبا ئەژیاین"[٢٤].

بەم جۆرە زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێت کە یەکەم ژمارەی (خەبات)ی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ لە شاری هەولێر و بەو ئامێرە سادە و ساکارانە دەرچووە، ئەمەش زۆر بە ئاشکرا لەو ژمارەیەی خەبات (٤٦٥، اوائل نیسان ١٩٦٢) دەردەکەوێت، کە ناوی (خەبات) بە دەسخەت و بە خەتێکی ناخۆش و چاپەکەشی زۆر خراپ بووە، کە خۆشبەختانە ئەو ژمارەیە دۆزراوەتەوە، بەتایبەتی سۆراخ و

هەوڵی نەوزاد عەلی ئەحمەد کە لەلای شازین هێرش[٢٥] دەستی کەوتووە و یەکەم جار زانیاری لەبارەی بڵاوکردووەتەوە[٢٦].

دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە هەر ئەو ژمارەیە جارێکی دیکە بە دەستخەت نووسراوەتەوە و لە دەرەوە چاپکراوەتەوە بەهەندێ دەسکارییەوە، بەتایبەت کە پارتی دیموکراتی کوردستان هەر لە ساڵی ١٩٦٢ەوە نووسینگەی لیژنەی دەرەوەی لە بەرلینی ڕۆژئاوا (ئەڵمانیا) کردووەتەوە و بەشی ڕاگەیاندنیشی زۆر چالاك بووە و هەر بەیاننامە و ڕاگەیاندراو و بڵاوکراوەیەکی لە ناوەوە دەرچووبێت لە چاپخانەی لیژنەی دەرەوەی پارتی لە بەرلینی ڕۆژئاوا چاپ کراوەتەوە و بەسەر ڕێکخراوەکانی پارتی لە وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکادا دابەش کراوە و ئەوانیش بە نۆرەی خۆیان جارێکی دیکە دانەیان لەبەر گرتووەتەوە و دابەشیان کردووە. د. کەمال فوئاد (١٩٣٢ – ٢٠١٤) لێپرسراوی پارتی لە ئەوروپا و بەرپرسی نووسینگەی ئەڵمانیا و بەتایبەتیش نووسینگەی سەرەکی پارتی لە بەرلینی ڕۆژئاوا بووە، عومەر شێخمووسیش[٢٧] بەرپرسی ڕێکخراوی بەریتانیا بووە و ئەوانیش چالاك بوونە[٢٨].

بەپێی زانیارییەکانی بەردەست ئەوانەی دەوریان لەو کارەدا هەبووە وێڕای ئەوانەی پێشتر ئاماژەیان پێکراوە ئەمانە بوون: (سەید مەجید، فاتم حەمەد مەحمود (خوشکی قادر شۆڕش)، سولحییە محەمەد خدر (خێزانی قادر شۆڕش)، ئەحمەد بێکەس[٢٩][٣٠].

**ناوەڕۆکی ئەو ژمارەیەی خەبات بەم جۆرەیە:**

لەلاپەڕەی یەکەمیدا ناوی (خەبات) بە خەتێکی ناخۆش و بە دەست نووسراوە و لە ژێریدا نووسراوە زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بەبێ عێراق نووسراوە، لە بەرانبەریدا پێنج نیوەدێر دروشم نووسراون ئەوەی دەخوێندرێتەوە ئەمەیە:

١– سەقامگیری و گەشەکردن

٢– پێشکەوتنی

٣– تەنیا بە دیموکراتیەت

٤– دیموکراتیەت نابێت بە بێ ژیانێکی پەرلەمانی و ئازادی

٥- گشتی چارەسەری عادیلانەی دۆزی کورد

لە ژێر ئەمانەدا لە ناو یەك لاکێشەی درێژ ژمارە (٤٦٥) و سەرەتای نیسانی ١٩٦٢ و نرخی (١٠٠) فلسە نووسراوە، ئینجا کۆمەڵێك دروشم نووسراوە بەم جۆرە:

کە تێیدا داوا لە خەڵکی کوردستان دەکات خەبات بکەن لەپێناو بەرەیەکی یەکێتی نیشتمانی بۆ کارکردن لە دژی ئیستعمار و پرۆژەکانی و هاوپەیمانییەتەکانی و لایەنگرانی لەدژی دیکتاتۆریەتی قاسمی دژ بە گەل و ئامانجە مەزنەکانی. بۆ هێنانەکایەی ڕژێمێکی دیموکراتی پەرلەمانی دروست. بۆ پتەوکردنی پێوەندی برایانەی هاوخەباتی نێوان هەردوو گەلی عەرەب و کورد بۆ گەیشتنی کورد بە مافە نەتەوەییەکانی بە حوکمی زاتیشەوە بۆ کوردستانی عێراق. بۆ گێڕانەوەی بەڕاستی مافەکانی وڵات لە کۆمپانیا نەوتییە ئیستعمارییەکان. بۆ دەستەبەرکردنی مافە دیموکراتی و بژێوییەکانی کرێکاران و جووتیاران[٣١].

لە دوای ئەمە لە وتارێکی سەرەکیدا بەناوی (دەرچوونەوەی "خەبات" بۆ درێژەدان بە خەباتکردن لە دژی ئیستعمار و دیکتاتۆریەت و لەپێناو ڕزگاری و دیموکراتی و ئاشتی و لەپێناو مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد.) کە نیوەی لاپەڕەی دووەمیشی بردووە، باس لە هاتنەوە مەیدانی ڕۆژنامەی (خەبات) دەکات بۆ ناو گۆڕەپانی خەبات. ئەم وتارە وەك سەروتار وایە باس لە دەرچوونەوەی ڕۆژنامەی (خەبات) دەکات دوای یەك ساڵی ڕەبەق لە وەستاندنی بەناچاری. هەروەها لە وتارەکەدا دەڵێت: خەبات بۆ ئەوە هاتووەتەوە مەیدان بۆ بەرزڕاگرتنی ئاڵای برایەتی ڕاستەقینەی عەرەب و کورد و هاوخەباتی لە دژی ئیستعمار و دیکتاتۆریەت و چەوساندنەوە و نەهێشتنی سیاسەتی ئینکاری بوونی کورد. بۆ بەردەوامی دان بە خەبات لە پێناو دیموکراتی و کۆتایی هێنان بە ماوەی گواستنەوە (فترە الانتقال) و نەهێشتنی دادگاکانی عورفی و باری نائاسایی و کۆتایی هێنان بە حوکمی دیکتاتۆری و فەراهەمکردنی ئازادی و دیموکراتی گشتی و مافی دامەزراندنی پارتی بۆ هەموو لایەکان و دەستەبەرکردنی ئازادی بڵاوکردنەوە و ڕۆژنامەوانی و خۆپیشاندان و مانگرتن و ئازادی و دەربڕین بۆ هەمووان. پاشان

باسی دەوری "خەبات" دەکات وەك ڕۆژنامە لە بزووتنەوەی نیشتمانی دیموکراتی و لە هەموو لایەنەکانی دیکەی و پاشان چۆنیەتی درانی بە دادگا و داخستنی، بەڵام وەك دەڵێت (خەبات لەسەر ڕێبازی خۆی بەردەوام دەبێت وەك ڕۆژنامەی گەل.......) [٣٢].

لەدوای ئەوە، بەیاننامەیەکی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان دێت بەناوونیشانی "بانگەوازێك لە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بۆ گەلی عێراقی سەربەرز: بۆ هەموو پارتە سیاسییە نیشتمانییەکان هەموو ڕێکخراوە نیشتمانییەکان لە عێراق". بانگەوازەکە لە لاپەڕە (٢ — ٩)ی ڕۆژنامەکەی بردووە و لە ڕۆژی ١٩٦٢/٣/١٦ بڵاوکراوەتەوە، تێیدا داوای پشتگیری خەباتی شۆڕشگێڕانەی چەکداری گەلی کورد دەکات بە تێکۆشان لە بەرەیەکی نیشتمانی یەکگرتوو کە هەموو ئامانجە دیموکراتی و نەتەوەییەکانی گەلی عێراقی بە عەرەب و کوردەوە لێ بێتە دی. لەو وتارەدا بە دوورودرێژی باس لە بارودۆخی ئەو ڕۆژگارە و هەڵوێستی حکومەتی بەغدا بەرانبەر کورد و شۆڕشەکەی لە هەڵوێستی گشتی بەرەکانی شەڕی خستووەتە ڕوو لە کوردستان لە هەموو قۆڵەکانەوە، تێیدا ئەوە دەردەخات کە حکومەت تەنیا لە ناو شارەکاندا دەسەڵاتدارە و دەرەوەی شارەکان بە دەست هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوەیە. هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە لە ڕابردوودا دەوڵەتێك نەبووە بەناوی عێراق، بەڵکو ئەوە بەریتانیا بوو ئەو دەوڵەتەی دروست کرد و باشووری کوردستانی دەوڵەمەند بە نەوتی خستەسەر، بۆ ئەمەش بەریتانیا هەموو شێوازێکی گرتەبەر بۆ ئەم کارە، تەنانەت لە دواجاردا کۆمەڵەی گەلانیشی بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێنا. بۆیە گەلی کورد پەنای بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینی بەردەوام برد لە پێناو مافە نەتەوەییەکانی. شۆڕشی ١٤ی تەممووزیش مژدە و هەوارێکی خۆش بوو کورد هەر دەستبەجێ پشتگیری کرد و تایبەتیش مادەی سێی دەستوور کە جەخت لەسەر هاوبەشیی کورد و عەرەب لەو وڵاتە دەکاتەوە، بەڵام ئەمە زۆری نەبرد، کوردستان کەوتە بەر شاڵاوی حکومەتی قاسم و لە ئاکامی ئەمەشدا کوردیش ڕاپەڕی بۆ ئەوەی داکۆکی لە بوونی خۆی بکات[٣٣].

پاشان وەك بەیاننامەکە دەڵێت، دێتە سەر کرۆکی بابەت ئەویش بەردەوامیی شۆڕشی کورد و نیشتمانی بوونی شۆڕشەکەیە لەپێناو مافە ڕەواکانی گەلی کورد و عێراق دژ بە دیکتاتۆریەت و ئیستعمار. گەلی کوردیش لە باشووری کوردستان بەشێکە لە نەتەوەی کورد وەك چۆن گەلی عەرەب لە عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب و گەلی کوردیش وەك عەرەب و نەتەوەکانی دیکە مافی ڕەوای خۆی هەیە، کورد کە ئەو شۆڕشەی بەسەردا سەپا، جگە لە مافە نەتەوەییەکانی لە ناو عێراق چی دیکەی مەبەست نییە و جیابوونەوە ئامانجی ئەو نییە، ئەوەش لەبەر ئەوە نییە کە ئەوە مافی گەلی کورد نییە، بەڵکو ئەوە بەشێکی گرنگە لە مافی دیاریکردنی چارەنووسی هەر گەلێك، هەندێ لە برایانی عەرەب کەوتوونەتە ناکۆکییەکی ڕوون، لە کاتێکدا دژی مافەکانی گەلی کوردن، ئەوا پشتگیری لە مافی گەلانی دیکە دەکەن[٣٤].

پاشان بەیاننامەکە لە بابەت هەندێ نموونە دەدوێت سەبارەت بە هاوبەشی کورد لە دەوڵەتی عێراق باسی (نەقابەی مامۆستایان) دەکات کە لە دوا کۆنگرەیدا چەندین پێشنیاز و ڕاسپاردەی بۆ پەکخستنی ڕۆشنبیری کوردی دەرکردووە، لەوانە "لابردنی ناوی کوردستان لە کتێبی قوتابخانەکان. هاندانی نووسەران و مامۆستایانی کورد بە زمانی عەرەبی بنووسن و هەڵوەشاندنەوەی بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی گشتی خوێندنی کوردی تانەدان لە بڕیارەکانی کۆنگرەی دووەم بە دامەزراندنی کۆلێجی پەروەردە لە کوردستان. تانەدان لەو هەوڵانەی بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی ناوخۆی مامۆستایانی کورد و دەبێ خوێندن لە سەرتاپای قوتابخانەکانی عێراق بە زمانی عەرەبی بێت و پێویست ناکات زمانی کوردی لە خانەی مامۆستایانی کوڕان و کچان بخوێندرێت، نابێت کۆڕی زانیاری کوردی هەبێت، چونکە کۆڕی زانیاری عێراق هەیە[٣٥].

سەبارەت بە سوپاش وەك بەیاننامەکە دەڵێت، یەك لەسەر سێی کوردن کەچی حکومەتی قاسم بە سوپای نەتەوەی عەرەبی ناودەبات، ئەگەر هاوبەشی هەبێت، ئەو بۆچوونانە چی مانایەك دەدەن. سەبارەت بە هەڵوێستی قاسم بە گۆڕینی ناوی (گەنمی بەناوبانگی کوردی) بۆ (گەنمی باکوور یان گەنمی چیایی) و گۆڕینی ناوی قوتابخانەی شۆڕش بۆ (الثورة)[٣٦].

لە کۆتاییدا چەند داخوازییەك دەخاتە ڕوو، لەوانە دەستبەجێ کۆتاییهێنان بە شەڕ لە کوردستان و سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی ناوچە وێرانبووەکان و ئازادکردنی گیراوان و زیندانی و دوورخراوەکان و گێڕانەوەی هەموو فەرمانبەر و کرێکارانی کورد بۆ جێگا و کارەکانیان لە کوردستان و قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووان و گێڕانەوەی دەرکراوەکان بۆ سەر کارەکانیان و هەڵوەشاندنەوەی حوکمی عورفی و دەستەبەرکردنی ئازادییە دیموکراتییەکان و ئازادیی ڕێکخستنی سیاسی و پیشەیی... هتد. خێراکردن لە کۆتاییهێنان بە ماوەی گواستنەوە و بەخێرایی چارەسەرکردنی دۆخی ئابووری بەگشتی و جێبەجێکردنی یاسای چاکسازیی زەویوزار لە کوردستان....... هتد[٣٧].

بابەتێکی دیکەی (خەبات) بەناوی (تاوسەندنی خەباتی شۆڕشگێڕانەی چەکداری لە کوردستان و بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتن وێڕای قسەکانی موسەیلەمەی عێراق)، لێرەدا وێڕای بەبیرهێنانەوەی ئەو بەڵێنانەی عەبدولکەریم قاسم لە چەندین بۆنەی جیاجیا داویەتی بە کۆتاییهێنان بە ماوەی گواستنەوە و دەستووری هەمیشەیی لە عێراق ڕادەگەیەنێت، بەڵام بەڵێنەکان هیچی لێ نەهاتووەتە دی، پاشان باس لە چالاکییەکانی پێشمەرگە دەکات لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٦١ تا شوباتی ١٩٦٢[٣٨].

لە بابەتێکی دیکەشدا بەناوی (دوا هەواڵی شۆڕش)، تێیدا نووسراوە لەوکاتەی کە خەبات لەژێر چاپدا بوو ئەو هەواڵانەمان بۆ هاتووە والێرەدا تۆماریان دەکەین، تێیدا باس لە دواهەواڵی بەرەکانی شەڕ و چالاکی پێشمەرگەکانی کوردستان دەکات لە ڕۆژی ١٩٦٢/٣/١٠ تا ١٩٦٢/٣/٢٦[٣٩].

هەر ئەو ژمارەیە جارێکی دیکە لە دەرەوەی کوردستان و بە خەتێکی خۆش بەدەست نووسراوەتەوە بەتەنیا بانگەوازەکەی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان تێدا بڵاوکراوەتەوە، دیارە ئەمەش بایەخی ئەو بانگەوازە دەردەخات[٤٠].

هەر لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە هەردوو ژمارەی (٤٦٦، اوائل آب ١٩٦٢ و ٤٦٧، اوائل ایلول ١٩٦٢)، بە (٦ و ٤) لاپەڕەیە و هەمان شێوەی تایپ و نەخشەسازی خەباتی گۆرین (٤٦٥) چاپ کراوە[٤١].

## ئەنجام

پارتی دیموکراتی کوردستان وەك هەر پارت و ڕێکخراوێکی دیکەی سیاسی لەگەڵ دامەزرانی، زمانحاڵی خۆی بەناوی (ڕزگاری) دەرکردووە، ئەمە تا ساڵی ١٩٥٦ بەردەوام بووە لەوەبەدوا ناوەکەی بووەتە (خەباتی کوردستان). لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ و بەتایبەتیش لە ٤ی نیسانی ١٩٥٩ بە ئاشکرا بەتەنیا بە ناوی (خەبات) دەرچوو تا ئاداری ١٩٦١.

بە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١، (خەبات) کەوتە واری نهێنی، ئەوەبوو لەسەر هەمان زنجیرەی ئاشکرا جارێکی دیکە بە {ژمارە (٤٦٥)، سەرەتای ١٩٦٢} دوای ساڵێك دەرچووەتەوە. دوای دۆزینەوەی ئەو ژمارەیە مشتومڕی زۆری لە نێو پەیوەندیداران دروست کردووە، گوایە لە بەغدا، سلێمانی .... دەرچووە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە بە نهێنی لە شاری هەولێر بە (١٤) لاپەڕە و بە چاپێکی زۆر سادە و نەخشەسازییەکی ساکارتر چاپ و بڵاوکراوەتەوە. لەمەشدا چەند کادیرێکی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە هەولێر دەوریان لە چاپکردن و دەرکردنەوەیدا هەبووە بەتایبەتیش قادر شۆڕش و میرزا کەریم فەندی و قادر حەمشین..... هتد.

ئەم ژمارەیە چەند بابەتێکی لەخۆ گرتووە، لە هەموویان گرنگتر سەروتاری دەرچوونەوەی "خەبات" و بەیاننامەیەکی گرنگی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان سەبارەت بە بارودۆخی عێراق و کوردستان و شۆڕشەکەی. هەروەها هەواڵی بەرەکانی شەڕ و چالاکی پێشمەرگانە لە سەرتاپای باشووری کوردستان.

**سەرچاوەکان :**


(١) حزبی ڕزگاری کورد: لە زستانی ١٩٤٥، لە لایەن کۆمەڵێك ڕووناکبیری کورد دامەزراوە، دیارترینیان ساڵح حەیدەری بووە. ڕۆژنامەی زمانحاڵیان ناوی (ڕزگاری) بووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مختارات من مذكرات صالح الحيدري، ط٢، مطبعة رنج، سليمانية، ٢٠٠٤، ص ٧٨ – ٨٦.

(٢) ئۆرگان، ڕۆژنامەی ناوەندی، زمانحاڵ، ڕۆژنامەی سیاسی: ئامراز یان هۆکاری پەیوەندیکردنە، یان بڵاوکراوەیەکی ناوبەناوی تایبەتە، پارتێکی سیاسی، ڕێکخراوێك یان کۆمپانیایەکی کارکردن دەری دەکات. قاموس اطلس الموسوعي _ انجليزي _ عربي، ط٣، دار أكلس للنشر، الشركة الدولية للطباعة، الجيزة، ٢٠٠٥، ص ٨٨١.

(٣) علي عبدالله، تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني – العراق حتى انعقاد مؤتمر الثالث، (بلا)، ١٩٦٨، ص ٣٤؛ عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والأحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨ – ١٩٥٨، ط١، بغداد، ١٩٨٩، ص ١٥٣ – ١٥٥.

(٤) بڕوانە: جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، ط٢، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧١، ص ١٨.

(٥) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل ٢٢٤؛ ڕەفیق ساڵح و عەبدوڵڵا زەنگەنە، ڕابەری ڕۆژنامەنووسیی کوردی ١٨٩٨ – ١٩٩٠، "ڕۆژنامەڤانی"، ژمارە (١١ – ١٢)، ساڵی ٢٠٠٣، ل ١٣٩– ١٤١.

(٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: زاری کرمانجی "گۆڤار"، ڕەواندز، ژمارە ( ٦ )، کانوونی یەکەمی ١٩٢٦، لاپەڕە ١٧، هەروەها وشەی (خەبات) لە گۆڤاری (ڕۆژی کورد) لە شیعرێکدا بەسەرناوی (خوندن و خەبات) بەکارهێنراوە. بڕوانە: جەمال خەزنەدار، (گۆڤار)، (ئەستەمبۆڵ)، ژمارە (١)، ١٩ حوزەیرانی ١٩١٣، چ، المؤسسة العراقية، بەغداد، ١٩٨١، ل٤٧.

(٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مام جەلال، خەبات لە چییەوە هات و چۆن بوو بە ئۆرگانی پارتی؟ و چۆن بەڕێوە دەچوو؟، "خاك" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە (٥٥)، ساڵی پێنجەم، ١٠/ کانونی دووەم/٢٠٠٢، ل ٤ – ٥.

(٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەوانی کوردی ١٩٣٨ – ١٩٥٨، ڕۆژنامەوانی نهێنی، بەرگی سێیەم، بەشی

یەكەم، ل ٢٣٥ – ٢٣٦؛ ڕۆژنامەوانی نهێنی پارتی دیموكراتی كوردستان – عیراق، ئامادەكردنی: سدیق سالح – ڕەفیق سالح، سلێمانی، ٢٠١١، ل ٧ – ٣٤٩.

(٩) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، دادگاییكردنی خەبات، ل ٣٣؛ ڕەفیق سالح ئەحمەد و عەبدوڵڵا زەنگەنە، ڕابەری ڕۆژنامەنووسیی كوردی، "ڕۆژنامەڤانی" (گۆڤار)، (هەولێر)، ژمارە (١١ – ١٢)، ساڵی ٢٠٠٣، ل ١٤٠. لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بكرێت كە وەك عەبدوڵڵا زەنگەنە دەڵێت: یەكەم ژمارەی (خەباتی كوردستان) لە ئاداری ١٩٥٧ دەرچووبێت، بەڵام لە سەرچاوەی دیكەدا ئاماژە بە (خەباتی كوردستان) كراوە كە لە كانوونی دووەمی ١٩٥٧ دەرچووە و نەوشیروان مستەفاش ئاماژەی پێ كردووە. بڕوانە: د. جعفر عباس حميدي، التطورات والاتجاهات السياسية الداخلية في العراق ١٩٥٣ – ١٩٥٨، بغداد، ١٩٨٠، ص ٢٣٠؛ نەوشیروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەوانی كوردی ١٩٣٨، بەرگی سێیەم، بەشی یەكەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٢٣٦.

(١٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨ – ١٩٥٨، ط١، ص ١٥٥، ١٧٨، ١٨٧، ٣٤٠؛ كلێشەی ژمارەكانی (العدد ٣ ، السنة ١، مايس ١٩٥٧، العدد (٥)، السنة الاولى، شباط ١٩٥٨).

(١١) عبدالفتاح علي يحيى البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، اربيل، ٢٠٠١، ص ١٠٣.

(١٢) نەوزاد عەلی ئەحمەد، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و ڕۆژنامەی خەبات، ٢٠٠٠، ل ٧٠.

(١٣) كلێشەیەكی ئەو ژمارەیەی (خەبات) كە لە دەرەوە چاپكراوەتەوە وەك پاشكۆی بڵاوكراوەی (دیسان بارزانی) بڵاوكراوەتەوە، لەو سەرچاوەیەدا جارێكی دیكە بڵاوكراوەتەوە. بڕوانە: ڕزگار نوری شاوەیس، (ڕزگاری) ثم (خەبات) لسان حال الحزب الديمقراطي الكردستاني، ١٩٤٦ – ١٩٩٨، من منشورات مؤسسة (برايەتی و خەبات) الصحافية، مطبعة التربية، اربيل، ١٩٩٨، ص ١١٩؛ نەوزاد عەلی ئەحمەد، خەبات ئۆرگانی پارتی دیموكراتی كوردستان، ٢٠٠٨، ل ١٢؛ دەبێ ئاماژە بەوە بكەم، كەوا نەوزاد عەلی ئەحمەد یەكەمین جار ئەو ژمارەیەی لای (شازین هێرش) دۆزیوەتەوە و لە ڕۆژنامەی (كوردستانی نوێ)دا وتارێكی بە سەرناوی "چەند زانیارییەك سەبارەت بە ڕۆژنامەی "خەبات" بڵاوكردووەتەوە لەگەڵ كلێشەی ڕۆژنامەكە. بڕوانە: نەوزاد عەلی ئەحمەد، چەند زانیارییەك سەبارەت بە ڕۆژنامەی (خەبات)، "كوردستانی" (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە (٢٠٣٥)، ٢٠٠١/٣/٢٥، ل٩. بەداخەوە من لە كاتی ئامادەكردنی نامەی ماستەرەكەم ئاگاداری ئەو زانیارییانە

نەبووم ڕۆژنامەکەم لای کاك عەبدوڵڵا زەنگەنە و بنکەی ژین دەستکەوت و لە نامەکەمدا بەکارم هێنابوو. دیارە ئەم بابەتە دواتر مشتومڕی زۆری بەدوای خۆیدا هێناوە، لەسەر لاپەڕەی گۆڤارەکانی "ڕۆژنامەڤانی" و "ڕۆژنامەنووسان" و "ڕۆژنامەنووس" و "کوردستانی نوێ" و دواتریش لە دووتوێی کتێبدا جارێکی دیکە کاك نەوزاد وتارەکانی بڵاوکردوونەتەوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: نەوزاد عەلی ئەحمەد، ڕۆژنامە لە کتێبدا، بەرگی دووەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ١١ — ٣١.

(١٤) ڕزگار نوری شاوەیس، (ڕزگاری) ثم (خەبات) ......، ص ٥٤ — ٥٥.

(١٥) محەمەد شاپەسندی: لە ساڵی ١٩٢٠ لە سابڵاخ لەدایك بووە، شەشی سەرەتایی تەواو کردووە، پاشان بووەتە ئەندام لە کۆمەڵەی (ژ. ك). لە گۆڤاری "نیشتمان"ی کۆمەڵەدا پیتچنی کردووە، لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی سەردەمی کۆمار کاری کردووە و لە دوای نەمانی کۆمار لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان گیرساوەتەوە. لە زۆربەی ڕۆژنامەکانی باشووری کوردستان کاری کردووە، شارەزایەکی چاکی بواری چاپەمەنی بووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: بیرەوەرییەکانی محەمەد شاپەسندی، ئامادەکردنی: سدیق ساڵح، بنکەی ژین، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧.

(١٦) بیرەوەرییەکانی محەمەدی شاپەسندی، ل ٥٨. وادیارە (خەبات) بە نهێنیش هەر لەسەر زنجیرە ئاشکراکەی بەردەوام بووە، بەڵام بە (٤٦٥) دەستی پێکردووەتەوە، بێگومان ئەوەش لە ئاکامی بەهەڵەدانانی زنجیرەکانی بووە، ئەو جۆرە هەڵانە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا ڕوویداوە، بۆ نموونە لە ڕۆژنامەی (التآخي ١٩٧٠)دا، هەروەها لە ڕۆژنامەی (خەبات)ی دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوولیش هەمان هەڵە ڕوویداوە، لەکاتێکدا ژمارە (٥٢٧)ی ١٩٧٥/٣/٣ دوازمارە بووە، کەچی بە ژمارە (٥٢٦) لە ١٩٧٦/٧/١ دەستی پێکردووەتەوە و ژمارە (٥٢٧)یش لە ١٩٧٦/٨/١٦دا بووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، (دەبێ ڕۆژی ١٩٦٧/٤/٢٩ نەك ١٩٦٧/٥/٦ ساڵیادی ڕۆژنامەی برایەتی بێ). (ڕۆژنامەڤانی)، ژمارە (١)، ٢٢ی نیسانی ٢٠٠٠، ل ٧٨ — ١٧٠؛ ئازاد عوبێد ساڵح، کاریگەریی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر ڕۆژنامەوانیی کوردی ١٩٦١ — ١٩٧٥، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٢٦٤ پەراوێز.

(١٧) شازین هێرش، ڕوونکردنەوەیەك سەبارەت بە ژمارە (٤٦٥)ی ڕۆژنامەی خەبات، "ڕۆژنامەنووس" (گۆڤار)، (هەولێر)، ژمارە (١٣)، بەهاری ٢٠٠٨، ل ١٤١.

(١٨) ڕۆژنامەڤانی ژمارە (٤)، نیسانی ٢٠٠١، ل ١٢٢ — ١٢٨. محەمەدی شاپەسندی، ڕۆڵی ڕۆژنامەی (خەبات)ی نهێنی لە شۆڕشی ئەیلوولدا. (ڕۆژنامەنووسان) (گوتار)،

سلێمانی، ژمارە (٢) هاوینی ٢٠٠٢، ل ٢١٥ – ٢١٩؛ نەوزاد عەلی ئەحمەد، چەند زانیارییەك سەبارەت بە ڕۆژنامەی (خەبات)، ڕۆژنامەنووس، ژمارە (١٢)، پایزی ٢٠٠٧، ل ٧ – ٣٧؛ نەوزاد عەلی ئەحمەد، ڕۆژنامە لە کتێبێکدا، بەرگی دووەم، ل ١١– ٤٣.

(١٩) قادر حەمەد مەحموود ناسراو بە (قادر شۆڕش). لە ساڵی ١٩٢٤ لە گوندی (قەراسنجی سەروو)ی بناری سەفین لەدایك بووە. بە هۆی هەژاری لە ساڵی ١٩٤١ بە ماڵەوە هاتوونەتە هەولێر. لەدوای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کورد لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٦ چووەتە ڕیزەکانی ئەو پارتە. لەدوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بووەتە بەرپرسی کتێبخانەی شۆڕش لە هەولێر، کە سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بووە و هەر لەوەوەش نازناوی (شۆڕش)ی بەسەردا دەبڕێ، کە شوێنی بەیەکگەیشتنی ئەندامانی پارتی و نامە گۆڕینەوە و پۆستی ئەو حیزبە بووە. لە ١٩٦٥/٥/٨ دەبێتە پێشمەرگە لە هێزی سەفین، لەدوای ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دەبێتە بەرپرسی لێژنەی ناوچەی کۆیە و شەقڵاوەی پارتی دیموکراتی کوردستان. لە دوای نسکۆ لە ١٩٧٥/٤/١٤ دەگەڕێتەوە عێراق. لە دوای دامەزراندنی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان لە ١٩٧٦/٤/٧ چۆتە ریزی ئەم ڕێکخراوە. لە هاوینی ١٩٧٩ دەبێتەوە پێشمەرگە و چەندین بەرپرسیارێتی لە شوێنە جیاجیاکان دەبینێ. لە ١٩٨١/٥/١٢ بەئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردراوە و کراوە بە بەرپرسی لقی هەولێر. لە ڕۆژی ١٩٨٣/٦/١١، کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد لە هەولێر نێژراوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: شاخەوان شۆڕش، قادر شۆڕش چل ساڵ خەبات ......، ل ٧٦، ٣١، ٥٠ – ٥٣، ٥٨ –٧٢، ٩٤، ١٢١، ١٣٥، ١٥٠.

(٢٠) ئەو دەمە عەلی عەبدوڵڵا لێپرسراوی هەولێر بووە، بڕوانە: شاخەوان شۆڕش، قادر شۆڕش چل ساڵ خەبات و تێکۆشان، چ٢، کوردستان، ٢٠٠١ – ٢٠٠٢، ل ٥١ پەراوێز.

(٢١) ئەو هەڤاڵە شارەزایە میرزا عەبدولکەریمی بەڕێوەبەری تەسویەی هەولێر بووە. هەروەك ئەحمەد بێکەس دەڵێت: "ڕۆنیۆیەکمان هەبوو ماوەیەك لە ماڵی فاتم حەمەد مەحمود خوشکی قادر شۆڕشی دامانابوو، هەرجارێك بڵاوکراوەی پارتیمان بۆ بهاتبایە ئەماندا بە خوالێخۆشبوو میرزا عەبدولکەریم کە ئەوکاتە بەڕێوەبەری تەسویەی هەولێر بوو، ئەو لە دائیرەی خۆی بە نهێنی لە ستێنسڵی دەدا و دەیگەڕاندەوە بۆ قادر شۆڕش، ئەویش بە هاوکاری سەید مەجید لە ماڵی فاتم حەمەد مەحمود لە ڕۆنیۆیان دەدا و پاشان بڵاومان دەکردەوە". بڕوانە: شاخەوان شۆڕش، قادر شۆڕش، چل ساڵ خەبات....... ل ٥١ پەراوێز. میرزا عەبدولکەریم لە

ساڵی ١٩١٤ لە شاری کۆیە لەدایك بووە، سەرەتایی لە کۆیە و (دار العلوم)ی لە بەغدا تەواوکردووە و بە نووسەری زەبت (کاتب ضبط) لە دادگای عێراق دامەزراوە. لە شوێنی جیاجیای عێراق و کوردستان کاری پێ سپێردراوە و گوازراوەتەوە هەولێر بە هەمان ناوونیشانی فەرمانبەری لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی رابردوو خانەنشین بووە. میرزا لەساڵی ١٩٣٩ چووەتە ناو حزبی هیوا ، دوای دامەزراندنی کۆمەڵی (ژ. ك) ژیانەوەی کوردستان (١٩٤٢) لە رۆژهەڵاتی کوردستان پەیوەندی لەگەڵ گرتوون، هەر کە پارتی دیموکراتی کوردستانیش لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦ دامەزرا، میرزا چووەتە ریزی ئەم پارتە و لە کۆنگرەی سێیەمی پارتی کە بە نهێنی لە کەرکووك لە رۆژی ١٩٥٣/١/٢٦ بەسترا، سەرلەبەری بریارەکانی کۆنگرە و بەیاننامەی کۆتایی بە نهێنی بە شەو بە ئامێری تایپی دادگای کەرکووك چاپ کردووە، کە خۆی لەوێ (کاتب زەبت) بووە. لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ و دواتر مۆڵەتدانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٦٠/٢/٩ پارتی کۆنگرەی پێنجەمی بەئاشکرا لە بەغدا لە رۆژانی ٢ – ٨ی مایسی ١٩٦٠ بەستووە و میرزا وەك ئەندامی کارا بەشداری کردووە و لە هەڵبژاردنی دوارۆژی کۆنگرەدا میرزا عەبدولکەریم بە ئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوە. میرزا لە هاوینی ١٩٧٨ بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە و لە کۆیە نێژراوە. کریم شارەزا، الموظف والاداري والمناضل الوطني مرزا عبدالكريم ١٩١٤ – ١٩٧٩، "التآخي" (جريدة)، بغداد، العدد (٤١١٥)، ٢٠٠٣/١١/١٢؛ عبدالستار طاهر شريف، تأريخ الحزب الثوري الكردستاني، منشورات شۆڕشگێڕ (الثوري)، ط٢، بغداد، ١٩٧٨، ص ١٤٢. (٥٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود محمد، میرزا حاجی کەریمی ئاسنگەر سەربازێکی بێ ناو، "کاروان" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٤٩)، تشرینی یەکەم ١٩٨٦، ل ٢ – ١٤، ٩.

(٢٢) خێزانی قادر شۆڕش ناوی (سولحییە محەمەد خدر)ـە، وەك خۆی دەڵێت: ئەندامی بەشی ئافرەتان بووە لەگەڵ چەندین ئافرەتی دیکە پارتایەتییان کردووە، وەك گواستنەوەی چەك، ئامێری چاپ، نامە، بڵاوکراوە و بەیاننامەی حزب، ماڵ گواستنەوە، .... هتد. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: شاخەوان شۆڕش، قادر شۆڕش ......، ل ٥٠ – ٥١.

(٢٣) تەتەری حیزب ئەو کەسەیە کە ئەرکی هێنان و بردن و دابەشکردنی نامە و پۆستە و بڵاوکراوەکانی حیزبی لەئەستۆیە. تەتەری حیزب ئەوکاتە قادر حەمشین بوو. شاخەوان شۆڕش، قادر شۆڕش چل ساڵ خەبات ...... ل ٥١ – ٥٢. قادر حەمشین لە ساڵی ١٩٣٩ لە گوندی (دێمەکار)ی کەندێناوەی دەشتی هەولێر لەدایکبووە،

سەرەتا خوێندنی ئایینی لە گوندەکەیان دەستپێکردووە و لەدواییدا لە قوتابخانە دەستی بە خوێندن کردووە، لەگەڵ کارکردنی لەگەڵ باوکی لە شاری سامەڕای عێراق لەگەڵ کرێکارە کوردەکان لەوێ هەستی کوردایەتی لا پەیدا دەبێت. لە کۆتایی پەنجا و سەرەتای شەستەکان لە شاری هەولێر چووەتە ڕیزی پارتی دیموکراتی کوردستان. لە یەکێتی لاوان و قوتابیانی کوردستان کاری کردووە، لە پەنجاکاندا لە ڕۆژنامەی (خەبات) کاری کردووە. لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول تەتەری[٧٥] حیزب بووە لە هەولێر. لە ساڵی ١٩٦٤ ئەندامی ڕێکخراوی کرێکاران بووە و ئەڵقەی پەیوەندی نێوان لیژنەی ناوچەی هەولێر و ڕێکخراوەکان بووە بە نهێنی، پاشان بووەتە ئەندامی لیژنەی ناوچەی هەولێر و سەرپەرشتی ڕێکخراوی کرێکارانی کردووە، لە کاری نهێنیدا زۆر شارەزا بووە. لەدوای ١١ی ئاداری ١٩٧٠، لە سەندیکای کرێکاران کاری کردووە، تا بووەتە نوێنەری یەکێتی کرێکارانی هەولێر لە یەکێتی گشتی کرێکارانی عێراق لە بەغدا، کە شۆڕش هەڵگیرساوە لە ساڵی ١٩٧٤ چووەتە پاڵ شۆڕش و دواتریش لە ١٩٩١/٥/١٩ کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: محەمەد مەلا قادر، سەربوردەی نەمران، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤، ل ٣٠٧ – ٣٠٩. ؛ بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: شاخەوان شۆڕش، قادر شۆڕش – چل ساڵ خەبات ..... ل ٥٢.

(٢٤) شاخەوان شۆڕش، قادر شۆڕش چل ساڵ خەبات ...... ل ٥١ – ٥٢.

(٢٥) شازین هێرش: پێشمەرگەی دێرینی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، شاعیر و نووسەر، چەند بەرهەمێکی بڵاوکردووەتەوە، لەوانە: شۆڕشی ئەیلوول لە چەند بەڵگەنامەیەکی مێژووییدا ١٩٦١ – ١٩٦٣، ٢٠٠١، .......... هتد.

(٢٦) بڕوانە: نەوزاد عەلی ئەحمەد، چەند زانیارییەك سەبارەت بە ڕۆژنامەی (خەبات)، "کوردستانی نوێ"، ژمارە (٢٤٠٩)، ٢٠٠١/٣/٢٥، ل ٩.

(٢٧) عومەر شێخ مووس: لە ساڵی ١٩٤٢ لە عامودا لە ڕۆژئاوای کوردستان لەدایك بووە، خوێندنی دکتۆرای لە ساڵی ١٩٧٣ لە سوید تەواو کردووە، دەستەی دامەزرێنەری (ی. ن. ك) بووە. ئینسکلۆپیدیای یەکێتی نیشتمانی کوردستان، سەرپەرشتیاری گشتی فەرید ئەسەسەرد، چ٢، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، سلێمانی، ٢٠١٤، ل ٤٨١ – ٤٨٢.

(٢٨) نەوزاد عەلی ئەحمەد، خەبات، ..... ل ١٤. (هەر لێرەدا ئاماژە بە بۆچوونێکی هەڵەی خۆم دەکەم کە لە (ل ٣٦ پ) ماستەرنامەکەمدا (کاریگەریی شۆڕشی ئەیلول) ئاماژەم پێکردووە، پێچەوانەیە، کەوا پێم وابوو ئەوەی لە دەرەوە

چاپکراوە لە ناوەوە چاپکراوە، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە لەو سەرچاوەیەدا ئاماژەی پێکراوە. بڕوانە: نەوزاد عەلی ئەحمەد، خەبات.....، ل ٢٥، ٣٥.

(٢٩) شاخەوان شۆڕش، قادر شۆڕش چل ساڵ خەبات ............، ل ٥٠ – ٥٣.

(٣٠) بەداخەوە وێڕای هەوڵی زۆر نەتوانرا زانیاری لەبارەی هەموویان دەست بخەین. ئەحمەد حەمەد فەقێ هەرشەمی ناسراو بە (ئەحمەد بێکەس) لە ساڵی ١٩٣٠ لە گوندی گردەڕەشە لەدایك بووە. لە حوجرە خوێندوویەتی. لە ساڵی ١٩٤٤ هاتووەتە هەولێر و بە هۆی جموجۆڵی سیاسی لە ساڵانی چلەکانەوە هەستی کوردایەتی لا چەکەرەی کردووە. لە ساڵی ١٩٤٨ بووەتە سەرباز و نێردراوە بۆ فەلەستین تا ساڵی ١٩٥١ گەڕاوەتەوە، چووەتە قوتابخانەی ئێواران پاشان بۆ قوتابخانەی (أربیل الاولی). لە ساڵی ١٩٥٣ چووەتە ڕیزی پارتی دیموکراتی کوردستان. لە ساڵی ١٩٥٥ دەبێتە ئەندامی ناوچەی هەولێری پارتی و بەرپرسی کاسبکاران بووە. لە ساڵی ١٩٥٧ چووەتە دەربەندیخان بۆ کارکردن و لەوێش دەوری زۆر دیاری بینیوە و بۆ یەکەم جار ڕێکخستنی پارتی لەوێ دروست کردووە و بەشداری شۆڕشی ئەیلوولی کردووە، هەر لە ناوچەی سلێمانی تا لە کۆتایی ئاداری ١٩٦٢ گوازراوەتەوە لقی دووی پارتی لە هەولێر. لە کۆتایی مانگی نیسانی ١٩٦٢ بووەتە لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی پارتی لە شەقڵاوە. لە ساڵی ٢٠٠٦ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ئەحمەد حەمەد فەقێ (ئەحمەد بێکەس)، کوردایەتی – بیرەوەری و خەباتی سیاسی ١٩٣٠ – ٢٠٠٦، هەولێر (دەستنووس)، ل ١ – ٨٨. (ئەم دەستنووسە لە د. جەمشید حەیدەری وەرگیراوە، سوپاسی دەکەین).

(٣١) خەبات، ٤٦٥، نیسان ١٩٦٢، ص ١.

(٣٢) نفس المصدر ، ص ١– ٢.

(٣٣) نفس المصدر ، ص ٢ – ٤.

(٣٤) نفس المصدر ، ص ٤ – ٥.

(٣٥) نفس المصدر ، ص ٦.

(٣٦) نفس المصدر ، ص ٦.

(٣٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: دەقی بەیاننامەکە، خەبات (٤٦٥)، اوائل نیسان ١٩٦٢.

(٣٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: المصدر السابق، ص ٩ – ١٤.

(٣٩) نفس المصدر، ص ١٢ – ١٤.

(٤٠) نەوزاد عەلی ئەحمەد، خەبات، ....... ل ٣٩ – ٥٢.

(٤١) هەمان سەرچاوە، ل ٥٢ – ٦٢.



خەبات

(النضال)

عدد ٤٦٥

اول شباط ١٩٦٤

لسان الحزب الديمقراطي الكوردستاني

يا جماهير شعبنا ناضلوا من اجل جبهة اتحاد وطني للعمل :

ضد الاستعمار ومشاريعه واعوانه .

ضد الدكتاتورية الفاشية المعادية للشعب و[illegible] الأجنبي .

لاقامة نظام ديمقراطي برلماني سليم .

لتمتين الروابط الاخوية والنضالية بين الشعبين العربي والكوردي .

لمنح الشعب الكوردي حقوقه القومية بانشاء الحكم الذاتي لكوردستان العراق .

لاسترجاع [illegible] من شركات النفط الاستعمارية [illegible] .

لضمان حقوق العمال والفلاحين الديمقراطية والمعاشية .

نداء من الحزب الديمقراطي الكوردستاني الى الشعب العراقي [illegible] .

الى جميع الاحزاب السياسية الوطنية .

الى كافة المنظمات الوطنية في العراق .

بمساندة النضال الثوري المسلح للشعب الكوردي وبالنضال في جبهة وطنية متحدة

لتحقيق جميع المطالب الديمقراطية والقومية للشعب العراقي بعربه واكراده .

مرت في ١١ من هذا الشهر ستة اشهر على ثورة الشعب الكوردي بوجه العدوان والطغيان دفاعا عن وجوده وكيانه القومي والوطني [illegible] الثورة التي اعلن [illegible] العراق عبد الكريم قاسم عن استحالتها [illegible] في وقت واحد [illegible] في الصحف [illegible] بتاريخ [illegible] ١٩٦١ [illegible] على الشعب العراقي [illegible]

## ملخص البحث

اصدر الحزب الديمقراطي الكردستاني مع بداية تأسيسه جريدته المركزية باسم (رزگاری) وقد استمرت في الصدور حتى عام ١٩٥٦ بعدها حلت (خەباتی كوردستان) مكانها. وبعد ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ وبالتحديد في ٤ نيسان ١٩٥٩ صدرت الجريدة المركزية للحزب الديمقراطي الكردستاني باسم (خەبات) بصورة علنية واستمرت حتى ٢٨ آذار ١٩٦١.

مع اندلاع ثورة ايلول عام ١٩٦١، دخلت (خەبات) معترك النضال السري وعاودت الصدور وبالعدد (٤٦٥ اوائل نيسان ١٩٦٢)، وبعد العثور على هذا العدد النادر، حدث جدل ومناقشات بين المعنيين حول مكان صدوره بعضهم قال انه صدر في السليمانية بينما قال آخرون قالوا انه صدر في بغداد، والحقيقة انه صدر في اربيل بـ (١٤) صفحة وبطبعة بسيطة جداً وبتصميم ابسط وكانت لمجموعة كوادر الحزب الديمقراطي الكردستاني في اربيل دور فعال في طبعه ونشره، وبالاخص ميرزا عبدالكريم افندي، قادر شورش وقادر حمشين.... وآخرون. وقد تم تحقيق ذلك بالاعتماد على مذكرات قادر شورش والذي شارك مع عائلته في هذا العمل...

تضمن هذا العدد مجموعة مواضيع، اهمها الافتتاحية حول عودة صدور (خەبات) ونداء هام من المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكردستاني حول اوضاع العراق وكوردستان وثورتها، وكذلك اخبار جبهات القتال وفعاليات البيشمەرگە، في جنوب كوردستان والعراق.

## Abstract

The Kurdistan Democratic Party (KDP) like other political parties has established its newspaper under the name (Rezgari). This newspaper had continued on publishing until 1956. Thereafter, it changed its name to (Khabaiti Kurdistan) right after the end of the Iraqi revolution on 14th July 1958. Then, the newspaper again changed its name to (Khabat) on 4th April, 1959, and publicly published until March 1961.

Therefore, the newspaper was secretly published during the rising of Kurdish revolution known as (Aylul) in 1961 and edited its issue (465) after ceasing for one year. This edition(issue) made a controversial discussion among Kurdish intellectuals who predicted that it should have been published in Baghdad and Suleimaniyah provinces, but the truth was this issue (465) was published in a very simple quality and design in (14) pages in Erbil province.

It is better to say that there were some KDP members as such Qadir Shorsh, Mirza Karim Fandi and Qadir Hamashin…etc who played a major role in publishing this issue.

The issue (465) of the newspaper contained several crucial topics among them the editorial which dealt with the republishing of Khabat, along with a very important declaration by KDP's Political Bureaus regarding the political situation of Kurdistan and Iraq, including the latest updates of Peshmarga's (Kurdish Fighters) progressions in war zones.

# غەنی بلوریان
# ژیان و تێکۆشانی سیاسی (١٩٢٤-٢٠١١)

**( لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە )**

**د. هۆشمەند عەلی مەحمود**

**م. ئیسماعیل عەبدوڵرەحمان سەعید**

بەشی مێژوو- فاکەڵتی پەروەردە-

زانکۆی کۆیە

## پێشەکی:

غەنی بلوریان کەسایەتی دیاری سیاسیی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، کە لەماوەی نێوان ساڵەکانی سەرەتای دەیەی چلەکان تا سەرەتای دەیەی نەوەدی سەدەی ڕابردوو بۆ ماوەی پتر لە نیو سەدە خەباتکارو چالاکی سیاسی بووەو لەم ماوەیەشدا بەهۆی تێکۆشان بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سیاسییەکانی سەرجەم بیستو پێنج ساڵی تەمەنی لە زیندانەکانی حکومەتی پەهلەوی و پتر لە بیست ساڵی لە تاراوگە بەسەربردووە.

ژیانی سیاسیی ناوبراو بەهۆی ئاوێتەبوونی بەهەورازو نشێوی دونیای سیاسییەوەو هەڵوێستە سیاسییەکانی، بواری بۆ راوبۆچوونی جیاوازو مشتومڕ لەنێو لێکۆڵەراندا فەراهەم کردووە، بەتایبەتی نەیارانی سیاسیی ئەو بەشێوەیەکی یەکلایەنە و تاك ڕەهەندی ژیانی سیاسییان هەڵسەنگاندووە و تەنیا لایەنی سەرنەکەوتنە سیاسییەکانی ئەویان بەرجەستە کردۆتەوەو لەم سۆنگەیەوە هێڵێکی ڕەشیان بەسەر هەموو ژیانی سیاسیی ئەودا کێشاوە. هەر بۆیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدەدرێ لەسەر بنەمای ڕێبازی زانستی مێژوویی ئاوڕ لە وێستگەکانی ژیانی سیاسیی غەنی بلوریان بدرێتەوە و بەشێوەیەکی واقعبینانە هەڵبسەنگێندرێ، بەپشت بەستن بەچەند سەرچاوەیەك، کە گرنگترینیان بریتین لە: بیرەوەرییەکانی بلوریان بەناونیشانی (ئاڵەکۆك)و کتێبەکەی برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، کە گفتوگۆیە لەگەڵ بلوریان و هەردوو کتێب تایبەتن بە

مێــژووی ژیــانو تێکۆشــانی سیاســی بلوریــانو لــەڕووی گێڕانــەوەی ڕووداوە مێژووییەکاندا وێڕای هەندێك کەمو کوڕیی زانستی، بەڵام گرنگیو بایەخی زۆریان هەبوو بۆ توێژینەوەکەمان. بێجگە لەوانەش، کتێبـەکانی: د. یاسـین سەردەشـتی، بەتایبەتی (هەڵوێستی حزبی تـودە لەحاست کێشـەی نەتەوایـەتی گـەلی کـورد لـە ئێـران)، م.س. لازارێـف و ئـەوانی تـر (مێـژووی کوردسـتان)، کـریس کۆچـێرا (بزووتنەوەی نەتەوەی کوردو هیوای سەربەخۆیی)، عەبدولڕەحمان قاسملوو (چل ساڵ خـەبات لـەپێناوی ئـازادی)، کـەریمی حیسـامی (لەبیرەوەرییـەکانم)، جـەلیل گـادانی (بانەبێتــە درۆی پــاش مــردوو)، عەبـدوڵڵا حەســەن زادە (نیــو ســەدە تێکۆشـان)و هـەروەها چـەند ژمارەیـەك لـە گۆڤـاری گـزینگو هـاوارو سەرچـاوەی جۆراوجۆری دیکە لەم توێژینەوەیەدا سوودی زۆریان لێوەرگیراوە.

ئەم توێژینەوەیـە بەناونیشـانی (غـەنی بلوریـان، ژیـانو تێکۆشـانی سیاسـی ١٩٢٤–٢٠١١)، سێ بەشی سەرەکی لەخۆ دەگرێتو هەر بەشـێکیش بۆسـەر چـەند تەوەرێك دابەشکراوە. بەشی یەکەم بۆ پێگەیشـتن و تێکۆشـانی سیاسـیی ئـەو تـا ڕووخانی کۆماری کوردستان لە سـاڵانی ١٩٢٤–١٩٤٧ دیـاری کـراوەو بەسـەر سـێ تەوەر دابەشکراوە: تـەوەری یەکـەم بـاس لـە پێگەیشـتنو قۆناغـەکانی خوێنـدنی کـراوە. لـە تـەوەری دووەمـدا تێکۆشـانی ئـەومان لـە سـازمانی جـەوانانی کـورد (١٩٤٢–١٩٤٣) خسـتۆتەڕوو. تـەوەری سـێیەمیش تایبـەتکراوە بـە ئەنـدامبوونو تێکۆشـانی سیاسـی لـە کۆمەڵـەی ژیانـەوەی کـورد (ژ.ك)و حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان (حـدك) لـە سـاڵانی ١٩٤٤–١٩٤٧دا.بەشـی دووەمـی توێژینەوەکـە تەرخانکراوە بۆ تێکۆشانی سیاسیی بلوریان لەنێوان ساڵانی ١٩٤٨–١٩٧٨و لەدوو تەوەری جیادا ڕۆڵی ئەو لەدامەزراندنەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان (حدك) لە ساڵانی (١٩٤٨–١٩٥٨)، هەروەها قۆناغی ژیانی زیندانی سیاسی (لە پایزی ١٩٥٨ تـا پـایزی ١٩٧٨) باسـیان لێـوەکراوە. بەشـی سـێیەمو کۆتـاییش بریتییـە لـە تێکۆشانی سیاسی لـەنێوان سـاڵانی (١٩٧٩–٢٠١١)و بـۆ دوو تـەوەر دابەشـکراوە، لەتەوەری یەکەمدا باس لە گەڕانەوەی ئەو بۆ کوردستانو بەشداری لەبزووتنەوەی ئـازادیخوازی کوردسـتاندا (١٩٧٩–١٩٨٤) کـراوەو تـەوەری دووەمـیش بـۆ دوا وێسـتگەکانی ژیـانی سیاسـی بلوریـانو قۆنـاغی تاراوگـە لەسـاڵانی ١٩٨٤–٢٠١١ تەرخانکراوە.

## بەشی یەکەم:
## پێگەیشتنی و تێکۆشانی سیاسی تا رووخانی کۆماری کوردستان (١٩٢٤-١٩٤٧):

### یەکەم: پێگەیشتنی و قۆناغەکانی خوێندنی:

ناوی غەنی کوڕی قادر و پاشناوی بلوریانە، ساڵی ١٩٢٤ لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەند، لەگەڕەکی ئەرمەنیانی شاری مەهاباد لەدایك بووە[١]. باوکی بلوریان یەکێك بووە لە دەوڵەمەندەکانی ناوچەی موکریان، ئەندامی ئەنجومەنی شاری مەهاباد بووە، کە بەدوای هاتنی سوپای سۆڤیەتو پاشەکشەی دامودەزگا حکومییەکانی ئێران لەو شارەدا دامەزرابوو[٢].

خێزانی ناوی (مەرزە)یە، لەهاوینی ١٩٥٣دا مارەی کردووە، بەڵام بەهۆی کودەتای ١٩ی ئابی ١٩٥٣و رووخانی حکومەتی مصدق، چوونە نێو ژیانی سیاسیی تەواو نهێنی، بلوریان بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە دەستگیرانەکەی دابڕاوەو پاشان لە ١٩٥٨دا زەماوەندی هاوسەرگیرییان ئەنجامداوە[٣]. هەروەها خێزانەکەی هەر لەسەرەتای ژیانی هاوسەری لەگەڵ بلوریان دووچاری ئازاری دەروونیو ناخۆشی زۆر بووە، ئەوکاتەی بلوریان لەزینداندا بووە، دووکچە دووانەکەی بەناوەکانی (نەشمیلو هێرۆ) لەساڵی ١٩٥٩دا لەدایك بوون[٤].

قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتاییو ناوەندی لە شاری مەهابادو، دواناوەندی لە مەهابادو تاران خوێندووە[٥]. کاتێك کە لە شاری مەهاباد قوتابی بووە لە "دەبیرستانی پەهلەوی"، لەڕێی خوێندنەوەی (گۆڤاری گەلاوێژ)، کە لە ساڵی ١٩٣٨ لەشاری بەغدا دەردەچوو، لەڕێگەی ئەو کەسانەی کە لە مەهابادو دەوروبەریو لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەچوون بۆ عێراقو دەگەڕانەوە، لەگەڵ خۆیاندا ئەو گۆڤارەشیان دەبردەوە ناوخۆی ئێران. لەو سەردەمەدا بوو کە بلوریان لەگەڵ ئەو گۆڤارەدا ئاشنا بووەو فێری خوێندنەوەو نووسینی کوردی بووە[٦]. چونکە خوێندن بەزمانی فارسی بووەو بەهەموو شێوەیەك بە زمانی کوردی خوێندن یاساغ بوو.

پاشان ساڵی ١٩٤٥ بۆ درێژەدان بەخوێندن چوویتە شاری تارانو لە "دانشسرای مقدماتی" دەستی کردووە بە خوێندن[٧]. هەرچەندە لەسەرەتادا باوکی نارازی بووە لە چوونی بۆ خوێندن لە تاران، بەڵام دواتر لەڕێی (قازی

محەمــەد ١٩٠٠-١٩٤٧) قســەی لەگــەڵ کــراوەو ئــەویش ڕەزامەنــدی دەربڕیــوە کوڕەکــەی لــەتاران بخوێنێــت، کــە بلوریــان بــەڵێنی بــە بــاوکی دابــوو لــەوێ لــە قوتابخانەی "کالج" واتە "دەبیرستانی ئەلبورز" خۆی ناوونوس بکاتو بخوێنێت، بەڵام بەڵێنەکەی باوکی شکاندووەو لە "دانشسرای مقدماتی" دەستی کردووە بە خوێندن. ئاشنایەتیشی لەگەڵ "عەبدولڕەحمانی قاسملوو" پەیداکردووە، هەر لەو ماوەیەشــدا بەیەکــەوە ســەردانی (ئیحســان نــوری پاشــا ١٨٩٣-١٩٧٦) یــان کردووە[٨].

بلوریـان لـەتاران زۆر نەمایـەوەو لـە خوێنـدنی ئـەوێ دوورکەوتـەوە، چـونکە لەسـەر فـەرمانی قـازی محەمـەد لـە (١١ی کـانونی یەکـەمی ١٩٤٥) گەڕایـەوە بـۆ مەهاباد بەمەبەستی ناردنی بۆ خوێنـدنی سـەربازی لـە بـاکۆی سـۆڤیەت[٩]. بۆیـە دوای ماوەیەك لە چاوەڕوانی لەلایەن ڕێبەرانی حدکاو کۆماری کوردسـتان لەسـاڵی ١٩٤٦ بۆ خولی ئەفسەریو خوێندنی سەربازی لەگەڵ دەستەیەك خوێندکاری دیکە ڕەوانەی زانکۆی ئەفسەری باکۆ لـە ئازەربایجـانی سـۆڤیەت کـرا[١٠]. بەشـی زۆری ئەوانەشی ناردران کوڕە دەوڵەمەندو کوڕی دەرەبەگـەکان بـوون[١١]. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا هەندێکیان لە کوڕە هەژارەکان بوون، وەك: (کەریمی وەهـابی پـەرویزان، مستەفا شلماشی، سوڵتان وەتەمیشی، حەمیـد خسـروی، محەمـەد داودی، عـەزیز فەرهادی، ڕەحمان گـەرمیانی)، کـە خـەڵکی شـاری مـەهابادو کـوڕی کاسـبکارانو بازرگانـان بـوون[١٢]. نـاردنی بلوریـانیش هـەر لـەخۆوە نـەبووە، لەلایـەك کـوڕە دەوڵەمەندبوو، لەلایەکی تریشەوە هەر لەتەمەنی زوویـی لاوییـەوە تێکـەڵ بـەکاری سیاسی بووبوو.

### دووەم: تێکۆشانی لە سازمانی جەوانانی کورد (١٩٤٢-١٩٤٣):

تەمــەنی لاوی بلوریــان هاوکــات بــووە لەگــەڵ گۆڕانکارییــە مێــژوویيو سیاسییەکانی ئێرانو ڕۆژهەڵاتی کوردستان. بەتایبەتی دوای ئەوەی لەئابی سـاڵی ١٩٤١دا سـوپای سـۆڤیەتو بـەریتانیا هەریەکـەو بەشـێکی ئێرانیـان خسـتە ژێـر دەسەڵاتی خۆیانەوە، بەشی بـاکووری ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان کەوتـە ژێـر دەسـتی ســوپای ســۆڤیەت، ئەمــەش دەرفــەتی لــەباری بــۆ دەســتەبژێری سیاســیو

ڕووناکبیرانی کورد هێنایەکایەوە تا لەو بارودۆخەدا بەرەو بەخەباتی سیاسیو ڕێکخراوەیی بدەن، بەجۆرێك لەنێوان ساڵانی ١٩٤١-١٩٤٦ شاری مەهاباد بوو بە ناوەندی گەشەسەندنی هەستی کوردایەتیو جۆشدانی خەبات بۆ بەدیهێنانی خواستو داواکارییە نەتەوەییەکانی کورد(١٣). ئەم بارودۆخەش کاریگەری گەورەی لەسەر وێستگەی ژیانی سیاسی بلوریان داناو لەو قۆناغەوە تێکۆشانی سیاسی دەستپێکرد.

لەڕاستیدا بلوریان بەرلەوەی تێکەڵ بەکاری سیاسی بێت، لەژێر کاریگەری چەند کەسایەتییەکی دیارو سادەی ئەو سەردەم ئاشنایەتی لەگەڵ مێژووی نەتەوەی کوردو ڕابردوو خەباتی سیاسیی کورد پەیداکردووە. وەك خۆی دەڵێت: "مینەی ئەحمەدی زەینەبی، بەناوبانگ بوو، کوردێکی زۆر ساکارو لەهەمان کاتدا کورد پەروەر بوو زۆر دژی ڕژێمی ئێران بوو، بەشێوەی ساکاری خۆی چ حاڵی نەبوو لە سیاسەت، بەڵام بەهۆی ئەوەی هەستی کوردایەتی هەبوو، دژی ئەو ڕژێمو حکومەتە بوو... وەکو گێڕانەوە باسی سەرکردەکانی کوردو شۆڕشو ڕاپەڕینەکانی کوردی بۆ دەگێڕامەوە... منێکی گەنج کە بەهیچ شێوەیەك نەتێکەڵی کاری سیاسی، نە مەسەلەی میللی (نەتەوایەتی) بووم، نەئاگام لە مێژووی میللەتەکەم بوو، هیچ شتێکم نەدەزانی. ئەو مرۆڤە ئەو شتانەی بۆمن باس دەکردو ئەوە منی دەخستە ژێر کاریگەریو پەرۆشییەوە، بەجۆرێك کە هیدایەتی دەکردم بۆ ڕێبازی فیکرێکی دیاریکراوی میللی، بێئەوەی ئەو بزانێ یان بێ ئەوەی من خۆم هەست بکەم وەکو داستانێك ئەو شتانەی بۆمن دەگێڕایەوە"(١٤).

سەرەتای کاری سیاسیی بلوریان دەگەڕێتەوە تەمەنی هەژدە ساڵی، ئەوکاتەی تێکۆشانی سیاسی لە ڕیزەکانی سازمانی جەوانانی کورد لە ساڵی ١٩٤٢دا دەست پێکردووە. ئاشنابوونی بەڕووداوە مێژووییەکانی کورد هەر لەسەرەتای سەدەی بیستەم تا سەردەمی خۆی، هەروەها خوێندنەوەی گۆڤاری گەلاوێژ، ڕۆژنامەی (ڕێیا تازە)، کە لەلایەن کوردەکانی ئەرمەنستانی سۆڤیەت بەپیتی لاتینی ڕوسی دەردەچوو(١٥)، ئەویان هانداوە تێکەڵ بەکاری سیاسی ببێتو لەگەڵ ژمارەیەك هاوڕێی "سازمانی جەوانانی کورد" لەمەهاباد دابمەزرێنن(١٦). واتە ئەوکاتەی کە خوێندکاری ئامادەیی بووە لە "دەبیرستانی

پەهلەوی" شاری مەهاباد، لەڕێی ئەفسەرانی سوپای سۆڤیەت رۆژنامەی کوردی "ڕێیا تازە"ی پێ گەیشتووەو دوای خوێندنەوەی بابەتەکانی ئەو رۆژنامەیە زانیاری وەرگرتووە لەسەر "سازمانی جەوانانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت"، ئەوەش سەرنجی ئەوی لە دامەزراندنی ڕێکخراوێکی هاوشێوەی ئەوان بۆ لاوانی کورد ڕاکێشاوەو بیرۆکەی دروستکردنی "سازمانی جەوانانی کورد"ی لەلا گەڵاڵە دەبێتو هەوڵەکانی بۆ دامەزراندنی وەها ڕێکخراوێك لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دیکەی دەخاتەگەڕ[١٧]. لەم بارەشەوە بلوریان دەڵێت: "بۆ گەیشتن بەو مەبەستە بانگەوازێکم دەرکرد، بەکورتی دەقەکەی بەمجۆرە بوو: لاوان لەهەموو وڵاتانی جیهاندا ڕێکخراوی تایبەت بەخۆیان هەیە. ئێمەی لاوی کوردیش بۆ ئەوەی بتوانین دەنگی نەتەوەکەمان بۆ گەیشتن بە مافی رەوای بەرز بکەینەوە، پێویستە سازمانێك دامەزرێنین. بۆ ئەم مەبەستە داوا لە گشت لاوانی وڵات دەکەم بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی ئەوتۆ بەهانامەوە بێن"[١٨]. بەڵام جەلیل گادانی ئەمە ڕەت دەکاتەوەو دەڵێ: "لەسەر ئەو بڕوایە نیم کە ئەوکات بەر لە پێکهاتنی ژ.ك (بلوریان) سازمانی جەوانانی پێك هێنابێو ئەم هێزو ڕێکخستنەیان سازکردبێ"[١٩]. بەڵام پێچەوانەی ئەمە، حاجی عەبدوڵڵای قازی لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیوێتی: "غەنی بلوریان کە ئینسانێکی هەڵسووڕ و ئازابوو، بوو بە بەرپرسی ئیتحادییەی جەوانان"[٢٠].

دوای ڕاگەیاندنی دامەزراندنی سازمانی جەوانانی کورد لە ساڵی ١٩٤٢دا، کۆمەڵێك لە لاوانی شاری مەهاباد لە کۆبوونەوەیەکدا، کە لە باغی "میکائیل" لەبناری "ئەشکەوتی نورەدینی" بەستراوە، دەستەی بەڕێوەبەریان بۆ کاروباری ڕێکخراوەکە دیاری کردووە، کە بریتی بوون لە: "بلوریان- عەلی مەولەوی- ئەحمەدی ساڵحیان- قادری مەحمود زادەو عەزیزی فەرهادی"، چونکە بلوریان ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لە دامەزراندنی، کراوە بە بەرپرسی یەکەمی ڕێکخراوەکە[٢١].

سازمانی جەوانانی کورد یانەیەکی لە شاری مەهاباد بۆ کۆبوونەوەو چالاکی کردبۆوە، گرنگییان بەلایەنی خۆ پەروەردەکردنی ڕۆشنبیریو ووناکبیری داوەو گۆڤاری "نیشتمان"و ڕۆژنامەی "ژین"و گۆڤاری "گەلاوێژ" یان خوێندۆتەوە[٢٢].

ڕۆژانی هەینیش لە باغی میکائیل شیعری شاعیران: فایەق بێکەس، قانع، حاجی قادری کۆیی‌و مەلای کۆییان خوێندۆتەوە[٢٣]. هەرچەندە بلوریان‌و هاوڕێکانی لەکاتی دامەزراندنی ڕێکخراوی لاوانی کوردداا، ئەزموونی کاری سیاسی‌و ڕێکخراوەییان نەبوو، تەنانەت بێئەوەی لەمەسەلەی ئایدیۆلۆژی تێبگەن، لەپاڵ وێنەکانی: (شێخ عەبدولقادر، شێخ سەعیدو شێخ مەحمود)، وێنەکانی (لینین، ستالین‌و مارکس)یشیان هەڵواسیوە[٢٤]، بەڵام دواترو لەتێکۆشانی سیاسیی بەردەوامدا گەشەیان بەتواناو لێهاتوویی خۆیانداوەو لەقۆناغەکانی دواتری جووڵانەوەی ئازادیخوازی کوردستاندا، بوون بەکەسایەتی سیاسی‌و دەستەبژێری قۆناغی خۆیان.

جێی باسە مێژووی سازمانی جەوانانی کوردو ڕۆڵی بلوریان‌و هاوڕێکانی لەو ڕێکخراوەدا، لەزۆربەی سەرچاوە مێژووییەکاندا پشتگوێ خراوەو کاتێک باس لە مێژووی ڕێکخراوی لاوان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەکەن، ڕاستەوخۆ باس لە یەکێتی لاوانی حیزبی دیموکرات لە ساڵی ١٩٤٥ دەکەن، بێئەوەی ئاماژە بە بوونی سازمانی جەوانانی کورد درابێت وەکو ڕێکخراوێکی لاوان، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێشترو پاشانیش بووە بە بناغەی دامەزراندنی ڕێکخراوی لاوانی حیزبی دیموکرات لە دواتردا. تەنانەت گادانی کە لاوێکی ئەو سەردەمی نێو ڕووداوەکان بووە جەخت لە دامەزراندنی ڕێکخراوی لاوان دەکاتەوە لەماوەی کۆماری کوردستان ١٩٤٦و نووسیوێتی: "ئەوەی بەرپرس‌و دامەزرێنەری یەکیەتیی لاوانی کوردستان بووە، میرزا عەلی خوسرەوی بووە.....، بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە پێشەوا قازی بوونی شتێکی ئاوای بۆ کوردستانی ئەو ڕۆژەی هەروەك بوونی یەکیەتیی ژنان‌و زۆر ئۆرگانی دیکە بەپێویست زانیوە، فەرمانی کردووە یەکیەتیی لاوان ڕێکخرێ کە ئۆرگانێکی زۆر کارامەو لێهاتوو بووەو عەلی خوسرەویش فەرمانەکەی بەڕێوەبردووەو زۆر چاکیش پێی ڕاگەیشتووە"[٢٥]. کەچی دوای زیاتر لە حەفتا ساڵ لە ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان ئەم ساڵ (٢٠١٥) لە بەیاننامەیەکدا ڕایانگەیاند کە مێژووی دامەزراندنیان دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی دامەزراندنی سازمانی جەوانانی کورد لەساڵی ١٩٤٢ نەك ساڵی ١٩٤٥[٢٦].

هەرچەندە بەڵگەی مێژوویی تەواومان بەردەست نییە بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەو باسە، بەڵام بە وردبوونەوە لە ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانو دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ.ك)، ئەو ڕاستییەمان بۆدەردەخەن کە لاوان ڕێکخراوێکی تایبەت بەخۆیان هەبووبێتو لەچوارچێوەی کۆمەڵەی ژ.ك و پاشان حیزبی دیموکرات خەباتو تێکۆشانیان درێژە پێدابێت.

بەم جۆرە بلوریان تا ساڵی ١٩٤٥ بەردەوام بووە لە ڕێکخراوی لاوانی کۆمەڵەی (ژ.ك)، بەڵام دوای ئەوەی (ژ.ك) بوو بە حیزبی دیموکراتی کوردستان (حدك) لە (١٦ی ئابی ١٩٤٥)دا، ڕێکخراوی لاوانی (ژ.ك)یش بوو بەڕێکخراوی لاوانی (حدك)، لەو کاتەشدا بلوریان بۆمەبەستی خوێندن چووبوو بۆ شاری تارانو پاشانیش باکۆو بەرپرسیاریەتی ڕێکخراوەکەش کەوتە ئەستۆی (ڕەحیمی خەڕازی)و دواتریش (میرزای خوسرەوی)[٢٧] .

## سێیەم: ئەندام بوونو تێکۆشانی سیاسی لە کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (ژ.ك)و حیزبی دیموکراتی کوردستان (حدك)دا (١٩٤٤-١٩٤٧):

بلوریان لەساڵی ١٩٤٤دا بووە بە ئەندامی (ژ.ك)، کاتێك کە ڕێبەرایەتی ئەو ڕێکخراوە داوا لە "سازمانی جەوانانی کورد" دەکات، کە ببنە ئەندامیان. بلوریانو چەند هاوڕێیەکی بەنوێنەرایەتی سازمانی جەوانان دیاریکران بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ڕێبەرایەتی (ژ.ك)و داواکاری بە ئەندام بوونیان. پاشان بەکۆی دەنگی ئەندامانی سازمانی جەوانان ڕەزامەندییان لەسەر بەئەندام بوون لە (ژ.ك) ڕاگەیاند و لە ساڵی ١٩٤٤دا ناوی "سازمانی جەوانانی کورد" گۆڕدراو بوو بە "ڕێکخراوی لاوانی کۆمەڵەی ژ.ك"[٢٨]. بەمەش بلوریان بوو بە ئەندامی (ژ.ك)و بەناوی نهێنی (مێدیا) لەدەستەی لاوانی (ژ.ك)دا[٢٩]، درێژەی بەخەباتو تێکۆشانی سیاسی داوە.

بلوریان بە نوێنەرایەتی ڕێکخراوی لاوان، بەشداری کۆبوونەوەی ڕێبەرایەتی (ژ.ك)ی کردووە[٣٠]. هەروەها بەرپرسی ڕێکخراوی لاوانی (ژ.ك) بووە[٣١] . جگەلەمەش لەسەر داوای (قازی محەمەد)، شەوانەو بەنۆرە لەگەڵ هاوڕێکانی پاسەوانییان لە چاپخانەی کۆمەڵە کردووە[٣٢]. تەنانەت لای قازی محەمەد جێی

بایەخ بووە، وەك گادانی دەڵێ: "غەنی لەکاتی خۆیدا لاوێکی بەهەستو هەڵسوورِ بووە گومان نییە، هەرلەبەرئەوەش بووە قازی محەمەد پێی گوتووە ناپلیۆن"[٣٣]. هەروەها گەشەی بەکاری سیاسیو پەروەردەی حیزبی داوەو بۆ ئەم مەبەستەش هاریکاریو ڕێنوێنی کراوە، بۆ وێنە: لەسەر فەرمانی قازی محەمەد بلوریان دەچووە لای (میرحاج ئەحمەد ١٩١١–١٩٩٨)و (مستەفا خۆشناو ١٩١٢–١٩٤٧)، کە دوو ئەفسەری کوردی خەڵکی باشووری کوردستان بوونو بەنوێنەرایەتی حیزبی هیوا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانو لە شاری مەهاباد نیشتەجێ بووبوون، بۆ ئەوەی یارمەتی بدەنو زانیاری پێ بدەنو وەك کادیرێکی سیاسی فێری بکەن[٣٤]. میرحاج دەربارەی بارودۆخی جیهانو چۆنیەتی مەسەلەی سۆسیالیزمو سەرمایەداری جیهانی قسەی بۆ کردووەو مستەفا خۆشناویش، کە لە قوتابخانە خوێندنی کوردی فێردەکردن، لەمەڕ مەسەلەی نەتەوایەتیو ژێردەستەیی کوردی بۆ باسکردووە[٣٥]. جگەلەمەش سەرۆکی (ژ.ك) داوای لێکردووە بچێتە لای سکرتێری کۆمەڵە (دڵشاد ڕەسوڵی)و لە نووسینو بڵاوکردنەوەی نامەو ڕاگەیەندراوەکاندا بۆ کۆمیتەکانی کۆمەڵە لە شاری مەهابادو دەوروبەریدا هاریکاری دڵشادو (عەبدولڕەحمانی زەبیحی) بکات[٣٦]. بەم هۆیەشەوە زیاتر بەکاری سیاسیو ڕێکخراوەیی لەو قۆناغەدا ئاشنابووەو ئەمەش کاریگەری ئەرێنییان بەسەر پەروەردەو هۆشیاریی سیاسیی ئەو داناوە لەداهاتوودا.

بلوریان بەشداریو ڕۆڵی گرنگی بینیوە لە چالاکییەکانی (ژ.ك)دا، بۆ وێنە: کاتێك کە لەلایەن سەرکردایەتی (ژ.ك)ەوە ڕێکخراوی لاوان ڕاسپێردرا بۆ ئامادەکاریو پێشکەشکردنی شانۆگەری "دایکی نیشتیمان[٣٧] "، بلوریانیش یەکێك بوو لەو لاوانەی زۆر بە پەرۆشەوە کاری تێداکردو تەنانەت ڕۆڵیشی تێدا بینیوە[٣٨]، کە لەمانگی ئاداری ١٩٤٥ لەشاری مەهاباد نمایشکرا[٣٩]. بلوریان ڕۆڵی کاراکتەری نوێنەری ئێرانو سەرۆك کۆماری لە شانۆگەری دایکی نیشتماندا گێڕاوە[٤٠]. هەرچەندە لەگەڵ هاوڕێکانی لەسەر ئامادەکاری بۆ نمایشی شانۆگەری "دایکی نیشتیمان" لەلایەن باوکو بنەماڵەکانیانەوە تووشی هەڕەشەو نیگەرانی بوونەتەوە، ئەمەش بەهۆی دابو نەریتی کۆمەڵایەتی کە نمایشی شانۆیی وەك کارێکی سووکو نالەبار سەیرکراوە، تەنانەت بلوریان بەهۆی هەڵوێستی توندی

باوکی لەماڵەوەش دەرکراوە، بەڵام دواجار لەلایەن "قازی محەمەد"، کە وەك کەسایەتییەکی دیاری مەهاباد ڕێزی لێگیراوە، باوکی بلوریانو کەسوکاری هاوڕێکانی دڵنیا کراونەتەوە کە ئەوە کارێکی نیشتیمانیو نەتەوەییەو ڕۆڵەکانیان ئەرکێکی پیرۆزیان کردووە، بەمجۆرە لەبۆچوونی پێشوویان لەسەر بەشداری نەکردنیان لەو شانۆگەرییە پاشگەزیان دەکاتەوە[٤١]. بۆیە دەبینین بلوریان ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە ئامادەکردنو دەرهێنانی ئەو شانۆگەرییەدا[٤٢].کارگێڕو بەڕێوەبەری شانۆگەرییەکە بلوریانو عەبدوڵلای نەهری بوون، هەروەها کاری چاپەمەنیو لەچاپدانی پلیت بۆ شانۆگەرییەکە لەگەڵ دڵشادی ڕەسوڵی لەچاپخانەی کۆمەڵەی (ژ.ك) کراوە[٤٣].

نمایشی شانۆگەری "دایکی نیشتیمان" نزیك بە چل ڕۆژ لە شاری مەهاباد پیشاندراوەو زۆربەی دانیشتوانی مەهابادو دەوروبەری ئەو نمایشەیان دیتووە. پاشان لە شاری نەغەدەو دوایش لەمانگی تەمووزی ١٩٤٥ لە شاری شنۆ نمایشکراوەو کاریگەری خستە دڵی خەڵك و هاندانیان بۆ بە ئەندامبوون لە (ژ.ك)دا[٤٤]. ویلیام ئێگڵتۆن لە باسی نمایشی شانۆگەری دایکی نیشتماندا نووسیویەتی کەوا لە ئاداری ١٩٤٥دا لە مەهاباد پێشکەشکراوەو تەواوی خەڵکی مەهاباد دیویانە، پاش چەند مانگ، لە تەمووزی ١٩٤٥دا لە شاری شنۆ نمایشکراوە[٤٥]. سەبارەت بەگرنگیو بایەخی ئەو شانۆگەرییەش لەو سەردەمدا، قاسملوو دەڵێت: " نەخشی شانۆ لەو قۆناغەدا زۆر گرینگ بووە، چونکە خەڵکی نەخوێندەوار لە شانۆ حاڵی دەبوون، لەکاتێکدا نەیاندەتوانی چاپەمەنیو بڵاوکراوەکان بخوێننەوە. بەتایبەتی ئەگەر سەرنج بدەین کە ٩٠٪ی خەڵك لەوکاتەدا نەخوێندەواربوون، ئەمجار گرینگی شانۆی کوردی زیاتر بەرچاو دەکەوێ"[٤٦].

دوای ئەوەی (ژ.ك) بوو بە حیزبی دیموکراتی کوردستان (حدك) لە (١٦ی ئابی ١٩٤٥)و پاشان ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد لە (٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦)دا. بلوریان لەو ڕێوڕەسمەدا بەشداری کردووەو وەکو قوتابییەکی قوتابخانە لەگەڵ هاوپۆلەکانی ئەو لەپێشیانەوە ئاڵای کوردستانی بەدەستەوە گرتووەو بەڕیز بە بەردەم سەرۆك کۆماری کوردستان "پێشەوا قازی محەمەد"دا

ڕۆیشتوون[٤٧]. دواتریش وەك كادیرێكی حیزبی دیموكرات لەماوەی كۆماری كوردستان لە مەهاباد كاری حیزبیو تێكۆشانی سیاسی كردووەو هەربۆیەش ساڵی ١٩٤٦ لەلایەن حیزبی دیموكراتەوە لەگەڵ چەند كەسی تر بۆ خوێندنی سەربازی، ماوەی یانزە مانگ ڕەوانەی یەكێتی سۆڤیەت كرا[٤٨].

ئەمەش دوای ئەوەبوو كاتێك قازی محەمەدو چەند كەسێكی دیكە لە ئەندامانی ڕێبەری (حدك) بۆ جاری دووەم لە ئەیلوولی ١٩٤٥ چوون بۆ باكۆ و لەوێ داوایان لە یەكێتی سۆڤیەت ئەوەبووە پشتیوانی لە كورد بكا، بۆیە (جەعفەر باقرۆڤ/ سەرۆك وەزیرانی ئەودەمی ئازەربایجانی یەكێتی سۆڤیەت) وێڕای چەند هاوكارییەك لە پێدانی چەك، بەڵێنیشی پێدابوون كە هەندێك لە لاوانی كوردستان بەرن بۆ یەكێتی سۆڤیەتو لە كاروباری سوپایی پەروەردەیان بكەن، تا لەدواڕۆژدا بتوانن بەڕێوەبەری سوپای میللی كوردستان بەئەستۆ بگرن[٤٩]. ئەم بەڵێنەش جێبەجێ كراو لە نیسانی ١٩٤٦دا شەست لاوی كوردستان بۆ خوێندنی سەربازی نێردرانە باكۆی ئازەربایجانی یەكێتی سۆڤیەت[٥٠]. یەك لەو لاوانەش بلوریان بوو، كە لەوێ لەزانكۆی پیادە بەناوی (پێخودنی ئوچیلیشی/ Pekhodni Uchilishi)و لەبەشی (هاوەن) دەستی بەخوێندنو مەشقی سەربازی كردووە. هەرچەندە زۆری هەوڵداوە بۆ ئەوەی لەبەشی فڕۆكەوانی بخوێنێت، بەڵام ڕوسەكان گوێیان لەداواكەی نەگرتووەو لەبەشی هاوەن دایاننـاوەو بەشێوەیەكی خێراو چڕوپڕ وانەكانی: (مەشقی سەربازیو چەك ناسی)، (تاكتیكی شەڕ)و (تیۆری سیاسەت) یان پێ وتراوە. مامۆستاكانیان سەرجەمیان ئەفسەری سیاسیو ئەندامی حیزبی كۆمۆنیستی سۆڤیەت بوون، كە باسی سیاسەتیان بۆ كردوونو لەمەڕ حكومەتەكانی سەرمایەداریو سیستمی كۆلۆنیالیستیو ئیمپریالیستی دواونو چۆنیەتی سیستمی سۆسیالیستیان بۆ شیكردوونەتەوە[٥١]. لەم بارەیەوە بلوریان دەڵێ: "منی گەنج بە هەموو وجودمەوە ئەو گوتنانەمان دەخستە نێو مێشكمو هەرچەند زۆر شارەزای ئەو سیستمانە نەبووم، بەڵام خۆم بەلایەنگری ئینترناسیۆنالی سۆسیالیستی دەزانی"[٥٢]. بەتەواوكردنی خوێندنی سەربازی لە باكۆ، بووە بە ئەفسەری یەك ئەستێرە[٥٣].

دوای تـەواوکردنی خوێنـدنی ڕاهێنـانی سـەربازی لـە سـۆڤیەتو بەرلـەوەی بگەڕێتـەوە بـۆ کوردسـتان، هـەواڵی گەڕانـەوەی سـوپای ئێـران بـۆ کوردسـتانو پاشەکشـەی سـوپای سـۆڤیەتو کۆتـاییو رووخـانی کۆمـاری کوردسـتانی بیستووە[٥٤]. بەم هەلومەرجە دژوارەش زۆر نیگـەران بـووەو بـەهۆی ڕووداوەکـانی کوردسـتان خواسـتی بـووە لـە سـۆڤیەت بمینێتـەوەو خوێنـدنی (ڕۆژهەڵاتناسـی) بخوێنێ[٥٥]، بەڵام بـێ خواسـتی خۆیـان لـە ئـاداری ١٩٤٧دا پێیـان ڕاگەیەنـدرا کـە ڕەوانەی ئێران دەکرێنەوە[٥٦]. بۆیە ساڵی ١٩٤٧ گەیشتەوە شاری مەهاباد[٥٧].

دوای گەڕانەوەی لە باکۆ بـۆ مـەهابادو پـاش لـە سـێدارەدانی پێشـەوا قـازی محەمەدو هاوەڵانی لـە (٣١ی ئـاداری ١٩٤٧)دا، بلوریـان دەچـێتەوە شـاری تـاران بەمەبەستی درێژەدان بە خوێندن. سەرەتا هەوڵدەدات لە (شەهری رەی) تاران لـە (دەبیرستانی بازرگـانی) بخوێنـێ، بـەڵام وێـڕای هـەوڵی زۆری بـەهۆی کوردبـوونی وەرناگیرێ، پاشان بـیر لەوەدەکاتـەوە بچـێتە زانکـۆی ئەفسـەری سـوپای ئێـران، بەڵام لەوێش بەهۆی پێشینەی خوێندنی سەربازی لە سۆڤیەتو رابردووی سیاسی، وەرگرتنـی ڕەتدەکرێتـەوە. لـەو کاتەشـدا بـاوکی کۆچـی دوایـی دەکـات، بەمـەش بڕیاری گەڕانەوە بۆ مەهاباد دەدات، تا دیسان خەباتو تێکۆشانی سیاسی دەست پێ بکاتەوە[٥٨].

## بەشی دووەم:
## تێکۆشانی سیاسی لەنێوان ساڵانی ١٩٤٨-١٩٧٨دا:

**یەکەم: ڕۆڵی لە دامەزراندنەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان (حدك)-(١٩٤٨-١٩٥٨):**

پاش تێکچوونی کۆماری کوردستان شتێك بەناوی ڕێکخستنەکانی حیزبی دیموکرات نەمابوو، بەڵام ساڵێك پاش لەسێدارەدانی قازی محەمەد، لاوانی ناوچەی مەهاباد چالاکیی سیاسییان دەست پێکردەوەو پێوەندییان پێکەوەگرتو یەکەم ڕێکخراوەکانی حیزبی دیموکراتیان زیندوو کردەوە[٥٩]. کاتێك کە لەماڵی بلوریان لەسەرەتای ئاداری ١٩٤٨ لەگەڵ (محەمەد شاپەسندی)، (قادری مەحمود زادە)و (عەزیزی فەرهادی)و چەند کەسی دیکە کۆبوونەوەیەك دەکەنو شانەی حیزبی دروست دەکەنەوەو بڕیاری زیندووکردنەوەی (حدك) دەدەن، سەرەتاش هەوڵ دەدەن یارمەتی بۆ چاپو بڵاوکردنەوە لە حیزبی تودە وەرگرن، تا هاوکارییان بکات بەیاننامەیەك بەزمانی کوردی چاپو بڵاوبکەنەوەو تێیدا بڵێن: "حیزبی دیموکرات نەمردووەو زیندووەو بۆ وەدەستهێنانی ئامانجەکانی گەلی کورد درێژە بەخەبات دەدات"[٦٠]، بەڵام ئەوان ڕەتی دەکەنەوە[٦١]. پاش ئەوەی لە حیزبی تودە نائومێد دەبن، بلوریانو محەمەدی شاپەسندی لە ٢١ی ئاداری ١٩٤٨، دەچن بۆ باشووری کوردستان تا یارمەتیو هاوکاری لە پارتی دیموکراتی کوردستان (پ.د.ك) وەرگرن[٦٢].

لەباشووری کوردستانو لەشاری سلێمانی دەچنە لای (شێخ لەتیف ١٩١٧-١٩٧٢) کوڕی شێخ مەحمودو ئەویش دەیاننێرێ بۆ (گوندی سیتەك[٦٣])و لەوێ نیشتەجێ دەبن، لەوێش لەگەڵ (حەسەنی قزڵجی)و (عەبدولرەحمانی زەبیحی) شاد دەبنەوەو مەسەلەی هاوکاری بۆ زیندووکردنەوەی (حدکا) باس دەکەن، پاشان بەهۆی هاوکاریو کارئاسانی شێخ لەتیف چاپخانەیەك دروست دەکەنو بڕیاردەدەن گۆڤارێك بەناوی (ڕێگا) چاپو بڵاوبکەنەوە لەژێر ناوی (ئۆرگانی کۆمەڵەی ژیانی کورد)[٦٤] . لەم بارەشەوە بلوریان دەڵێت: "هۆی ئەوەی کە لەو قۆناغەدا ڕۆژنامەی کوردستانمان دەرنەکرد و ڕێگامان بۆ ئەو قۆناغە هەڵبژاردو ناوی ئۆرگانی کۆمەڵەی ژیانی کوردمان لەسەر دانا، ئەوە بوو کە دوژمن وریا

نەبێتەوەو دیسان دژی کۆنە دیموکراتەکان رانەپەڕێو خەڵك تووشی گێروگرفت نەکا. رامان ئەوە بوو، کە پاش بەردەوامبوونی خەبات ئینجا بگەڕێینەوە سەر کوردستان (مەبەستی ڕۆژنامەی کوردستان/ ئۆرگانی حدك)و ئەو چاپ بکەینەوەو لەناوی حیزبی دیموکراتیش کەڵك وەرگرین"[٦٥].

گۆڤاری (ڕێگا) لە پایزی ١٩٤٨ چاپکراو، تێیدا بلوریان وتارێکی بەزمانی کوردی بەنازناوی "تەیمور" نووسیوە[٦٦]. دوای چاپکردنیشی بەیارمەتی "هەمزە عەبدوڵڵا ١٩٠٤-١٩٩٨" (سکرتێری ئەوکاتی پارتی) گەڕایەوە مەهاباد[٦٧]، لە ٢١ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٨دا[٦٨]. بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (ڕێگا) لەسەرەتای زستانی ١٩٤٨دا لەناوچەی موکریان بەگشتیو شاری مەهاباد بەتایبەتی، بوو بەهۆی بەئاگاهێنانەوەی دەزگاکانی ئاسایشو پۆلیس، کە دەستیانکرد بەڕەشبگیری خەڵكو لێپرسینەوەیان[٦٩]. لەوشاڵاوی گرتنەشدا بلوریانو چەند هاوڕێو هاوبیرێکی دەستگیرکرانو دووچاری لێپرسینەوەو ئازارو ئەشکەنجە بوونەوە[٧٠]، چونکە گۆڤاری (ڕێگا) درێژەپێدانی خەباتی حیزبی دیموکراتی لەبەرچاو بوو وخەڵکی بەرەو تێکۆشان هان دەدا، دەرچوونی (ڕێگا) شوێنێکی باشی لەسەر لاوانی کورد دانا[٧١]. کە بەهۆیەوە کادیرە چالاکەکانی حدك توانییان بانگەشە بۆ هزری ئازادیخوازییان بکەن لە نێو جەماوەری کورد لە کوردستاندا[٧٢].

هەرچەندە بلوریان لەقۆناغی یەکەمی دادگاییکردنیدا بە سێ ساڵ زیندانی کردن حوکمدرابوو، بەڵام دوای شەش مانگ مانەوەی لەزیندانو بەهاوکاری (رەحمەتی شافعی)، کە ئاشناو دۆستی (سەرهەنگ ئەمیر دیوانی) سەرۆکی دادگابوو، لەقۆناغی دووەمی دادگاییو پێداچوونەوە بە حوکمەکەی ئازادکرا[٧٣]. بەڵام زۆری نەخایاند چالاکییەکانی (حدك) ڕاوەستا، ئەمەش لەئەنجامی ئەو چاودێرییە توندانەی کە دەسەڵاتی شا خستیە سەر کوردستان دوابەدوای هەوڵی کوشتنی شا لە زانکۆی تاران لە شوباتی ١٩٤٩دا، هەروەها دەستیانکرد بەڕاوەدوونانی ئەندامانی حدكو ژمارەیەکیان دەستگیرکردن[٧٤]. ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر بلوریانو جارێکی دیکە دەستگیرکرایەوە، هەرچەندە ماوەیەکی کەم بوو لە زیندان ئازادکرابوو، بەڵام هەوڵی کوشتنی شا لەلایەکو

لەلایەکی دیکەش بەهۆی ئەوەی ناوی بۆ سەربازی لە سوپای ئێران داواکراوبوو، ڕادەستی سەربازخانە کراو ماوەیەك لەسەربازخانەی مەهاباد بوو، پاشان گوازرایەوە بۆ سەربازخانەی سەردەشت. لەوێش بەتاوانی بوونی پەیوەندی لەگەڵ عەشایری ناوچەکە، ڕەوانەی زیندانی سەربازخانەی مەهابادو پاشان زیندانی سەربازخانەی تەورێزو سەرەنجام لەزیندانی سەربازخانەی ورمێ نزیك بەساڵێك (١٩٤٩–١٩٥٠) زیندانی کرا، پاشان بەرگەی تەواوکردنی سەربازی پێ دراو لە پوشپەڕی ١٩٥٠دا ئازادکرایەوە[٧٥]. بەڵام بەتوندی خرایە ژێر چاودێری حکومەتەوە، بۆیە بەناچاری بڕیاری چوونەوە بۆ سۆڤیەت دەدات، بەڵام لەسەر سنووری ئێران–سۆڤیەت (بیلەسەواری ئەردەوێل) لەلایەن ژاندارمەری دەستگیرکرایەوە[٧٦]، بۆ ماوەی شەش مانگ لە تاران زیندانی کرا، بەڵام دوای مانگرتنی لە خواردن ئازادکرا[٧٧]. دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ مەهابادو لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە: (ڕەحیمی سوڵتانیان، کەریمی وەیسی، ڕەحیمی خەرازی، عەزیزی حیسامیو عەبدوڵڵای ئیسحاقی)، لە کۆمیتەی (حدکا) لە شاری مەهاباد درێژەیان بەخەباتو تێکۆشانی سیاسی داوە[٧٨]. لەنێو ڕێبەرایەتی حیزبی دیموکراتدا، بلوریان بەرپرسی پەیوەندی لەگەڵ شارەکانی سەردەشت و سنە بووە[٧٩].

بلوریان وەکو ئەندامی ڕێبەری (حدك) کاروچالاکییە سیاسییەکانی لەوقۆناغدا بریتی بوون لەوەی کە چالاکانە بەشداری خۆپیشاندان و ڕووداوەکانی قۆناغی دەسەڵاتداریەتی مصدق لە (١٩٥١–١٩٥٣)دا کردووە، بۆ وێنە: ساڵی ١٩٥١ بەبۆنەی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران خۆپیشاندانێکیان لە شاری مەهاباد ڕێکخستووە[٨٠]. هەروەها لە ١ی ئایاری ١٩٥٢دا بە بۆنەی جەژنی کرێکاران کۆبوونەوەیەکی نیوە ئاشکراو نهێنییان لە مەهاباد پێکهێناو تیایدا باسی ڕۆژی جیهانی کرێکاران و مەسەلەی دەستتێوەردانی بەریتانیا لە کاروباری ناوخۆی ئێرانو مافی زەحمەتکێشان قسەیان بۆ ئامادەبووان کردووە. پاش خۆپیشاندانیان بۆ خۆماڵیکردنی نەوت، ئەوە یەکەم کۆبوونەوەی سیاسی ئەوان بوو، کە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان بەڕێوەچوو[٨١]. جگە لەمانەش ڕۆڵی بینیوە بۆ دەستەبەرکردنی مافی جووتیاران لە ڕاپەڕینی جووتیارانی ناوچەی بۆکان لەساڵی ١٩٥٢دا[٨٢]. چالاکانەش بەشداری لە ڕاپرسی ١٩٥٣ بۆ

هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی ئێران (مەجلیسی شازدە)دا کردووە، ئەوکاتە بەرپرسی ڕێکخراوی ژنان بووە لە مەهاباد، کە بۆیەکەم جاربوو ژنان، هەرچەندە مافی دەنگدانیشیان نەبووە، بەڵام چالاکانە بەشداری خۆپیشاندانی مەهابادیان لە ١٩٥٣دا کردووە بۆ پشتیوانی لە دەنگدان بە بەڵێ لە راپرسی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی ئێراندا[٨٣]. سەبارەت بەم قۆناغەی تێکۆشانی سیاسیی بلوریان، کریس کۆچێرا نووسیویێتی: "لەساڵی ١٩٥١دا مصدق دەسەڵاتی گرتەدەست، حیزبی دیموکراتی کوردستان سوودی لە کەش و هەوای تا رادەیەك ئازادی ئەو سەردەمەی ئێران وەرگرتو بەرێبەری عەزیز یوسفیو غەنی بلوریان هەندێك بووژایەوەو رەونەقی پەیداکردەوە"[٨٤].

بلوریان لەساڵی ١٩٥١ بەدواوە لەرێی هاوکاریو پەیوەندی پێوەگرتن بە حیزبی تودەوە لەگەڵیان ئاشنابووە، کە حیزبی تودە لەرێی ناردنی کادیری باڵا بۆ کوردستان بۆ رێنماییو هاوکاریکردنی ڕێبەرایەتی حیزبی دیموکرات هاوکاریکردوون[٨٥]. بۆیە لە هەڵبژاردنی (مەجلیسی حەڤدە)ی پەرلەمانی ئێراندا، کادیرەکانی حدك رۆڵی گرنگیان بۆ سەرخستنی نوێنەری حیزبی تودە لە مەهاباد، کە (سارمەدینی سادق وەزیری) بوو گێڕا، چونکە ئەوکات حیزبی دیموکرات تێکۆشانی ئاشکرای نەبوو و نەیدەتوانی پاڵێوراوی فەرمی هەبێ، بەڵام سارمەدینی سادق وەزیری بەکردەوە پاڵێوراوی حدك بوو[٨٦]، لەو پێناوەشدابوو کە بلوریان بڕیاری دامەزراندنی ڕێکخراوێك بەناوی (ڕێکخراوی پارێزەرانی بەرگرب کردن لە ئازادیی هەڵبژاردن) یان ڕاگەیاندو لەژێر فەرمانو بڕیارەکانی مصدق دا، توانییان ڕەزامەندی فەرمانداری مەهاباد بۆ ئەم مەبەستە بەدەست بهێنن[٨٧]. هەرچەندە لەو هەڵبژاردنەدا ئەندامو لایەنگرانی حدك لە مەهاباد ٨٠ بۆ ٩٠٪ی دەنگەکانیان بەدەست هێنا، بەڵام دەسەڵاتدارانی ناوەند ئەنجامەکانی ئەم هەڵبژاردنەیان هەڵوەشاندەوەو نوێنەرێکیان لە تارانەوە دیاریکرد بۆ مەهاباد[٨٨].

بەهۆی ئەو بارودۆخە سیاسییەی لە ئێراندا هاتبووە ئاراوە، بەتایبەتی ساڵی ١٩٥٣ کاتێك شا هەڵاتو ئێرانی جێهێشت، لە شارەکانی مەهاباد، سەردەشت، سەقز و نەغەدە و ناوچەکانی دیکەی کوردستان خۆنیشاندانی شادومانی خەڵك کراو ڕێبەرایەتی حدك و ڕێکخستنەکانیان ڕۆڵی گرنگیان تێدا بینین. هێمن

موکریانی شاعیر لەوکاتەدا بوو شیعرە بەناوبانگەکەی خوێندەوە:"دەبڕۆ ئەی شاهی خاین بەغدا نیوەی ڕێیەت بێ"[٨٩]. بەڵام ئەم بارودۆخە زۆری نەخایاند، بەهۆی کودەتای (١٩ی ئابی ١٩٥٣)، کە بووە هۆی ڕووخانی حکومەتی مصدقو گەڕانەوەی شا بۆسەر دەسەڵات، ژیانی سیاسی چووە بارێکی تەواو نهێنی[٩٠]، هەربۆیەش بلوریان بۆ خۆپارێزیی زیاتر لەگەڵ چەند کادیرێکی دیکەی حیزبی، شاری مەهابادی جێهێشتو چوو بۆ ناوچەی مەنگوڕان. بەم جۆرە نزیك بە دوو ساڵ لە ناوچەکانی مەنگوڕ، گەورك، سوسینایەتیو دەوروبەری بانە درێژەی بەکارو خەباتی حیزبی داوە[٩١]. هەر لەوماوەیەدا بلوریان (١٩٥٣) بە نوێنەرایەتی (حدك) چووە بۆ باشووری کوردستانو یارمەتی ماددی لە پارتی دیموکراتی کوردستان (پ.د.ك) وەرگرتووەو بۆ ڕێبەرایەتی حیزبی ناردووە[٩٢].

لەو قۆناغە نهێنییەی خەباتدا، بلوریان لەگەڵ قاسملوو، عەزیز یوسفی و سەدیقی هەنجیری ئازەر بیر لە چاپکردنەوەی خولی دووەمی ڕۆژنامەی (کوردستان) دەکەنەوە، کە یەکەم ژمارەیان لە تەوریز لە ٢٥ی نیسانی ١٩٥٤دا بڵاوکردەوە[٩٣]. بلوریان بەزمانی کوردی وتاری تێدا نووسیوەو وتارە فارسییەکانیشی کردووە بە کوردی[٩٤]. هەرچەندە پاش کودەتای ٢٨ی گەلاوێژ (١٩ی ئابی ١٩٥٣) زۆربەی ڕێبەرانو ئەندامانی حدك گیران، بەڵام دەبینین دوای ئەم ڕووداوەو بەکەمتر لەساڵێك، خەباتو تێکۆشانی کادیرەکانی پتەوتر و ڕێکوپێکتر بووە. بۆیەکەم جاربوو پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان ڕۆژنامەی (کوردستان) (ئۆرگانی ناوەندی حدك) بەنهێنی دەرچوو و لە سەرانسەری کوردستاندا بڵاوکرایەوە[٩٥]. لەڕاستیدا ڕۆژنامەی (کوردستان) لەم قۆناغەدا وەکو ئۆرگانی حدك (پێنج[٩٦]) ژمارەی لێ چاپو بڵاوکرایەوە، بەڵام بەهۆی ئاشکرابوونو گیرانی چاپخانەی فرقەی دیموکرات ڕۆژنامەی (کوردستان)یش لەساڵی ١٩٥٤ وەستا[٩٧].

دوای ئەم ڕووداوانە ڕێبەرانی (حدك) کۆمیتەیەکی ڕێکخستنیان بەناوی کۆمیتەی کوردستان پێکهێناو لەناوچەی سنەش ڕێکخراوەکانی حیزبیان دامەزراند[٩٨]. هەروەها بلوریان لەگەڵ ڕێبەرانی دیکەی حدك لەنیوەی دووەمی بەهاری ١٩٥٥ لەناوچەی سەری مەیدان (مەهاباد)، بە بەشداری ژمارەیەك ئەندامی

حیزبی، کۆنفرانسی یەکەمی حدك–یان بەست، کە تیایدا جگە لە بڕیاری پچڕاندنی پەیوەندی ڕێکخستنیان لەگەڵ حیزبی تودە[٩٩]، ڕێبەرایەتییەکی پێنج کەسیش بۆ بەڕێوەبردنی حدك پێکهێنرا، کە بلوریان یەکێکیان بوو[١٠٠]. دوای ئەمە لە ئابی ١٩٥٥دا لەجێی ئەحمەد تۆفیق ئەرکی بەرپرسیاریەتی کۆمیتەی (حدك)ی لەشاری سنە وەرگرتووە، لەوێش بەنازناوی نهێنی "موحسینی پەرتەوی" خۆی ناساندووەو تێکۆشانی سیاسی درێژە پێداوە[١٠١]. بەڵام دوای ماوەیەکی کەم لە مانەوەی لە سنە، ئێوارەی ڕۆژی شەممە (٢٢ی تشرینی یەکەمی١٩٥٥) دەستگیر کراو دوای شەش مانگ زیندانیکردنی لەوێ، گواسترایەوە بۆ زیندانی شاری مەهاباد. لەوێش سەرەتا تووشی ئازاردانو ناخۆشی زۆر بۆوەو نزیك بە ساڵێك لە زیندانی دژبانی مەهابادو زیندانی سەربازخانەی مەهاباد بەدەستو پێ زنجیرکراوی مایەوە. پاشان لە دادگادا بە سێ ساڵ زیندانی مەحکوم کراو ڕەوانەی زیندانی تەورێز کراوە تا لە ٨ی تشرینی یەکەمی١٩٥٨ ئازادکرا، بەڵام بەو مەرجەی لە شاری مەهاباد نەچێتە دەرەوەو هاتوچۆی شوێنانی دی نەکات[١٠٢].

لەڕاستیدا لەم کاتەدابوو کە شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ لە عێراق ڕوویداو بووە هۆی هاتنە سەرکاری دەسەڵاتی کۆماریو گۆڕانی گەورە لە عێراقدا، هاوکات کاریگەری ئەرێنی کردە سەر خەباتی ئازادیخوازی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، بەجۆرێك کە ڕادیۆو ڕۆژنامەکانی عێراق بە ئاشکرا خەڵکی ئێرانو بەتایبەت کوردیان بۆ ڕاپەڕین بەدژی دەسەڵاتی شا هان دەدا، کە ئەمەش زەمینەی خەباتو تێکۆشانی سیاسی زیاتری بۆ ڕێکخستنەکانی حدك پێکهێنا. ئەوە جگە لەوەی عێراق ببوو بە پەناگە بۆ تێکۆشەرانی حدكو کە هەرکاتێك هەستیان بەمەترسی گیران کردبایە، پەنایان دەبردە بەرباشووری کوردستانو لە عێراق داڵدە دەدران[١٠٣].

بۆیە بلوریان دوای ئازادبوونی لە زیندان لە ساڵی ١٩٥٨ تا ساڵی ١٩٥٩ زۆر بەنهێنی کاری حیزبی دەست پێکردەوە[١٠٤]، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانێ بچێتە دەرەوەی شاری مەهابادو درێژە بەکاری سیاسیو حیزبی بدات، کاری "چێودار"ی هەڵبژارد، هەم بۆ بژێویی ژیانو هەمیش تا بەهۆیەوە بتوانێت بچێتە دەرەوەی شاری مەهابادو بەناوی چێوداریو کڕینی (وڵاغ)، کاری حیزبیو سیاسی

خۆشی ئەنجام بدات[١٠٥]. هەرچەندە لەو ماوەیەدا سووربووە بە درێـژەدان بـەکارو تێکۆشانی سیاسی، بـەڵام ئـەو ماوەیـەش زۆر ناخایـەنێ و جـارێکی تـر دەسـتگیر دەکرێتەوە و بۆ ماوەی نزیك بە بیست ساڵ لەزینداندا مایەوە.

**دووەم: قۆناغی ژیانی زیندانی سیاسی**
**(لەپایزی ١٩٥٩ تا پایزی ١٩٧٨):**

لـەنێوان سـاڵانی ١٩٤٨ بـۆ ١٩٥٨ چـەندین جـار لەلایـەن حکومـەتی ئێـران دەستگیرکراوەو ئازادبووە[١٠٦]، لـەم دە ساڵەشـدا ئـازارو مەینـەتی زۆری چەشـت، هەر لە دوورخستنەوەی لە کەسوکاری تـا ئەشـکەنجەدانو سـووکایەتی پێکردنـی لەلایەن دەزگاکانی ئاسـایشو پـۆلیس، کـە هـیچ کـام لەوانـەش ئـەویان لـە کـاری حیزبـیو تێکۆشـانی سیاسـی دوورنەخسـتەوە، بـەڵام دوای ئاشـکرابوونی ڕێکخستنەکانی حیزبی تودە، لەلایەن ساواکەوە هەڵمـەتێکی گیرانـی سەرتاسـەری کادیرو ئەندامانی حدك لە سـاڵی ١٩٥٩دا دەسـتی پێکـردو سـەرەنجام ژمارەیـەکی زۆریان لێگرتن[١٠٧]، کە لەڕاستیشدا هـۆی سـەرەکی ئاشـکرابوونی ڕێکخسـتنەکانی حدك گیرانی کادیرێکیان بوو بەناوی (سمایلی قاسملوو)، کە بـەدوای گیرانـی دانـی بەهـەموو نهێنییـەکانی حیزبـی دیموکراتـدا هێنـابوو بـۆ دەزگـای سـاواك، بـەم هۆیەشـەوە بـوو کـە لـە پـایزی ١٩٥٩دا نزیکـەی سـەدو سـی کـەس لـە زۆربـەی شـوێنەکانی کوردسـتان گـیران[١٠٨]. لـەو هەڵمـەتی گیرانەشـدا بلوریـان لـە شـاری مەهاباد لەشـەوی ٢/٣ی تشـرینی یەکـەمی ١٩٥٩دا دەسـتگیرکرایەوە[١٠٩]، پاشـان دوای چوار ڕۆژ گوازرایەوە بۆ زیندانی تەورێز[١١٠]. لـەوێش ئەشـکەنجەی زۆری دراو هۆکەشـی لەبەرئـەوەبوو، کـە لێیـان دەویسـت بنووسـێ ئـەو هـەر لـە بـاکۆ کـە گەڕاوەتـەوە، بـۆ جاسووسـی هاتۆتـەوە، بـەڵام ئـەو بـەردەوام ئـەو تۆمەتـەی ڕەتکردۆتەوە[١١١]. بەمـەش سـەرەتای خـولێکی تـر لـە مەینـەتیو ناخۆشـییەکانی دەسـتی پێکـرد بەتایبـەتی بەماوەیـەکی کـەمی دوای زینـدانیکردنی هـەواڵی لەدایکبوونی دووکچە دووانەکەی پێدەدەنو لەسەر ڕاسپاردەی خـۆی ناویـان لـێ دەنرێ (هێرۆ و نەشمیل). بـەم بارودۆخەشـەوە لەزینـدانی تـەورێز گوازرایـەوە بـۆ زیندانی "قزل قەلعە/ قەڵای سوور" لە تاران. دوای ماوەیەك لەوێش گوازرایەوە بۆ

زینـــدانی "دیـــژبان"و لـــە دادگایـــەکی ســـەربازی و رواڵەتیـــدا[١١٢]، بـــەتاوانی زیندووکردنەوەی (حدکا)[١١٣]، فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرکرا[١١٤].

هـەواڵی زینـدانیکردنو دەرچـوونی فـەرمانی لـە سـێدارەدان بـۆ بلوریـانو هاوڕێکـانی گەیشـتەوە ڕێبەرایـەتی حـدك لـە باشـووری کوردسـتان، کـە عەبـدوڵڵا ئیسـحاقی "ئەحمـەد تۆفیـق" ڕێبەرایـەتی دەکـردو لـەوێش هەوڵیانـدا لەگـەڵ ڕێکخراوی لێبووردنی گشتی زیندانیانی جیهـانیو هـەروەها دەنگدانـەوەی هـەواڵی ئەو زیندانییانە لە بەشی کـوردی ڕادیـۆی بەغـداو ڕادیـۆی پـەیکی حیزبـی تـودەی ئێـران، بـووە هـۆی دەربڕینـی نـاڕەزایی و خۆنیشـاندانی کـوردان لـە باشـووری کوردستانو چەند شارێکی ئەوروپا، کە کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لـە ئـەوروپا-لقـی مۆسـکۆ نامەیـەکی ناڕەزایـەتی بـە ڕێگـای باڵیۆزخانـەی ئێـران لـە مۆسـکۆ ئاراسـتەی حکومـەتی ئێـران کـرد[١١٥]. لـە بەڵگەنامـەکانی سـاواك ئامـاژە بـە یادداشتێکی (حدکا) کـراوە و لـە بەشـێکیدا هـاتووە: "دەفتـەری سیاسـی حیزبـی دیموکراتی کوردستان داوا لە هاونیشتیمانیان دەکات کە دەنگی ناڕەزایەتی خۆیان لە دژی ئەم هێرشـانە بۆسـەر میللـەتی کـورد دەربـڕن تـا حـوکمی لەسێدارەدانی ئەوانە جێبەجێ نەکرێ، چـونکە ئـەوە ئـەرکێکی نیشـتیمانییە،...، داوا لەهـەموو ئازادیخوازانی جیهان دەکات کە پشتیوانیان بکەن و حکومەتی ئێـران ناچـاربکرێت ئەم بڕیارە هەڵوەشێنێتەوە"[١١٦].

لێرەدا پێویستە هەڵوێستی جوامێرانەی خەڵکی شاری سلێمانی بخەینـەڕوو، کە دەنگی ناڕەزاییيان بەرزبۆوەو لەشـێوەی بیرخـەرەوەو یادداشـتنامەدا چـەندین واژۆیـان کـۆکردەوەو ڕەوانـەی ئێـرانو دەزگـا فـەرمیو دەوڵەتییـەکان کـرا[١١٧]. هەرلـەوێش حەمـە سـاڵح دیـلان لـە سـاڵی ١٩٦٠دا شـیعرێکی سـۆز ئـامێزی لـەژێر ناونیشـانی: (بـۆ گیـانی غـەنی بلوریـان) بڵاوکـردەوە، کـە لـە کۆتـا کۆپلەیـدا هاتووە:[١١٨]

| | |
|---|---|
| ئاسوودە بن، زەبری زیندان | هەڵواسین و پەت بۆ خنکان |
| تەوژمی خەبات لەق ناکا | هێزی تێکۆشان شەق ناکا |
| ئاسوودە بن، بە کوشتن بێ وەیا مردن | ریشەی کورد قەد نایە لەبن |

هەموو ئەوانەش کاریگەری خۆیان کردو بڕیاری لە سێدارەدانیان جێبەجێ نەکرا، هەم بەهۆی بەرپابوونی جموجوولێکی بەرفراوان لەدەرەوەی ئێرانو هەمیش پشتیوانی کارای ڕای گشتی جیهانی بە دژی ئەم بڕیارە[١١٩]، دوای مانەوەی نزیك بە شەش مانگ لەو بارودۆخە دەروونیو نا سەقامگیرییەدا، لەنێوان ڕاگرتنی فەرمانی لەسێدارەدانو چاوەڕوانی چارەنووسێکی نادیار، دواجار بە بۆنەی لەدایکبوونی (ڕەزا)ی کوڕی یەکەمی محەمەد ڕەزا شا لە ڕۆژی سێشەممە ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٦٠، شا حوکمی لە سێدارەدانی ئەوانی هەڵوەشاندنەوە[١٢٠]. بەم جۆرە بەرلێبووردن کەوتو حوکمەکەی بوو بە زیندانی هەتاهەتایی[١٢١].

لەڕاستیدا ڕاگرتنی فەرمانی لەسێدارەدانی بلوریان، لەلایەك هەوڵی کوردان لە باشوورو ئەورووپاو لەلایەکی دیکەشەوە هەروەك لە بەڵگەنامەکانی ساواکدا ئاماژەی بۆ کراوە، کە لەژێر گوشاری سیاسی سەرکردایەتی (حدکا)و بە پشتیوانی مستەفا بارزانی بەدەرکردنی بەیاننامەو ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی سەبارەت بە زیندانیانی سیاسیی کوردو ڕەوشی مافی مرۆڤ لە ئێراندا، بلوریانو بەشێك لەزیندانیانی سیاسی دیکە حوکمی لەسێدارەدانیان بە زیندانیکردنی هەتاهەتایی بۆ گۆڕین[١٢٢]. ئەم بڕیارەش لە ڕۆژی ٣٠ی تشرینی دووەمی ١٩٦٠ لە وتووێژی بەرپرسانی ئێرانی لە ڕۆژنامەکاندا ڕاگەیەندرا، کە بە بۆنەی لەدایکبوونی شازادە "ڕەزا پەهلەوی" سێ زیندانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، کە مەحکوم بە ئیعدام بوون، پلەیەکیان بەخشین پێدراو ئیعدام ناکرێن، ئەو سێ کەسەش: (بلوریان، عەزیزی یوسفیو رەحمەتی شەریعەتی) بوون[١٢٣]. لەم بارەیەوە عەبدوڵڵا حەسەن زادە نووسیویێتی:"لەو هاوڕێیانەی ئێمە عەزیزی یوسفی (مەهاباد)، غەنی بلوریان (مەهاباد)و رەحمەتی شەریعەتی (سنە) بە ئیعدام مەحکووم کرابوونو چەند مانگیش لەژێر ئەو حوکمەدا مانەوە،...، شا ویستی بەدوژمنایەتی لەگەڵ قاسمو نەك بەدۆستایەتی لەگەڵ کورد دەست باوێتە نێو بزووتنەوەی کوردی عێراق. بۆیە لەحاڵێکدا ئەو دەیەویست خۆی وەك دۆستی کوردەکانی عێراق لە قەڵەم بدا، نەدەکرا لەنێوخۆی وڵاتدا (مەبەستی ئێرانە) تێکۆشەرانی کورد ئیعدام بکا.

ئەوەبوو کە عفو ملوکانە بۆ ئەو هاوڕێیانە دەرچوو و حوکمەکەیان لە ئیعدامەوە کرا بە حەپسی ئەبەد"[١٢٤].

بلوریان ئەو ماوەیەی کە لەزیندانی دژبانی تاران بوو، ئاشنایەتی لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی سیاسی پەیداکرد، کە یەکێك لەوانە داریووش فروهەر(١٩٢٨–١٩٩٨) بوو، کە فروهەر بەهۆی ئەوەی ڕادیۆی هەبووە لە زیندان، ئەوانی لە هەواڵەکانی ناوخۆو دەرەوەی ئێران ئاگادارکردۆتەوەو یارمەتی داون. هەرچەندە فروهەر پان ئێرانیست بوو، حیزبێکی بەناوی (حیزبی میللەتی ئێران) هەبوو، بەڵام لە زینداندا پەیوەندی لەگەڵ بلوریان‌و هاوڕێکانی باش بووە[١٢٥].

بلوریان لەماوەی زیندانیبوونیدا، چەندین جار بۆ زیندانەکانی دیکەی ئێران گوازراوەتەوە، هەر سێ ڕۆژ بەدوای ڕاگەیاندنی بەخشینی لە سێدارەدان، گواسترایەوە بۆ زیندانی "قەسر"، کە قەسری قاجاریشیان پێدەگوت، چونکە پێشتر کۆشکی پادشاکانی قاجار بووەو ڕەزا شا (١٩٢٥–١٩٤١) لە ساڵی ١٩٢٥دا کردبووی بە زیندان[١٢٦]. دواترو لە ساڵی ١٩٦٢دا لەگەڵ هەریەك لە: (عەزیزی یوسفی، جەلیل گادانی) گواستراونەتەوە بۆ زیندانی "برازجان"و مەینەتی‌و ناڕەحەتی زۆریان لێی چەشتووە[١٢٧]. لەم بارەیەوە گادانی دەڵێ: "زیندانی برازجان کرابوو بە شوێنی دوورخراوە سیاسییەکان، چەند زیندانییەکی وەك سەفەرخانی قارەمانی‌و حوسێن فروهەرو مهندس عەباس گرمان‌و چەند ئەفسەری ڕێکخراوی نیزامی حیزبی تودە بۆ قەڵای برازجان ڕاگوێزران‌و ئێمەشیان لە ساڵی ١٩٦٢ لە قەسرڕا بۆ ئەوێ دوورخستەوە"[١٢٨].

بلوریان کە بۆ ماوەی نزیك بە پێنج ساڵ لە زیندانی برازجان مایەوە، ساڵی جارێك مافی دیتنی بنەماڵەکەی هەبووە، ئەویش بەهۆی دووری ڕێگاو خەرجی‌و گرانی ژیانەوە، خێزانی بلوریان لەماوەی ئەو پێنج ساڵەدا تەنیا یەك جار لەساڵی ١٩٦٤دا دیدەنییان کردووە[١٢٩]، پاشان بەهۆی نەخۆشییەوە لە ساڵی ١٩٦٧دا گەڕاندیانەوە بۆ زیندانی تاران[١٣٠] . بۆیە گەڕاندنەوەی بۆ تاران تا ڕادەیەك لە رووی دەروونییەوە ئارامی پێ بەخشیوە. تەنانەت لە زیندانی تاران، وێڕای ناسینی چەند کادیرێکی دیاری حیزبی تودە و ئاشنابوونی پێیان، هاوکات سەرقاڵی خوێندنەوەو خەریکی دانانی فەرهەنگێکی زمانی کوردی بووە، کە

نزیکەی پانزە هەزار وشەی لە زاراوەکانی کوردی کۆکردبۆوە، بەڵام وەك خۆی دەڵێت تێدا چووە(١٣١). جەلیل گادانی کە چەند ساڵێك لەزیندانەکانی حکومەتی شای ئێران لەگەڵ بلوریان دابووە، سەبارەت بەو هەوڵەی بلوریان دەڵێ: "من لەبیرمە لە بەندینخانەی قەسرێ بڕیاربوو بەهاوکاری هەموو لایەك فەرهەنگێك لە هەموو راوێژەکانی زمانی کوردی ئامادەبکەین، پێشنیازەکەش هی من بوو، بەڵام فیدای ناتەبایی بوو، سەری نەگرت. ئەو (مەبەستی بلوریانە) نەتەنیا حەوسەڵەی ئەوکارەی نەبوو، لەخوێندنی زمانیش زۆر کوڵ بوو، لەڕاستیدا حەوسەڵەی کارو خوێندنی نەبوو، بەڵام قسەکردنی زۆر پێ خۆش بوو"(١٣٢). وێڕای ئەم بۆچوونەی گادانی، بەڵام پێمان وایە کە دەشێ بلوریان دواترو بەتەنیا بیری لەوەها کارێك کردبێتەوە.

لەڕاستیدا وێڕای هەموو ناخۆشیو ئازارەکانی بلوریان لەنێو زیندانەکاندا، هاوکات ناکۆکییە ناوخۆییەکانی حدکایان لەگەڵ خۆیاندا گواستبۆوە زیندانو لەزیندانیشدا زۆربەی کات لەگەڵ یەکتری ناکۆکو ناتەبا بوون. ئەو ناکۆکییانەش لەسەرەتادا لەزیندانەکانی دژبانی تارانو دوایە لە قەسری قاجار لەنێو زیندانییانی مەهابادیدا سەری هەڵدا. لەلایەك غەنی بلوریانو عەزیزی یوسفی چەپ بوونو زۆر توند بوون. لەلایەکی دیکەش دکتۆر مەولەوی بووە، کە هەستی ناسیۆنالیستی زۆر توند بوو، لەهەمان کاتدا دژی سۆسیالیزم و چەپگەرایی بوو. کە ئەو ململانێیەش کاریگەری کردبووە سەر کادیرەکانی دیکەی حدکا(١٣٣). هەروەها بڕیارەکانی سەرکردایەتی حدکا لە باشووری کوردستان دیسان بۆ ئەو بوون بەمایەی ناڕەحەتیو ئازار، بۆ وێنە: ڕێبەرایەتی حدکا لە کۆنگرەی دووەمی، کە لە (گوندی سوونێ)ی باشووری کوردستان لە ١٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٤دا بەسترا، ئەویان وەکو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژاردبوو(١٣٤)، بەڵام ئەوە بووە هۆی ئازاردانی لە زیندانو دوای ئەوە بۆماوەی چەندین ساڵ ڕێگەیان بە خێزانەکەی نەدا چاویان پێی بکەوێو سەردانی بکەن. جگە لەوەش لە ساڵی ١٩٧٠دا لە زیندانی تاران گوازرایەوە بۆ زیندانی عادل ئاباد (عادل ئاوا)ی شیرازو تا پایزی ساڵی ١٩٧٨و ئازادکرانی لەوێ مایەوە(١٣٥).

بلوریان لەساڵی ١٩٥٩ەوە تا ئازادکرانی لە ١٩٧٨، نزیکەی بیست ساڵی لەزیندادا بەسەر بردووە[١٣٦]. لەو ماوەیە زۆرەی زیندانیشدا بەخۆڕاگریو دڵسۆزی بۆ ڕێبازەکەی، بوو بە نیشانەی ئازادیخوازی لە مێژووی جووڵانەوەی ئازادیخوازی کوردستاندا. هەرچەندە لە بەڵگەنامەکانی ساواکدا هاتووە، کە بلوریان لەماوەی زیندانیبوونیدا لە رابردووی خۆی پاشگەزبۆتەوەو هەموو هاوکارییەکی بۆ دەزگای ساواك دەربڕیوە و ئامادەیی فیداکاری هەبووە بۆ شا[١٣٧]. بەڵام جگە لەمە هیچ بەڵگەیەکی تر نییە ئەوە بخاتە روو، کە بلوریان پاشگەزبوونەوەی خۆی بۆ ساواك دەربڕیبێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە سووربوونی ئەو لەسەر درێژەدانی بەخەباتی سیاسی، ئەوی لەزینداندا بۆ ماوەی بیست ساڵ هێشتەوە. تا ئازادکردنی لە زیندانو گەڕانەوەی بۆ کوردستان لە ساڵی ١٩٧٨ بوو بەخاڵی وەرچەرخان لەمێژووی تێکۆشانی سیاسی بلوریان لەلایەکو بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردو حیزبی دیموکرات لەلایەکی دیکە. هەروەها لەو ئازارە دەروونییەی نێو زیندانیش ڕزگاری بوو، بەتایبەتی کە ئازاد بوونی عەزیز یوسفی پێش ئەو بەماوەی ساڵێك بەهۆی نەخۆشیو هەوڵی ڕێکخراوی مافی مرۆڤی جیهانی[١٣٨]، کە بلوریانی لەتاکە دۆستو هاوبەندی ساڵانی دوورودرێژیش بێبەش کردبوو.

## بەشی سێیەم:
## تێکۆشانی سیاسی لەنێوان ساڵانی ١٩٧٩-٢٠١١دا:

### یەکەم: گەڕانەوەی بۆ کوردستان و بەشداری لە بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردستاندا (١٩٧٩–١٩٨٤):

لەگەڵ سەرهەڵدانی خۆپیشاندانەکانی گەلانی ئێران بە دژی دەسەڵاتی پادشایەتی لە ساڵی ١٩٧٨دا، بلوریان وەك زۆربەی زیندانییانی سیاسیی تر لە پایزی ١٩٧٨ لە بەندیخانەی شیراز ئازادکراو چوو بۆ تاران ماڵی جەلیل گادانی، دواتریش لەپێشوازی ئاپۆرای جەماوەرێکی زۆری کوردستان بەگشتیو خەڵکی شاری مەهابادو دەوروبەری گەیشتەوە شاری مەهابادو خەڵکی بەدروشمی: "مامە غەنی هاتەوە یاخودا بەخێربێتەوە" پێشوازییان لێکرد، نازناوی "مامە"یان پێبەخشی[١٣٩]. بەمەش دەبینین خەبات و تێکۆشانی سیاسیی چەندین ساڵەی رابردوویی و خۆڕاگریو سووربوونی لەسەر ڕێبازی سیاسیی خۆی بەدرێژایی نزیك بە بیست ساڵی قۆناغی زیندانیبوونی، ئەوی کردبوو بە نیشانەی خەبات و خۆشەویستیی خەڵکی کوردستان.

لەو هەلومەرجە شڵەژاوەی دۆخی سیاسی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و جۆش و خرۆشی خەڵك لە شۆڕشی گەلانی ئێران، قاسملووی سکرتێری گشتی (حدکا) سەردانی بلوریانی کرد[١٤٠]. پاشانیش جارێکی دیکە لەڕیزەکانی (حدکا)دا خەباتی سیاسی دەستپێکردەوە[١٤١]. هەروەها بەشداری لەخۆپیشاندانەکاندا لەگەڵ خەڵك لە شاری مەهاباد بەدژی حکومەتی شا کردووەو دوای ڕاگەیاندنی حکومەتی کاتی (بازرگان)، لەلایەن ژمارەیەك ڕووناکبیری چەپی شاری مەهاباد پێشنیازی پێ کرا، کە ببێتە ئەندامی ئەنجومەنی شورای شاری مەهاباد[١٤٢]. جگە لەوەش چالاکانە بەشداری کرد لە کۆبوونەوەکاندا لەگەڵ (داریووشی فروهەر، د.محەمەد موکری، د. ئیسماعیلی ئەردەڵان و ئایەتوڵڵا نوری) نوێنەرانی حکومەتی کاتی بازرگان لە مەهاباد، کە ساڵی ١٩٧٩ ئەنجامدرا[١٤٣].

بلوریان کە خاوەن پێگەی جەماوەری و کەسایەتییەکی سیاسیی دیاربوو، لە بەشێکی زۆری ئەو ڕووداوو پێشهاتانەی دەهاتنە پێشەوە لەو قۆناغەی کوردستاندا، ئەو ڕۆڵ و کاریگەری و بەرپرسیاریەتی تێدا پێسپێردراوە، بۆ وێنە:

ئەندامی دەستەی نوێنەرایەتی حدکا بووە لە گفتوگۆو دیداریان لە تاران و قوم لەگەڵ خومەینی لەلایەك و بازرگان لەلایەکی دیکە، لە ئاداری ١٩٧٩[١٤٤]. بەنوێنەرایەتی حدکا ئەندامی دەستەی نوێنەرایەتی گەلی کورد بوو، ئەو دەستەیەی کە لە کۆتایی تشرینی دووەمی ١٩٧٩دا پێکهات بۆ گفتوگۆو دانوستاندن لەگەڵ وەفدی حکومەتی ئێران[١٤٥]. هەر لەو ماوەیەشدا لە کۆنگرەی چوارەمی حدکا، کە لە ١٩ی شوباتی ١٩٨٠دا بەسترا، وەکو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و پاشانیش بە ئەندامی دەفتەری سیاسی هەڵبژێردرا[١٤٦]. بوو بە ئەندامی وەفدی دانوستانکاری حدکا لەگەڵ (بەنی سەدر)ی سەرۆك کۆماری تازە هەڵبژێردراوی ئێران، کە لە (٢٨ی شوباتی١٩٨٠) بەڕێوەچوو، ئەو کۆبوونەوەیەی کە نوێنەرانی حدکا گەڵاڵەنامەیەکی شەش ماددەییان پێشکەشی حکومەت کرد بۆ پەسندکردنی[١٤٧]. هەروەها کاتێك لە (١٤ی ئاداری ١٩٨٠) هەڵبژاردنی خولی یەکەمی پەرلەمانی کۆماری ئیسلامی ئێران (هەڵبژاردنی یەکەم دەورەی مەجلیسی شورای میللی) بەڕێوەچوو بلوریان لەسەر داوای حیزبەکەی وەکو نوێنەری شاری مەهاباد پاڵێورابوو[١٤٨]، کە لە ئەنجامدا بە (٢٩٣٩٦) دەنگ هەڵبژێردرا، واتە (٩٠٪)ی دەنگەکانی خەڵکی مەهابادی بەدەستهێنابوو. هەرچەندە ئاکامی ئەم هەڵبژاردنە لەلایەن حکومەتەوە بەتاڵ کرایەوە[١٤٩]. ڕاستە ئەم دەنگهێنانەی بە پلەی یەکەم بۆ پێگەی جەماوەری حدکا دەگەڕێتەوە، کە لەشارەکانی دیکەی کوردستانیش سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەستهێنابوو، بەڵام بێگومان ڕۆڵ و پێگەی غەنی بلوریانیش ڕۆڵی بینیوە.

لە ڕاستیدا بلوریان لە ژیانی سیاسی دوای شۆڕشی گەلانی ئێرانو دەستپێکردنەوەی خەبات و تێکۆشانی سیاسی لە ڕیزەکانی (حدکا)دا وەکو ئەندامی دەفتەری سیاسی، لەگەڵ قاسملووی سکرتێری گشتی حیزبناکۆكو ناتەبا بوو، ئەو ناکۆکییەش بەشێکیان پەیوەندی بە مێژووی رابردووی کاری حیزبیو سیاسییانەوە بوو، کە دەگەڕایەوە بۆ ساڵانی ١٩٥١-١٩٥٣و ١٩٥٥، ئەوکاتەی قاسملوو بەنوێنەرایەتی حیزبی تودە سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی حدکای لە مەهابادو کوردستاندا دەکرد، لە ساڵی ١٩٥٥ لەسەر بڕیاری ڕێبەرایەتی ئەوکاتی حدکا بڕیاردرابوو، قاسملوو پەیوەندییەکانی لەگەڵ تودە کۆتایی پێ بهێنێت،

ئەویش هەرچەندە بەڵێنی دابوو، بەڵام ئەو بەڵێنەی شکاندبوو، بڕیاری ئەوانی جێبەجێ نەکردبوو[١٥٠]، ئەوەش نیگەرانی لای بلوریان دروستکردبوو، دواترو دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٩٧٩و دەستپێکی قۆناغێکی نوێی خەباتی سیاسیو چەکداری حدکا بەرامبەر بە کۆماری ئیسلامی ئێران، نیگەرانیو پەیوەندی خراپی بلوریان لەگەڵ قاسملوو چووە قۆناغێکی توندترو بەتایبەتی مەسەلەی پەیوەندییەکانی قاسملوو لەگەڵ حیزبی بەعسی عێراق لەلایەکو لەلایەکی دیکەشەوە ڕەخنەی بلوریان لەبێ دیسپلینی و جێبەجێ نەکردنی بڕیارەکانی کۆمیتەی ناوەندیو دەفتەری سیاسی لەلایەن قاسملوو و کارکردن بە تاکڕەویو سەپاندنی تەنها بۆچوونی خۆی لەڕووداوو پێشهاتو سیاسەتەکانی حدکا، ئەویان بەو ئاکامی نیگەرانیو پەیوەندییە خراپە لەگەڵ قاسملوو گەیاندبوو[١٥١].

جگە لەمانەش بلوریان خۆی لە قاسملوو بەشیاوتر دەزانی بۆ سەرکردایەتیکردنی حدکا، ئەو بۆچوونەی کە حیزبی تودە زەمینەی تەواوی بۆ ڕەخساندبوو، لەو ڕێگایەشەوە هەوڵی جیابوونەوەو تێکدانی ڕیزەکانی حدکایان بەدژی قاسملوو گرتبووەبەر[١٥٢]. لەڕاستیدا لەلایەن حیزبی تودەوە کودەتایەك لەدژی حیزبی دیموکرات رێکخرابوو، چونکە کاتێك تێگەیشت ناتوانێ حیزبی دیموکرات بەشوێن خۆیدا رابکێشێ، ویستی لەبەرامبەر ئەودا حیزبی دیموکراتێکی دی قوت بکاتەوە[١٥٣]. لەئاکامدا بلوریانیان بەو ئاکامە گەیاند کارکردن لەگەڵ قاسملوو و هاوبیرەکانی لە ڕیزەکانی حدکادا دەرەتانی نییە، بۆیە ماوەیەك دوای کۆنگرەی چوارەمی حدکا، بڕیاری جیابوونەوەی خۆی لە باڵی قاسملوو ڕاگەیاند و حیزبێکی نوێی بەهاوکاری و پشتگیریکردنی حیزبی تودە لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٨٠دا لەژێر ناوی: (حدکا- پێڕەوانی کۆنگرەی چوار) ڕاگەیاند[١٥٤]. کە بە گرووپی حەوت کەسیش ناسران[١٥٥].

هەرچەندە بلوریان لەسەرەتای بایکۆتکردنو وازهێنانی لە ڕیزەکانی حدکادا، بڕیاری ئەوەی دابوو بچێتە لای هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستان، بەڵام دواتر لەژێر کاریگەریی بۆچوونو پێشنیازەکانی (حەمەدەمینی سیراجی)و (فاروقی کەیخوسرەوی) بەدامەزراندنی حدکا- پێڕەوانی کۆنگرەی چوار باوەڕی پێ دەهێنن، ئەویش بە لەبەرچاوگرتنی پێگەی خۆییو ئەگەری سەرکەوتنی لە

درێژەدان بەگفتوگۆکردنو بەئاشتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ڕەزامەندی دەربڕیبوو[١٥٦]. ڕاستی ڕووداوەکان دەریانخست تودە ڕۆڵی گرنگی گێڕا لە دامەزراندنی حدکا– پێڕەوانی کۆنگرەی چوار، وەك کیانوری دەڵێ: "حیزبی تودە لەڕێی عەلی گەلاوێژ لە ڕەوتی جیابوونەوەی بلوریان لە گرووپی قاسملوو ڕۆڵی گرینگی هەبوو و لەهەموو کارێك ڕێنمایی دەکردن[١٥٧]. وەك کریس کۆچێرا دەڵێ: "غەنی بلوریان قارەمانی خەباتی دژی شا– بیست ساڵ لەتەمەنی خۆی لە زیندان بردەسەر– قەت پێوەندی خۆی لەگەڵ حیزبی تودە کە بەرلە گیرانی (مەبەست ساڵی ١٩٥٩یە) زۆر لێی نزیك بوو نەپچڕیبوو، هەمیشە حیزبی کومونیستی ئێران (حیزبی تودەی) بە ئیدیال (مثالی) دادەنا"[١٥٨].

لەڕاستیدا دەسەڵاتدارانی ئێران ئەم دووبەرەکییەی ناو ڕیزەکانی (حدکا)یان تا ئەو پەڕی سنوور بەکارهێنا. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٠، هێرشەکانی بۆ سەر پێگەکانی کوردبەهێزترکرد، بەجۆرێك شارە گەورەکانی کوردو ئەو ناوەندانەی کە دانیشتوانێکی زۆری تێدا نیشتەجێ بوون، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی حکومەتی ئێرانی[١٥٩]، چونکە گرووپی حەوت کەسی هەر بە جیابوونەوە لە (حدکا) وازیان نەهێنا، بەڵکو لەپاڵ حیزبی تودەو پاسدارانی کۆماری ئیسلامی دژی کوردو هێزی پێشمەرگەی کوردستان، چەکی حکومەتیان کردە شان، بەمەش زیانی زۆریان گەیاند بە بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد لەو کاتەدا[١٦٠]. تەنانەت لەبەرامبەر هاوکارییەکانیان بۆ کۆماری ئیسلامی، لەلایەن (علی صیاد شیرازی) فەرماندەی لەشکری کوردستان لەنامەیەکدا لە کانوونی دووەمی ١٩٨١دا سوپاسو ستایشی بلوریان و چەکدارەکانی لەیارمەتی بەسوپای ئێران لەسەرکوتکردنی جووڵانەوەی کورد دەربڕیوە[١٦١]. لەم بارەیەوە عەبدوڵڵا حەسەن زادە دەڵێت: "بۆ هەموو کەسێکی بە ئینساف دەرکەوت ئەو تاقمە (مەبەستی گرووپی حەوت کەسی– لایەنگرانی کۆنگرەی چوارە بەڕێبەرایەتی غەنی بلوریان) لەو وەختەدا شیاوی لەقەبی جاشو خائینو زۆرشتی دیکەی لەو بابەتە بوونو بەڕاستی ئەو ناوانە بۆ ئەو هاوڕێیانە کالای بەقەد بالابوون"[١٦٢]. نەفرەتی خەڵکی مەهاباد وای لێهاتبوو کە منداڵان لە کۆڵانان دەیانگوت: "مامە غەنی هاتەوە، یاخودا بەخێرنەیەتەوە، یا خوا بگیرێیتەوە"[١٦٣].

بلوریان وەك سکرتێری گشتی حدکا-پێڕەوانی کۆنگرەی چوار، دوای ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران دامەزراند، داخوازییەکانی خۆیانیان لەچوارچێوەی هەشت ماددە پێشکەشکرد، کە هەر شەش ماددەی پێشووی حدکاو تەنها دوو ماددەی لایەنی ڕۆشنبیری‌و فەرهەنگی پێوە زیادکرابوون، بەڵام هیچ ئاکامێکی لێ نەکەوتەوەو سەرجەم هەوڵەکانی دواتریشیان بۆ ڕێککەوتن و ئاشتەواییکردن لەگەڵ حکومەتی ئێران شکستی هێنا[١٦٤]. ئەمەش ئەوە دەخاتەڕوو کە بلوریان‌و هاوبیرەکانی لە بۆچوونەکانیان بەرامبەر بە حکومەتی ئێران بەهەڵەداچووبوون‌و تەنانەت حکومەتی ئێران لەساڵی ١٩٨٣دا کەوتە ڕاوەدوونان‌و ڕەشبگیری‌و زیندانیکردنیان، ئەمەش لاوازی‌و پەرتەوازەیی خستە ڕیزەکانی پێڕەوانی کۆنگرەی چوارو چوونی بەشێکی زۆری کادیرەکانیان بۆ ناوچە سەر سنوورییەکانی ئێران-عێراق‌و نیشتەجێبوونیان لەنزیك بارەگاکانی (پ.د.ك)و حیزبی شیوعی عێراق‌و هەر لەو ساڵەشدا بلوریان بەیارمەتی (پ.د.ك) لە تەورێزەوە گەیشتە ڕاژان‌و پاشان چووە (لۆلان)، کە بنکەی سەرکردایەتی پارتی لێ بوو[١٦٥].

لەم بارودۆخە دژوارەی کە پێڕەوانی کۆنگرەی چواری تێکەوتبوو، بلوریان بۆ خۆدەربازکردن لەو قەیرانانە بڕیاریدا بچێتە ئەورووپا تا لەڕێی ڕاوێژکردن لەگەڵ حیزبی تودە چارەسەرێك بۆ خۆیی‌و لایەنگرانی بدۆزێتەوە. کەچی کاتێك گەیشتە ئەورووپاو لە پراگ نیشتەجێ بوو، نەك هەر نەگەڕایەوە بۆ کوردستان، بەڵکو چارەسەری کێشەکانی حیزبەکەشی بەستەوە بە تودەو دواجار تواندنەوەی پێڕەوانی کۆنگرەی چوار لەبۆتەی تودەداو لەساڵی ١٩٨٥دا لایەنگرانی ئاگادارکردەوە کە ئیدی لەژێر ناوی حیزبی تودەی ئێراندا درێژە بەتێکۆشان دەدەین[١٦٦]. بەمەش بلوریان کەوتە بنبەست و لە چیکۆسلۆڤاکیا بوو بە پەناهەندە[١٦٧].

بۆیە جیابوونەوەی بلوریان لە حدکاو چوونی بۆ پاڵ کۆماری ئیسلامی ئێران، زیانی زۆری بەکەسێتی‌و مێژووی ژیانی سیاسی ڕابردوویی و داهاتووشی گەیاند، ئەو کە پاڵەوانی نێو زیندانەکانی شاو قارەمانی کوردایەتیی ڕۆژانی سەختی خەبات بوو، کاتێك لە زیندانـدا لەساڵی ١٩٧٨ هاتەوە بۆ مەهاباد، خەڵك وەك

نیشانەی نەتەوەیی‌و کەسایەتییەکی سیاسی گەورەو قارەمانێکی نەتەوەیی سەیریان دەکردو پێشوازییان لێی کرد، بەڵام بەو کردەوەیەی مێژووی سیاسی‌و کەسێتیی خۆی دۆڕاندو خۆشەویستیی ناو خەڵک‌و جەماوەری کوردستانیشی لەدەستدا. بەم جۆرە ئەو رەوتەی کە بەناوی (حدکا- پێڕەوانی کۆنگرەی چوارەم) چالاکییان دەکرد، بە چوونە ناو حیزبی تودە پێچرایەوە بۆ هەمیشە داخرا، ڕەوتێك کە هیچ یارمەتییەکی بە چارەسەری کێشەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نەکرد، بەڵکو دۆخەکەشی ئاڵۆزترکردو شوێنەواری نەرێنیشی لێکەوتەوە.

## دووەم: دوا وێستگەکانی ژیانی سیاسیی بلوریان‌و قۆناغی تاراوگە ١٩٨٤-٢٠١١:

بلوریان لەساڵی ١٩٨٣وە رووی کردە ئەورووپای ڕۆژهەڵات‌و دوای بڕیاردان لە هەڵوەشاندنەوەی حیزبەکەی (حدکا-پێڕەوانی کۆنگرەی چوار) لە ساڵی ١٩٨٥دا، هەر لە تاراوگە مایەوەو لە ڕیزەکانی حیزبی تودەدا درێژەی بە تێکۆشانی سیاسی دا و لە کۆنفرانسی میللی حیزبی تودە، کە لە ساڵی ١٩٨٥ لە "کابول"ی پایتەختی ئەفغانستان پێکهات، بوو بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئەو حیزبە[١٦٨]. سەبارەت بە چوونی بۆ ناوڕیزەکانی تودە، بلوریان دەڵێ بۆ دوو مەبەستی سەرەکی بووە: لەلایەك تا بەشداربێ لەبەرەی یەکگرتووی حیزبی تودەو حدکا، کە هەوڵی دامەزراندنی دەدرا، لەلایەکی تریشەوە خۆی بگەیەنێتە کاربەدەستانی باڵای یەکێتی سۆڤیەت، تا لەو ڕێیەوە یارمەتییەك بۆ بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد بەدەست بهێنێت[١٦٩]. ئەم بۆچوونەی بلوریان شیاوی هەڵوەستە لەسەرکردنە، چونکە لەم ڕووەوە هیچ هەوڵێکی بۆ کورد لەگەڵ سۆڤیەتدا نەداوەو بەڵکو بەپێچەوانەوە زیاتر سەرقاڵی چارەسەری کێشەو ململانێ ناوخۆییەکانی حیزبی تودە بووە تا ئاوڕ لەکێشەی کورد بداتەوە، ئەم ڕاستییەش لەنامەیەکیدا دەردەکەوێت کە ئاراستەی حیزبی کومونیستی یەکێتی سۆڤیەتی کردووە لە ٥ی تەممووزی ١٩٨٧داو تیایدا داوادەکات کە بۆچارەسەری کێشەو گرفت‌و دووبەرەکی‌و گەندەڵی ناو سەرکردایەتی حیزبی تودە، هاوکارییان بکات، تا

حیزبی توده لەوەی کە هەیە خراپتری بەسەرنەیەو لێك بڵاونەبێ[١٧٠]. تەنانەت کاتێك لەساڵی ١٩٨٩دا لە پراگ کە لەگەڵ قاسملوو بەدیداری یەکتری شاددەبن، قاسملوو پێی گوتبوو کە تۆ هەرهی خۆمانیو وەرە با بچینەوە کوردستان، بەڵام بلوریان ڕەتی کردبۆوە[١٧١].

لەڕاستیدا بلوریان لەو قۆناغەی خەباتی سیاسی لە ڕیزەکانی تودەدا سەرکەوتوو نەبوو، تەنانەت نەیتوانی ئامانجە راستەقینەکانی لەو حیزبەدا بێنێتەدی، ئەمەش بەشێکی پەیوەندی بە کێشە ناوخۆییەکانی حیزبی تودەوە هەبوو، بەشێکی تریشی بێ ئومێدبوونی بلوریان بووە لە پشتیوانی سۆڤیەت لە کێشەی نەتەوایەتی کورد، بۆیە دەبینین دواجار ڕیزەکانی تودەشی جێهێشت لەساڵی ١٩٩٠دا[١٧٢]. دوای ئەوەی کوردەکانی نێو حیزبی توده بەیاننامەیەکیان لە ٣٠ی ئاداری ١٩٩٠دا بەناوی بەشی زۆری ئەندامەکانو کادیرە کوردەکانی حیزبی تودەی ئێران لە دەرەوەی وڵات بڵاوکردەوەو تیایدا دابڕانی یەکجارەکی خۆیان لە حیزبی توده ڕاگەیاند[١٧٣]. بەدوای ئەمەشدا غەنی بلوریانو حەمەدەمینی سیراجی-یش بەیانێکی کورتی دوو قۆڵییان لەهەمان کاتدا (٣٠ی ئاداری ١٩٩٠) ڕاگەیاندو تیایدا جەختیان کردەوە کە هیچ پەیوەندییەکیان بە حیزبی تودەوە نەماوە[١٧٤].ئەوەش کۆتاییهاتن بوو بەخەباتی حیزبایەتی ئەو[١٧٥]، چونکە لەو قۆناغە بەدواوە لە پراگەوە چوو بۆ ئەڵمانیاو وەك پەنابەرێکی سیاسی، نیشتەجێ بوو[١٧٦]. هەرچەندە دوای ئەوەی لە ڕیزەکانی توده وازی هێنا، لەسەرەتاداو بۆ ماوەی دووساڵ لە هەوڵی پێکهێنانی پارتێك یان ڕێکخراوێکی سیاسی کوردیدابووە، لەم بارەیەوە بلوریان دەڵێت: "دوای ساڵی ١٩٩٠ بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەتەمای پێکهێنانی ڕێکخراوێکی دیموکراتیك بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بووینو کۆبوونەوەیەکی زۆریشمان بۆ پێکهێنا، بەڵام هەوڵەکەمان بێ سەرئەنجام مایەوە"[١٧٧].

بلوریان لە دواساڵانی ژیانیدا بەشێك لە بیرەوەرییەکانی خۆی لە کتێبێکدا بەناونیشانی (ئاڵەکۆك)، کە لە ساڵی ١٩٩٥ەوە دەستی پێکردبوو، لەساڵی ١٩٩٧دا بەزمانی کوردی لە سوید چاپ و بڵاوی کردەوە[١٧٨]. هەرچەندە لەو کتێبەیدا زانیاری زۆری سەبارەت بە ژیانی سیاسی و ڕووداوەکانی سەردەمی

دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.ك و حیزبی دیموکرات و کۆماری کوردستان تا دەگاتە هەڵوەشاندنەوەی پێڕەوانی کۆنگرەی چوار، کە لەزۆر لایەنەوە بایەخی مێژوویی خۆیان هەیە، بەڵام بێ کەموکوڕیش نییەو لەسەر هەندێك لە ڕووداوەکان شیاوی هەڵوەستە لەسەرکردنو ڕەخنەگرتنە[١٧٩].

بەهۆی پەیوەندی باشو بەهێزی لەگەڵ (پ.د.ك) لەڕابردوودا[١٨٠] ، لەسەر بانگهێشتی (نێچیرڤان بارزانی) لەساڵی ٢٠٠٧دا گەڕایەوە بۆ باشووری کوردستانو بۆماوەی چەند مانگێك لەشاری هەولێر نیشتەجێبوو، بەڵام بەهۆی نەخۆشییەوە گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیاو وەك کەسایەتییەکی سیاسیو پەنابەرێکی کورد لە ژیانی تاراوگە لەوێ مایەوە تا لەتەمەنی هەشتاو شەش ساڵیدا لە نەخۆشخانەی (ئالسباخ)ی ئەڵمانیا لەڕۆژی ٩ی ئاداری ٢٠١١دا کۆچی دوایی کردو دواتریش تەرمەکەی لە ١٦ی ئاداراو بە بەشداری (مەسعود بارزانی) لەڕێی فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی هەولێر گەیشتەوە کوردستانو لەناو پێشوازی دۆستو هاوڕێیانیدا لەشاری هەولێر لە (گۆڕستانی نوێی کەسنەزان) بەخاك سپاردرا[١٨١].

بێگومان هەڵەی سەرەکی غەنی بلوریان لەلێکدانەوەیدا بوو بەرامبەر بە کۆماری ئیسلامی ئێران، کە پێی وابوو کۆماری ئیسلامی ئەو مەبەستو توانایەی هەیە کە کێشەی کورد لەڕێگەی ئاشتیخوازانەوە چارەسەربکاتو گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان مافە نەتەوایەتییەکانی لە چوارچێوەی ئەو حکومەتەدا دەستەبەربێ. لەم ڕوانگەیەوە بلوریان متمانەیەکی تەواوی بە کۆماری ئیسلامی پەیداکرد، بەجۆرێك کە لەبەرامبەر چالاکی چەکدارانەی بزووتنەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ڕاوەستا. متمانەیەك کە تەنیا یەك لایەنە بوو، چونکە کۆماری ئیسلامی نەك تەنیا هیچ کات گوێی بۆ سیاسەتو پێشنیازەکانی بلوریان بۆ چارەسەری ئاشتیخوازانەی کێشەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان شل نەکرد، بەڵکو لە بنەڕەتدا باوەڕی بەکێشەی نەتەوایەتی لە ئێرانێکی فرەگەلیدا نەبوو، چونکە لە ڕوانگەی چەمکی "ئوممەتی ئیسلامییەوە" دەیڕوانییە کێشەی نەتەوایەتی.

بلوریان پاش ماوەیەك خۆیشی بوو بە قوربانیو ناچارکرا بەهەرجۆرێك بێ خۆی قوتاربکاتو ژیانی تاراوگەیی هەڵبژێرێ. بەبڕوای ئێمە ئەوەی بلوریانی

تووشـی ئـەم چارەنووسـەکرد، خـۆ ڕزگارنـەکردنی لـەژێر کاریگـەریو هـەژموونی حیزبـی تـودەی ئێـران بـوو، حیزبێـك کـە بەدرێـژایی تەمـەنی سیاسـیو تەنانـەت لەماوەی دوورودرێژی زیندانیشدا بەهۆی ئەنـدامانی زینـدانی ئـەو حیزبـە سـێبەری قورسـی خـۆی بەسـەر نـاوبراودا کێشـابوو و تەنانـەت لـەپاش دابڕانـی لـە حیزبـی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیشدا چارەنووسی سیاسیی حیزبەکەی بەچارەنووسـی حیزبی تودەوە گرێداو لەڕاستیدا بوو بە پاشکۆی حیزبێك کە کێشـەی نەتەوەکـەی بلوریـانی بەلایـەوە پلـە سـێو چـوار بـوو و گرینگـی ئـەوتۆی پێنـەدەداو دەبـوو پاشـکۆیەك بـێ لەخـەباتی چـینایەتیو "خـەباتی دژی ئیمپریالیسـتی" کۆمـاری ئیسـلامی. بـەڵام بلوریـان کاتێـك لـەم ئەزموونـە دەرسـی وەرگـرتو بڕیاریـدا بـۆ هەمیشە ماڵئاوایی لە حیزبی تودە بکات، کە ئیتر درەنگ ببوو و لە مێـژوودا نـاوی وەك قارەمانێکی تراژیدی مایەوە.

## ئه نجام

یەکەم/ غەنی بلوریان سەرەتای کارو تێکۆشانی سیاسی لە دامەزراندنی سازمانی جەوانانی کوردو دواتریش ڕێکخراوی لاوانی (ژ.ك)و (حدك)دا بووە. دوای هەرەسی کۆماری کوردستان یەکێك بووە لەوانەی کە سەرلەنوێ (حدك)یان زیندووکردەوە.

دووەم/ لەژێر کاریگەریی بیری چەپو سۆسیالیستیدا بووە. لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی بەسەربەخۆیی کوردستان هەبوو. بەهۆی بیروباوەڕو تێکۆشانی سیاسی، وەك کەسایەتییەکی سیاسیی کوردماوەی بیست و پێنج ساڵ زیندانی سیاسی بووە لە زیندانەکانی حکومەتی پەهلەوی ئێران.

سێیەم/ جگە لە کاری سیاسی وەك ڕۆژنامەنووسو نووسەرێك کاری کردووەو ڕۆڵی گرنگی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری ڕێگا (١٩٤٨)و دواتریش لەچاپدانەوەی خولی دووەمی ڕۆژنامەی کوردستان (١٩٥٤) وەك ئۆرگانی (حدك).

چوارەم/ پێوەندیی دۆستانەو نزیکی لەگەڵ (پ.د.ك) و حیزبی شیوعی عێراق و کوردستاندا هەبووە.

پێنجەم/ گەورەترین هەڵەی ژیانی سیاسی جیابوونەوەو لەتکردنی (حدکا) بوو، کە جووڵانەوەی کوردی لاوازکردو خۆشی کەوتە پەراوێزو لەکارو تێکۆشانی سیاسی دوورکەوتەوە.

## پەراوێزو سەرچاوەکان

(١) کاکشار ئورەمار: رێزدار غەنی بلوریان بۆ کوردستانی ئیمرۆ دەدوێ، کوردستانی ئیمرۆ، ژمارە (٥و٦)، تەباخی ٢٠٠٠، ل٢٤؛ برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، مێژووی زیندوو، گفتوگۆ لەگەڵ غەنی بلوریان، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٧.

(٢) غەنی بلوریان: ئاڵەکۆك، بەسەرهاتەکانی سیاسی ژیانم، ستۆکهۆڵم–سوید، ١٩٩٧، ل٢٩.

(٣) هـ.س، ل١٤٠، ١٤١.

(٤) کاکشار ئورەمار: س.پ، ل٣٦.

(٥) رەحمان نەقشی: ١٠ی خاکەلێوە رۆژی شەهیدان، بێشوێنی چاپ، مارسی ٢٠١٢، ل٧٧؛ کاکشار ئورەمار: س.پ، ل٢٤.

(٦) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٣١؛ غەنی بلوریان: س.پ، ل١٦، ٢١.

(٧) کاکشار ئورەمار: س.پ، ل٢٤.

(٨) غەنی بلوریان: س.پ، ل٥٨، ٥٩.

(٩) هـ.س، ل٥٩، ٦٠.

(١٠) عبدالله ئەحمەد رەسوڵ پشدەری: یادداشتەکانم، بغداد، دار الحریةللطباعة، ١٩٩٢، ل٧٢؛ کاکشار ئورەمار: س.پ، ل٢٤.

(١١) کەریمی حیسامی: لە بیرەوەرییەکانم، بەرگی یەکەم، سوید، ١٩٨٦، ل١١٣.

(١٢) ولیم أیغلتن الابن: جمهوریة مهاباد "جمهوریة ١٩٤٦ الکردیة"، ترجمة وتعلیق: جرجیس فتح الله، الطبعة الثانیة، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربیل، ١٩٩٩، ص١٥٥؛ جەلیل گادانی: با نەبێتە درۆی پاش مردوو، بێشوێنی چاپ، ٢٠٠٠، ل١٥.

(١٣) عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، کورتەیەك لە مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، کۆمیسیۆنی تەبلیغاتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ١٩٨٨، ل٢٦، ٢٧؛ بۆ زیاتر بڕوانە: (د.یاسین سەردەشتی: کوردستانی ئێران، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە جووڵانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد ١٩٣٩–١٩٧٩، چاپی دووەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠١١، ل١٥٨–١٦٧).

(١٤) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٢٦، ٢٧.

(١٥) غەنی بلوریان: س.پ، ل١٩.

(١٦) ڕاگەیەندراوی کۆمیتەی بەڕێوەبەری گشتیی یەکیەتیی لاوانی دێموکراتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەبۆنەی ساڵڕۆژی دامەزرانییەوە، ١٣٩٤/١/٢٢هـ؛ رەحمان نەقشی: ١٠ی خاکەلێوە رۆژی شەهیدان، س.پ، ل٧٧.

(١٧) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٢٧، ٢٨.

(١٨) غەنی بلوریان: س.پ، ل٢١.

(١٩) جەلیل گادانی: س.پ، ل١٧٥.

(٢٠) قاسمی قازی: وڵاتی من، بیرەوەرییەکانی حاجی عەبدوڵڵای قازی، سوید-ستۆکهۆڵم، ٢٠٠٥، ل٦٢.

(٢١) غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٢. جێی ئاماژەیە سەید عوبەیدیللای ئەیوبیان کە بەناوی نهێنی (هێدی/ قومری) لەدەستەی لاوانی کۆمەڵەی ژ.ك بووە، بێ ئەوەی ماوەکەمان بۆ دیاری بکات، دەڵێ: "دامەزرێنەر و سەرۆکی دەستەی لاوان من بووم". بڕوانە: (کەماڵ عەبدوڵڵاهی: سێبەری ئازادی، "هەورازو نشێوەکانی مێژووی خەباتی کۆمەڵەی ژێ.کاف" ١٣٢١-١٣٢٤، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٢٤٥).

(٢٢) غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٢، ٢٣.

(٢٣) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٤٥.

(٢٤) هـ.س، ل٢٩.

(٢٥) جەلیل گادانی: س.پ، ل٢٦٤.

(٢٦) بڕوانە: (ڕاگەیەندراوی کۆمیتەی بەڕێوەبەری گشتیی یەکیەتیی لاوانی دێموکراتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، س.پ).

(٢٧) قاسمی قازی: س.پ، ل٦٣؛ برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٤٧.

(٢٨) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٣٥، ٣٦، ٣٧؛غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٣.

(٢٩) کەماڵ عەبدوڵڵاهی: س.پ، ل٢٤٦.

(٣٠) غەنی بلوریان: س.پ، ل٥٦، ٥٧.

(٣١) قاسمی قازی: س.پ، ل٦٢.

(٣٢) غەنی بلوریان: س.پ، ل٤٤.

(٣٣) جەلیل گادانی: س.پ، ل١٧٥.

(٣٤) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٣٨.

(٣٥) غەنی بلوریان: س.پ، ل٥٢.

(٣٦) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٤١، ٤٢؛غەنی بلوریان: س.پ، ل٣٤.

(٣٧) جێی باسە کە دەقی شانۆی دایکی نیشتیمان لەلایەن کۆمەڵەی هیواوە نووسرابوو، لە باشووری کوردستانەوە بۆ کۆمەڵەی (ژ.ك)یان ناردبوو. بڕوانە: (د.عەبدوڵڵا مەردوخ: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردو کۆمەڵەی هیوا، بەشی دووەمو کۆتایی، گۆڤاری گزینگ، ژمارە (١٤)، زستانی ١٩٩٧، ل٣٠).

(٣٨) برایمی فەرشی: کورتەیەك لەسەر شانۆی دایکی نیشتیمان، گۆڤاری (گزینگ)، ژمارە (٧)، بەهاری ١٩٩٥، ل٢٣، ٢٥.

(٣٩) جوتیار تۆفیق: بیبلۆگرافیای ڕۆژنامەگەریی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانو دەرەوەیدا (١٩٠٨-١٩٨٨)، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٦١.

(٤٠) برایم فەرشی: کورتەیەك لەسەر شانۆی دایکی نیشتمان، س.پ، ل٢٥.

(٤١) غەنی بلوریان: س.پ، ل٣٧، ٣٨؛ برایم فەرشی: کورتەیەك لەسەر شانۆی دایکی نیشتمان، س.پ، ل٢٨.
(٤٢) جوتیار تۆفیق: س.پ، ل١٦١.
(٤٣) برایم فەرشی: کورتەیەك لەسەر شانۆی دایکی نیشتمان، س.پ، ل٢٥، ٢٦.
(٤٤) هێمن موکریانی: لەکوێوە بۆ کوێ؟ له کتێبی (دیوانی هێمن)، چاپو پەخشی چوارچرا، سلێمانی، بەهاری ٢٧٠٨ی کوردی، ل٤٨، ٤٩؛د.عەبدوڵڵا مەردوخ: س.پ، ل٣٤؛ برایم فەرشی: کورتەیەك لەسەر شانۆی دایکی نیشتمان، س.پ، ل٢٧.
(٤٥) ولیم أیغلتن الابن: مصدر السابق، ص٨٠، ٨١.
(٤٦) عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادی، بەرگی یەکەم، س.پ، ل٧٣.
(٤٧) غەنی بلوریان: س.پ، ل٦٠، ٦٤؛ رەحمان نەقشی: ١٠ی خاکەلێوە رۆژی شەهیدان، س.پ، ل٧٧.
(٤٨) مرکز بررسی اسناد تاریخی وزارت اطلاعات: جنبش چپ به روایت اسناد ساواك، حزب دمکرات کوردستان ایران، جلد اول، تهران، ١٣٧٨، ص٣٩.
(٤٩) کرێس کۆچێرا: کورد له سەدەی نۆزدەو بیستەم دا، وەرگێرانی: حەمە کەریم عارف، چاپی سێیەم، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٢١٢، ٢١٣؛ عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، بەرگی یەکەم، س.پ، ل٦٥، ٦٦.
(٥٠)ولیم أیغلتن الابن: مصدر السابق، ص١٥٣، ١٥٥.
(٥١) غەنی بلوریان: س.پ، ل٦٥، ٦٦.
(٥٢) هـ.س، ل٦٦–٦٧.
(٥٣) هـ.س، ل٦٧.
(٥٤) شایانی باسە لە ١٠ی ئایاری ١٩٤٦ هێزەکانی سۆڤیەتی لەژێر گوشاری ئەمریکاو بەریتانیا له ئێران کشانەوە. له رۆژی ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ سوپای ئێران گەرایەوە شاری مەهابادو کۆتاییان بە کۆماری کوردستان هێنا. (م.س. لازاریف و ئەوانی تر: مێژووی کوردستان، و: وشیار عەبدوڵڵا سەنگاوی، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٤٣١، ٤٣٢)؛ (عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادی، بەرگی یەکەم، س.پ، ل٨٤، ١١٧).
(٥٥) غەنی بلوریان: س.پ، ل٦٩، ٧٤.
(٥٦)ولیم أیغلتن الابن: مصدر السابق، ص٢٠٤.
(٥٧) کاکشار ئورەمار: س.پ، ٢٤.
(٥٨) غەنی بلوریان: س.پ، ل٧٦، ٧٧.
(٥٩) د. عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادی، فەسڵی سێهەم، ١٣٢٦–١٣٣٢، کۆمیسیۆنی تەبلیغاتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ١٩٩١، ل١٤.

(٦٠) غەنی بلوریان: س.پ، ل٧٨.
(٦١) د.یاسین سەردەشتی: هەڵوێستی حزبی توده لەحاست کێشەی نەتەوایەتیی گەلی کورد لە ئێران (١٩٤١–١٩٨٣)، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٧٠.
(٦٢) سدیق ساڵح (ئامادەکردنی): بیرەوەرییەکانی محەمەد شاپەسندی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٤٨؛د.یاسین سەردەشتی: کوردستانی ئێران، س.پ، ل٣٨٨.
(٦٣) گوندی سیتەك کەوتۆتە نێوان شاری سلێمانی و شارۆچکەی چوارتا و نزیکەی (١٥)کم لە سلێمانییەوە دوورە.
(٦٤) فاتح رەسوڵ: بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ لە کوردستان، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٩٤؛ جوتیار تۆفیق: س.پ، ل٤٠. شایانی باسە محەمەد شاپەسندی ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە گۆڤاری (ڕێگا) لە سیتەك چاپ کرابێت، تەنها ژمارە ١٠ی گۆڤاری (نیشتمان) چاپکراوەو بلوریان لەگەڕانەوەشیدا بۆ مەهاباد تەنها گۆڤاری نیشتمانی پێبووە. لەم بارەیەوە بڕوانە: سدیق ساڵح (ئامادەکردنی): س.پ، ل٥٠–٥٢.
(٦٥) غەنی بلوریان: س.پ، ل٨٢.
(٦٦) د.یاسین سەردەشتی: کوردستانی ئێران، س.پ، ل٣٩٠. بۆ تەواوی وتارەکەی بلوریان، بڕوانە: (د.یاسین سەردەشتی: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٢٢١–٢٢٦).
(٦٧) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٥٢.
(٦٨) سدیق ساڵح (ئامادەکردنی): س.پ، ل٥٠.
(٦٩) د.یاسین سەردەشتی: کوردستانی ئێران، س.پ، ل٣٨٩.
(٧٠) جوتیار تۆفیق: س.پ، ل١٠٤؛ رەحمان نەقشی: ١٠ی خاکەلێوە رۆژی شەهیدان، س.پ، ل٧٧.
(٧١) د. عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادی، فەسڵی سێهەم، س.پ، ل١٤.
(٧٢) م.س. لازاریف: س.پ، ل٤٣٨.
(٧٣) غەنی بلوریان: س.پ، ل٩٦، ٩٩.
(٧٤) م.س. لازاریف: س.پ، ل٤٣٨.
(٧٥) غەنی بلوریان: س.پ، ل٩٩.
(٧٦) رەحمان نەقشی: ١٠ی خاکەلێوە رۆژی شەهیدان، س.پ، ل٧٧.
(٧٧) غەنی بلوریان: س.پ، ل١٠٦، ١٠٧.
(٧٨) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٦٢.
(٧٩) غەنی بلوریان: س.پ، ل١١٥؛ برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١١٠.
(٨٠) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٨٣.
(٨١) غەنی بلوریان: س.پ، ل١١١، ١١٢.

(٨٢) د. عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادی، فەسڵی سێهەم، س.پ، ل٦٥، ٦٦؛ برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٩٨، ٩٩.

(٨٣) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١٠٦، ١٠٧، ١٠٩.

(٨٤) کریس کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستەم دا، س.پ، ٢٣٦.

(٨٥) د.یاسین سەردەشتی: هەڵوێستی حزبی تودە، س.پ، ل٧١؛ برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١١١.

(٨٦) د. عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، فەسڵی سێهەم، س.پ، ل٦١. دیارە حیزبی تودەش چالاکی بەفەرمی نەبوو، چونکە بەدوای تەقەکردن لە شا لەساڵی ١٩٤٩دا چالاکی ئاشکرای ئەو حیزبە قەدەغەکرا. حیزبی تودە چالاکی نیوە ئاشکرا– نیوە نهێنی هەبووە لەو ساڵانەدا. بۆ زیاتر بڕوانە: (د.یاسین سەردەشتی: هەڵوێستی حزبی تودە، س.پ، ل١٤، ١٦).

(٨٧) غەنی بلوریان: س.پ، ل١٢٧، ١٢٩؛ برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١١٦، ١١٩.

(٨٨) م.س. لازاریف: س.پ، ل٤٣٨.

(٨٩) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١٢٩، ١٣٠؛ عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، فەسڵی سێهەم، س.پ، ل٧٦؛هێمن موکریانی: س.پ، ل٧٩.

(٩٠) کریس کۆچێرا: کورد لەسەدەی نۆزدەو بیستەم دا، س.پ، ٢٣٦؛ م.س. لازاریف: س.پ، ل٤٣٩.

(٩١) غەنی بلوریان: س.پ، ل١٣٨.

(٩٢) جەلیل گادانی: س.پ، ل١٢٥.

(٩٣) فاتح رەسوڵ: س.پ، ل٢٠١؛ جوتیار تۆفیق: س.پ، ل٤٨.

(٩٤) غەنی بلوریان: س.پ، ل١٥٢، ١٥٣.

(٩٥) ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستان (ئێران) بۆ کۆنگرەی سێهەمی حیزب، رەزبەری ١٣٥٢– سپتامبری ١٩٧٣، ل١٩.

(٩٦) جێی ئاماژەیە کە بلوریان لە بیرەوەرییەکانیدا جەخت لەوە دەکاتەوە کە ڕۆژنامەی (کوردستان) لەو خولەیدا هەشت ژمارەی لێ دەرچووە. بڕوانە: (غەنی بلوریان: س.پ، ل١٥٥) ؛ (برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١٥٠).

(٩٧) کەریمی حیسامی: پێداچوونەوە، بەرگی دووەم، چاپخانەی کتێبی هەرزان، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٧، ل٣٢٦؛ کەریمی حیسامی: لە بیرەوەرییەکانم، بەرگی یەکەم، س.پ، ل٢٦١. شایانی باسە ژمارە ٢ی لە ١٩٥٤/٥/٥و ژمارە ٣ی لە ١٩٥٤/٦/٩و ژمارە ٤ی لە تەمموزی ١٩٥٤و ژمارە ٥ی لە ئەیلولی ١٩٥٤ چاپکراوە. هەروەها صارم الدین صادق وەزیریو قادری

یوسفی بەشدارییان لەچاپکردنی ئەو خولەی ڕۆژنامەی کوردستاندا هەبووە. بڕوانە: (جوتیار تۆفیق: س.پ، ل٤٨–٤٩).

(٩٨) ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستان (ئێران) بۆ کۆنگرەی سێهەمی حیزب، س.پ، ل١٩.

(٩٩) لەڕاستیدا وێڕای ئەوەی کە حیزبی دیموکرات لەساڵی ١٩٥٥ەوە بڕیاری پچڕانی پەیوەندی ڕێکخستنەکانی خۆی لەگەڵ حیزبی تودەدا، بەڵام تا ساڵی ١٩٦٠یش زیاتر عەقڵییەتێکی چەپی دوور لە نەتەوایەتی بەسەر ڕێبەرایەتی دیموکرات زاڵ بوو. (د. یاسین سەردەشتی: هەڵوێستی حیزبی تودە، س.پ، ل٧٩، ٨٠).

(١٠٠) سەید ڕەزا دروودگەر: کورتەی ژیانی سیاسیی ڕێبەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ١٩٤٥–٢٠٠٥، بەبۆنەی شەستەمین ساڵڤەگەڕی دامەزراندنی حیزبەوە، بێ ساڵو شوێنی چاپ، ل١٥؛ عبدالله حسن زادە: نیو سەدە تێکۆشان، لەکتێبی (کورتە مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران)، کۆمیسیۆنی چاپەمەنیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ٢٠٠٢، ل٢١٥؛ جەلیل گادانی: س.پ، ل١٢٣. ڕێبەرایەتی پێنج کەسی حدك جگە لە بلوریان، ئەوانی تر ئەوانە بوون: عەزیز یوسفی، ڕەحمەتوڵڵا شەریعەتی، عەبدوڵڵا ئیسحاقی (ئەحمەد تۆفیق)و د. قاسملوو. هەروەها د. مەولەویش وەك موشاویر دیاری کراوە. بڕوانە: (سەید ڕەزا دروودگەر: س.پ، ل١٥)؛ (عبدالله حسن زادە: نیو سەدە تێکۆشان، س.پ، ل٢١٥–٢١٦).

(١٠١) غەنی بلوریان: س.پ، ل١٥٧، ١٥٨؛ برایم فەڕشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١٥٩؛ جەلیل گادانی: س.پ، ل١٢٤.

(١٠٢) غەنی بلوریان: س.پ، ل ل١٦١، ١٧١، ١٧٥، ١٧٩، ١٨٤.

(١٠٣) عبدالله حسن زادە: س.پ، ل٢١٨.

(١٠٤) ڕەحمان نەقشی: ١٠ی خاکەلێوە ڕۆژی شەهیدان، س.پ، ل٧٧.

(١٠٥) برایم فەڕشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١٦١، ١٦٢؛ غەنی بلوریان: س.پ، ل١٨٤.

(١٠٦) مرکز بررسی اسناد تاریخی وزارت اطلاعات: مصدر قبلی، ص٣٩.

(١٠٧) م.س. لازاریف: س.پ، ل٤٥١؛ ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستان (ئێران) بۆ کۆنگرەی سێهەم، س.پ، ل٢٠.

(١٠٨) جەلیل گادانی: س.پ، ل١٢٤.

(١٠٩) عبدالله حسن زادە: س.پ، ل٢٢١؛ کاکشار ئورەمار: س.پ، ل٢٥.

(١١٠) برایم فەڕشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١٧٨؛ غەنی بلوریان: س.پ، ل٩٧، ٢٠٠.

(١١١) جەلیل گادانی: س.پ، ل١٨٣.

(١١٢) غەنی بلوریان: س.پ، ل ل٢٠٥، ٢١٩، ٢٢١.

(١١٣) فاتح ڕەسوڵ: س.پ، ل٢٠٨.

(١١٤) مرکز بررسی اسناد تاریخی وزارت اطلاعات: مصدر قبلی، ص٣٩.
(١١٥) غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٢٩، ٢٤٢.
(١١٦) مرکز بررسی اسناد تاریخی وزارت اطلاعات: مصدر قبلی، ص٣٩.
(١١٧) محەمەد ساڵح دیلان: دیوانی شیعر، ئامادەکردنو لێکدانەوەی پەراوێز نووسین و پێشەکی: د. عەبدوڵڵا ئاگرین، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، هەولێر–کوردستان، ٢٠١٣، پەراوێزی ل٢٥٤.
(١١٨) بۆ تەواوی دەقی شیعرەکە، بڕوانە: (محەمەد ساڵح دیلان: س.پ، ل٢٥٤–٢٥٨).
(١١٩) م.س. لازاریف: س.پ، ل٤٥١، ٤٥٢.
(١٢٠) غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٤١؛ جەلیل گادانی: س.پ، ل١٨٥.
(١٢١) مرکز بررسی اسناد تاریخی وزارت اطلاعات: مصدر قبلی، ص٣٩.
(١٢٢) مرکز بررسی اسناد تاریخی وزارت اطلاعات: مصدر قبلی، ص٣٩، ٤٠.
(١٢٣) قاسمی چیرە: ئاخرین ساتەکانی ژیانی "عەزیزی یوسفی" بەبۆنەی بیستەمین ساڵی مەرگییەوە، گۆڤاری گزینگ، ژمارە (٢٠)، هاوینی ١٩٩٨، ل٦٢؛ غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٤١.
(١٢٤) عبدالله حسن زادە: س.پ، ل٢٢١.
(١٢٥) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل١٩٢، ١٩٣.
(١٢٦) غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٤٦، ٢٤٧، ٢٥١.
(١٢٧) جەلیل گادانی: س.پ، ل٣٣.
(١٢٨) هـ.س، ل١٧٨–١٧٩.
(١٢٩) جێی ئاماژەیە ئەم چاوپێکەوتنەی بلوریان لەگەڵ خێزانو دوو کچەکەی لە زیندانی برازجان پاش پێنج ساڵ، دیمەنێکی خەمناکو تراژیدی هەبووە، ئەمەش لە بیرەوەرییەکانی ئەفسەرێکی تودەیی بەناوی "علی عموئی"، کە ماوەی بیست و پێنج ساڵ (١٩٥٤–١٩٧٩) لە زینداندا بوو، لەژێر ناوی "درد زمانە" ئاماژەی بۆکراوە، هەروەها بەوردی باسی ئەم قۆناغەی زیندانیبوونیان دەکات لەگەڵ غەنی بلوریان لە زیندانی برازجان و چەندین بیرەوەری هەیە ئاماژەیان پێدەکات. بڕوانە: (علی عموئی: درد زمانە، خاطرات محمد علی عموئی، چاپ چهارم، تهران، ١٣٨٠، ص ص ٢٥٩و٣٦٠).
(١٣٠) غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٥٢، ٢٥٦.
(١٣١) هـ.س، ل٢٧٥.
(١٣٢) جەلیل گادانی: س.پ، ل١٨٦.
(١٣٣) هـ.س، ل١٢٦.
(١٣٤) رەحمان نەقشی: لیستەی ئەندامانی ڕێبەری حیزبی دیموکراتی کوردستان لە کۆنگرەی یەکەم هەتا کۆنگرەی پازدەیەم، ساڵی ١٩٤٥– ساڵی ٢٠١١، سێپتامبری ٢٠١٢، ل٢، ٣؛ سەید رەزا دروودگەر: س.پ، ل٣٩؛ عبدالله حسن زادە: س.پ، ل٢٣٢، ٢٣٤.
(١٣٥) غەنی بلوریان: س.پ، ل ل٢٦٢، ٢٦٣، ٢٧٥.

(١٣٦) کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوەی کوردو هیوای سەربەخۆیی، وەرگێڕانی: ئـەکرەمی میهرداد، بەرگی دووەم، سەنتەری چاپو پەخشی تەما، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٨.

(١٣٧) مرکز بررسی اسناد تاریخی وزارت اطلاعات: مصدر قبلی، ص٣٩.

(١٣٨) قاسمی چیرە: س.پ، ل٦٢.

(١٣٩) جەلیل گادانی: س.پ، ل١٢٩، ١٧٤، ١٨٩؛ غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٨٠،٦.

(١٤٠) غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٨٢، ٢٨٣.

(١٤١) کاکشار ئورەمار: س.پ، ل٢٥.

(١٤٢) غەنی بلوریان: س.پ، ل٢٨٤.

(١٤٣) د.هۆشمەند عەلی مەحمود: ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان، لێکۆڵینەوەیـەك لـە دۆخـی سیاسـی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد (١٩٧٩–١٩٨٩)، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٢، ل٩٠.

(١٤٤) حمید شوکت: نگاهی از درون به جنـبش چـپ ایـران، گفتگـو بـا مهـدی خانبابـا تهرانـی، ص٥٦٣؛ غەنی بلوریان: ئاڵەکۆك، ل٣٠٠.

(١٤٥) کـەریمی حیسـامی: لـە بیرەوەرییـەکانم ١٩٧٩، بـەرگی شەشـەم، لـە بڵاوکراوەکـانی کتێبخانـەی کتێبـی هـەرزان، سـتۆکهۆڵم، ١٩٩٢، ل٢٣٤؛ غـەنی بلوریـان: ئاڵـەکۆك، ل٣٢٥، ٣٢٦.

(١٤٦) سـەید رەزا دروودگـەر: س.پ، ل١٨، ٣٩؛ عبداللـە حسـن زادە: س.پ، ل٣٥١، ٣٥٤، ٣٥٥.

(١٤٧) عبدالله حسن زادە: س.پ، ل٣٦١؛ غەنی بلوریان: س.پ، ل٣٣٠، ٣٣١.

(١٤٨) ستاد انتخاباتی حـزب دمکـرات کوردسـتان ایـران: اطلاعیـەء شمـارە ٢ سـتاد انتخابـاتی حزب دمکرات کوردستان ایران، ١٣٥٨/١٢/١١ه.

(١٤٩) کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوەی کوردو هیوای سەربەخۆیی، س.پ، ل٦٠.

(١٥٠) بۆ زیاتر دەربارەی پەیوەندی و تێکۆشانی قـاسملوو لـە حیزبـی تـودەی ئێـران، بڕوانـە: (هۆشمەند عەلی مەحمود شێخانی: عەبدولڕەحمان قاسملوو، ژیان و تێکۆشانی سیاسـی لـە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورددا ١٩٣٠–١٩٨٩، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٦٢–٧٢).

(١٥١) بۆ زیـاتر بڕوانـە: (د.هۆشمەنـد عـەلی مـەحمود: ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان، س.پ، ل٢٠٧–٢٢٥).

(١٥٢) مستەفا هیجری: نسکۆو دابڕان، چـاپخانەی سـەردەم، کوردسـتان، ٢٠١٥، ل٥٨،٥٩؛ بـۆ زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: (د.یاسین سەردەشتی: هەڵوێستی حیزبی تـودە، س.پ، ل٨٨–١٠٩).

(١٥٣) حمید شوکت: مصدر قبلی، ص٥٦٦.

(١٥٤) چرا اعلام موضع کردیم، رۆژنامەی کوردستان، ارگان کمیتە مرکزی حزب دمکرات کوردستان ایران (پیرو کنگرەء چهارم)، ژمارە (١)، دورەء جدید، دوشنبە ١٦ تیرماە ١٣٥٩- ٧ جولای ١٩٨٠، ل١-٢؛ مستەفا هیجری: س.پ، ل٦١.

(١٥٥) فاتح رەسوڵ: س.پ، ل٢٢٧؛ حەوت کەسەکەش ئەمانە بوون: (غەنی بلوریان، محەمەد ئەمین شێخ الاسلامی "م. هێمنی شاعیر"، ئەحمەد عەزیزی، فاروق کەیخوسرەوی، نوید معینی، فەوزیە قازی و رەحیم سەیفی قازی). (د.مصطفی ایزدی، جواد استکی، مسعود یاران: تاریخ بیست سالە پاسداری از انقلاب اسلامی در غرب کشور، ضد انقلاب واشرار "فعالیتهای ضد انقلاب"، جلد٣، مجاهدتهای خاموش- مجموعە چهارم- کتاب سوم، مرکز مطالعات وتحقیقات توسعە امنیت پایدار "پروژە شهید بروجردی"، چاپخانە سپاە پاسداران انقلاب اسلامی، ١٣٨٦، ص١٠).

(١٥٦) برایم فەرشی: سەدەی کارەسات، س.پ، ل٢١١، ٢١٢.

(١٥٧) نورالدین کیانوری: خاطرات نورالدین کیانوری، مؤسسە تحقیقاتی وانتشاراتی دیدگاە، انتشارات اطلاعات، تهران، ١٣٧٢، ص٥٣٣.

(١٥٨) کریس کۆچێرا: خەباتخوازی کورد، وەرگێرانی: ئاسۆ حەسەن زادە، بێ شوێن، ١٩٩٩، ل٨١.

(١٥٩) م.س. لازاریف: س.پ، ل٥٤٦.

(١٦٠) د. یاسین سەردەشتی: هەڵوێستی حزبی تودە، س.پ، ل١٠٣؛ أ. مەجید پور: شیکردنەوەیەك لەسەر پێداچوونەوەیەك، گۆڤاری هاوار، ژمارە (١٢)،ساڵی ٢٠٠٢، ل١٥؛ جەلیل گادانی: س.پ، ل٨٧. بۆ زیاتر بروانە: (سەعید کاوە (کوێستانی): ئاورێك لە بەسەرهاتەکانی خۆمو رووداوەکانی نێو حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بێ شوێنی چاپ، ١٩٩٦، ل ل٢١٤-٢١٥)؛ (مستەفا هیجری: س.پ، ل ل٦١-٦٦). جێی ئاماژەیە هەر لەم بارەیەوە فاتح رەسوڵ نووسیویێتی: "لەکۆتایی ١٩٨١دا هاوڕێ عەزیز محەمەد و من لە تاران بووینو ئاگادارکراین کە غەنی بلوریان داوای دیدەنی هاوڕێ عەزیز دەکاتو پێکرا چووین بۆ سەردانی. بینیم مام غەنی یەکجار پەستە و بەڕق و کینەوە هێرشی نارەواو توند دەکاتە سەر قاسملوو و سەرکردایەتیی حزبی دیموکراتی کوردستان. لە گوتەکانیدا نەیدەشاردەوە کە ئامادەیە بەچەك بەربەرەکانێیان بکات". بڕوانە: (فاتح رەسوڵ: س.پ، پەراوێزی ل٢٢٧).

(١٦١) مازیار بهروز: شورشیان ارمانخواە، ناکامی چپ در ایران، ترجمەء: مهدی پرتوی، تهران، ١٣٨٠، ص١٩٨.

(١٦٢) عبدالله حسن زادە: س.پ، ل٣٧٩.

(١٦٣) سعید کاوە (کوێستانی): دابڕان لە حیزب و لەتکردنی کۆمەڵگا لەپێناوی چیدا؟، بێ شوێنی چاپ، مارسی ٢٠٠٧، ل٩٨.

(١٦٤) غەنی بلوریان: س.پ، ل٣٥٧.

(١٦٥) حوسـێن بەخشـی: لێکـدابڕان، پێداچـوونەوەیەك بەسـەر چـۆنێتی پێکهـاتنی پێڕەوانـی کۆنگرەی چواری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێـران، ئـەڵمانیا، ٢٠٠٧، ل ل٥٣، ٥٤، ٥٥؛ فاتح رەسوڵ: س.پ، ل ل٢٢٨، ٢٢٩.

(١٦٦) حوسێن بەخشی: لێکدابڕان، س.پ، ل ل٥٨، ٥٩، ٦٠.

(١٦٧) کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوەی کورد و هیوای سەربەخۆیی، س.پ، ل٦٧.

(١٦٨) ماهنامه کازیوه: بدرود رفیق بلوریان، ماهنامـه کـازیوه (سـپیده دم)، نشـریه جمعـی از هواداران حزب توده ایران در کوردستان، شمـاره ششـم، اسـفند مـاه ١٣٨٩، ص١٧؛ فـاتح رەسوڵ: س.پ، ل٢٣٠؛ غەنی بلوریان: س.پ، ل٣٦٤.

(١٦٩) غەنی بلوریان: س.پ، ل٣٧٠.

(١٧٠) متن کامل نامه غنی بلوریان بەحزب کمونیست شـوروی، ١٥ خـرداد ١٣٦٦ برابـر ٥ ژوئـن ١٩٨٧،

(Research Association for Iranian Oral History (16-4-2015).

(http://www.iranianoralhistory.de/farsi/bedoune_login/Boulorian.html

(١٧١) حوسێنی بەخشی: دیدارێك لەگەڵ کەسایەتی ناوداری کـورد "غـەنی بلوریـان"، گۆڤـاری هاوار، ژمارە (١٧)، ساڵی ٢٠٠٥، ل٢٨.

(١٧٢) غەنی بلوریان: س،پ، ل٣٧٠، ٣٧١.

(١٧٣) بۆ دەقەکەی بڕوانە: (حوسێن بەخشی: لێکدابڕان، س.پ، ل ل ٨١–٩٠).

(١٧٤) بۆ دەقەکەی بڕوانە: (حوسێن بەخشی: لێکدابڕان، س.پ، ل ل ٩٠–٩١).

(١٧٥) رەحمان نەقشی: ١٠ی خاکەلێوە رۆژی شەهیدان، س.پ، ل٧٨.

(١٧٦) پـەیامی دەفتـەری سیاسـیی حیزبـی دێمـوکراتی کوردسـتان، بەبۆنـەی کۆچـی دوایـی نیشتمانپەروەر مامە غـەنی بلوریـان، ١٩ی رەشـەمەی ١٣٨٩/ ١٠ی مارسـی ٢٠١١؛ کاکشـار ئورەمار: س.پ، ل٢٥.

(١٧٧) حوسێنی بەخشی: دیدارێك لەگەڵ کەسایەتی نـاوداری کـورد "غـەنی بلوریـان"، س.پ، ل٢٨.

(١٧٨) بـــی بـــی ســـی فارســـی: غنـــی بلوریـــان فعـــال باســـابقه کـــرد درگـذشـــت، http://www.bbc.co.uk/persian/iran/2011/03/110309_u04_bolourian_obituary.shtml?print=1؛ جەلیل گادانی: س.پ، ل١٧٣.

(١٧٩) بڕوانـە: (تـاهیری عـەلیار: ئاڵـەکۆك، گێژەڵووکـەی جـەعل و زریـانی تـەحریف، گۆڤـاری گزینگ، ژمارە (١٦)، هاوینی ١٩٩٧).

(١٨٠) فاتح رەسوڵ: س.پ، پەراوێزی ل٢٢٧.

(١٨١) بی بی سی فارسـی: مصـدر قبلـی؛ رەحمـان نەقشـی: ١٠ی خاکـەلێوە رۆژی شـەهیدان، س.پ، ل٧٨؛ هەروەها بگەڕێوە بۆ: (ئەرشیفی کوردستان تیڤی، هەواڵەکان، ٢٠١١/٣/١٦).

## ملخص البحث

## غني بلوريان، حياته ونضاله السياسي (١٩٢٤-٢٠١١)

غني بلوريان من الشخصيات السياسية البارزة في شرق كوردستان، حيث قام بدور بارز خلال مدة تتجاوز الخمسين عاماً من القرن المنصرم، ونتيجة لنضاله في سبيل تحقيق اهدافه السياسية قضى ٢٥ عاماً من حياته في سجون النظام البهلوي.

كانت حياة بلوريان ومواقفه السياسية محل جدل بين الباحثين لاسيما اعدائه ممن لايوافقونه تلك المواقف حيث انهم لم يأخذوا بنظر الاعتبار سوى الجانب السلبي من حياته ومن هذا المنطق حاولوا اعطاء حياته صبغة سوداء. لذا جاء هذا البحث كمحاولة لاعادة النظر في حياة هذا السياسي البارز استناداً الى المنهج الاكاديمي في البحث التاريخي معتمدين على عدد من المصادر الاساسية في ذلك.

اقتضت طبيعة البحث ان يقسم الى ثلاثة اقسام، كل قسم يحوى عدة محاور. القسم الاول عن حياة بلوريان المبكرة ونضاله السياسي حتى سقوط جمهورية كوردستان (١٩٢٤–١٩٤٧) حيث تضمن ثلاثة محاور كل واحد منها يتناول جانب من تلك الحقبة. اما القسم الثاني فقد تم فيه تسليط الضوء على نضاله السياسي للفترة الممتدة بين (١٩٤٨–١٩٧٨) في مبحثين منفصلين ابتداءَ في دوره في اعادة تأسيس الحزب الديمقراطي الكوردستاني في ايران (حدك) لينتهي به الحال الى سجون النظام مابين (خريف ١٩٥٨– خريف ١٩٧٨). اما القسم الثالث والاخير فقد خصص للبحث في نضاله بين اعوام (١٩٧٩–٢٠١١) ابتداءَ من عودته الى كوردستان ومشاركته في حركة التحرر الكوردستانية ولجوئه الى ديار الغربة حتى سنة ٢٠١١.

# Abstract

**Ghani Bloorian**

**Life and Political Struggle (1924-2011)**

Ghani Bloorian is a famous East-Kurdistan political figure. He was a political activist for a half century from 1940s until 1990s of the past century. During this time, he spent 25 years in Pahlavi regime prisons and 20 years in exile for his struggle to achieve his political goals.

His political life which was combination of ups and downs of political life , his political stands have caused a lot debate among researchers. His opponents have always evaluated his political life in perspective and have only focused on his political failures. They have painted all his political life dark. This research papers attempts to shed light on Ghani Blooriani's life stages by relying on scientific and historical methods and historical sources to evaluate his political life realistically.

This study consists of three main parts, each is divided into sections. First part focuses on his growth and political struggle until the fall of Republic of Mahabad during 1924-1947. This part is divided into three sections. First section talks about his growth and his education. Second section sheds light on his struggle in Kurdish youth (1942-1943). Third section is specific to his membership and struggle in Kurdish Revival group and Kurdistan Democratic Party (1944-1947). Second part of the study focuses on the political struggle of Bloorian during (1948-1978). And in two different sections, his role in reestablishment of Kurdistan Democratic Party in (1948-1958) and his political imprisonment between (Fall of 1958 to Fall of 1978) are elaborated on. Third and last part is about political struggle during (1979-2011) and is divided into two sections. First section talks about his return to Kurdistan and participation in the Kurdistan Freedom Movement (1979-1984). Second section is about the final stage of his political life and exile life between (1984-2011).

# (ابن أبي الهيجاء)ی هەزبانی و ڕێبازی لە نووسینی مێژوودا

**((توێژینەوەیەکی شرۆڤەکارییە))**

**د.مەهدی عوسمان هەروتی**

بەشی مێژوو- فاکەڵتی پەروەردە- زانکۆی کۆیە

## پێشەکی:

ئەو توێژینەوەیە لێکۆڵینەوەیەکی شرۆڤەکارییە لە ڕێبازی نووسینی کتێبی (تاريخ ابن أبي الهيجاء)ی (مير عزالدين محمد کوڕی أبي الهيجاء)ی ناسراو بە هەزبانی ئەربیلی، لەدایکبووی ساڵی (٦٢٠ك/١٢٢٣ز)، واتە ناوبراو لە بنەماڵەیەکی کوردی هەزبانییە، ئەوانەی چ لە دامەزراندنی میرنشینی هەزبانیدا لە هەولێر، یان لە چوارچێوەی هەردوو دەوڵەتی ئەیوبی و مەملوکیدا ڕۆڵی زۆریان گێڕاوە، ئەمەو جگە لەو توانا زانستی و زیهنییەی هەیانبووە لە بوارە جیاوازەکانی زانست و زانیاری و بەڕێوەبردندا و خستوویانەتە ڕوو لە مێژوودا.

ئەم کتێبە زۆربەی مێژوونووسان تەئکید لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لە چەند بەشێك پێکدێت، یان لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێبێت) دەست پێدەکات و تاکو ساڵی (٦٩٩ك/١٣٠٠ز) بەردەوام دەبێت لە تۆمارکردنی ڕووداوەکاندا، بەڵام ئەوەی تا ئێستا لەبەردەستدایە و دۆزراوەتەوە تەنها مێژووی نزیکەی دوو سەدەیە لە مێژووی ساڵانە ، کە لە ساڵی (٣٥٨ك/٩٦٨ز) دەست پێدەکات و لە (٥٥٢ك/١١٥٧ز) کۆتایی پێدێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تیشك دەخاتە سەر بەشێکی گرنگی مێژووی ئیسلامی و سەدەکانی ناوەڕاست، و ئاماژەی زۆری کردووە بە ڕووداوە گرنگەکانی تایبەت بە میرنشین و ناوچە کوردییەکان و بەشێك لە خەلیفەکانی عەباسی و فاتیمی، و بوەیهییەکان و دەوڵەتی زەنگی و خاچ دروشمەکان، و وڵاتی شام و میسر و بەشێك لە ڕۆژئاوای

ئیسلامیش. گرنگیی زانیارییەکانی لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە بەشێکی زۆری مێژوونووسانی تر پەیان پێ نەبردووە، تەنانەت لە هاوچەرخەکانیشی.

چەند هۆکارێك هەن کە وا لە توێژەر دەکەن گرنگی بە کەسایەتی و کتێبی (ابن أبي الهيجاء) بدات، لەمانە: ناوبراو سەرکردە و فەرمانڕەوا بووە بۆ دیمەشق، و شاعیر و مێژوونووسیش بووە لە هەمان کاتدا، و نووسراوەکەشی لە بارەی مێژوو لە ڕاستیدا دەستکەوتێکی شارستانییە بۆ کورد، ئەو میللەتەی کە بوونی خۆی چەسپاند لە شارستانیەتی ئیسلامیدا، و هەم پێی کاریگەر بوو، و هەم کاریشی تێیدا کرد، لەبەر ئەوەی هەر میللەتێك بەرەو ئاشتی و سەرکەوتن و شارستانیەت بڕوات، پێویستە لەسەری بگەڕێتەوە بۆ بیر و هزر و داب و نەریت و مێژووی، بۆ ئەوەی ڕێگای لەبەردەمدا ڕۆشن بکات بۆ ئەو مەبەستە.

سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئەم توێژینەوەیەش ئەوا پێکهاتووە لە دەروازەیەك و دوو تەوەرە. دەروازە تایبەتکراوە بە ژیان و سەردەمی مێژوونووس لە ڕووی زانستییەوە، بەڵام تەوەرەی یەکەمی ڕێبازەکەی لە نووسینەوەی مێژوودا بە شێوەیەکی شرۆڤەکارییانە لە چوار ناونیشان خراوەتەڕوو کە یەکەمیان بە ناوی: قەبارە و ڕووپێوی ڕووداوەکان، و دووەمیان: مێژووی ڕووداوەکان، و سێیەمیان: زانیارییە شارستانییەکان، و هەرچی چوارەمیشە ئەوا بە ناونیشانی: ژیاننامەی کەسایەتی (تەراجم)ەکانە، سەبارەت بە تەوەرەی دووەمیش، کە بەناونیشانی (سەرچاوەکانی کتێبەکەی)یەتی ئەویش لە سێ ناونیشانی دیکەدا باسی لێوەکراوە وەك یەکەم: کتێب و سەرچاوەی نووسراون دووەم: زانیاریی زاردەمی، و سێیەمیشیان: ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێی وەرگرتووە.

ئەوەی جێگای ئاماژەیە ئەوەیە کە توێژەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشتی بەستاوە بە هەردوو نوسخەی تەحقیقکراو، کە یەکەمیان لە لایەن صبحي عبدالمنعم محمد بە ئەنجام گەیەنراوە، و لە وڵاتی میسر لە ساڵی (١٩٩٣ز) لە چاپ دراوەو دووەمیشیان لە لایەن (احمد فريد المزيدي) لە (بیروت) لە ساڵی (٢٠٠٤ز) بە ئەنجام گەیەنراوە. بەڵام بۆ شرۆڤەکردنی ڕووداوەکان زیاتر کار لەسەر کتێبی دووەمیان کراوە.

هەروەها بۆ ئەم مەبەستەش توێژەر سەرەڕای کتێبەکەی (ابـن أبـي الهيجـاء) خۆی پشتی بەستاوە بە ژمارەیەك سەرچـاوەی دیکـە کـە هەنـدێکیان هاوچـەرخی نووسـەرو هەندێکیشـیان لـە دوای ئـەوەوە نووسـراون، لـە پێنـاو بـەراوردکردن و سوودبینین لە بۆچوونەکانیان لەسەر نووسەر و ڕووداوەکانی نێو کتێبەکە.

## دەروازە/ ژیان و سەردەمی ( ابن أبي الهيجاء )ی هەزبانی:

### یەکەم/ ژیانی:

مـیر عزالـدین محمـد کـوڕی أبوالهیجـاء کـوڕی محمـدی هـەزبانی أربـل – {هەولێرییە}[1]، و لە سـاڵی (٦٢٠ك/١٢٢٣ز) لـە شـاری نـاوبراو لـە دایـك بـووە[2]. ئەمـــەش ئـــەو لایەنـــە ڕوون دەکاتـــەوە کـــە هەزبانییـــەکان دوای ڕووخـــانی میرنشینەکەیان لە شاری أربل– هەولێر لە شێوەی بنەماڵە و میرایەتی پلەوپایـەی دیاریان هەبووە لە ناوچەکانیان، بەتایبەتی لـە سەرچـاوەکانیش هـەر بـە نازنـاوی میر ناوبراون[3].

شایەنی باسە ناوبراو لە تەمەنی گەنجێتیدا دەچێتە شاری قـاهیرە لـە وڵاتـی میسر و دواتر[4] ڕوو دەکاتە وڵاتی شام، و دوای بە شداریکردنی لە چەندین بـواری زانستیدا[5]، لە هەمان کاتدا ڕۆڵی زۆر گرنگی لە بوارەکانی سیاسـی و سەربازیشـدا دەگێڕێت، بەتایبەتی لەو کاتەدا کە وڵاتی شام یاخود جیهانی ئیسلامی بـە گشـتی بەرەو ڕووی چەندین مەترسی گەورە دەبێتەوە، لەمانە وەك هێرشـکاری مـەغۆلی و خاچ دروشم و کێشە و ململانێی مەمالیکەکان لە میسر و شام لە نێوان خۆیانـدا[6]. ئـەوەبوو لـە نێـو ئـەو بارودۆخـەدا لـە سـاڵی (٦٨٤ك/١٢٨٤ز) لـە لایـەن سـوڵتانی مەملوکی: السـلطان الملـك المنصـور سـيف الـدين قـلاوون (٦٧٨–٦٨٩ك/١٢٧٩–١٢٩٠ز) وەکو ئامادەکاری و چاکسـازییەك لـە بـەڕێوەبردنی شـاری دیمەشـق و لـە پێنـــاو دەســـت واڵابـــوون بـــۆ بـــەرەو ڕووبوونـــەوەی هێرشـــکاری و دوژمنـــە دەرەکییەکانی، میر (عزالدین محمد بـن أبـي الهيجـاء)ی هـەزبانی دەکـات بـە والی دیمەشق و والی پێشووتر لە پۆستەکەی دەخـات[7]. بـەم شـێوەیە مـیری نـاوبراوی هـەزبانی لـە پۆسـتەکەیدا دەمێنێتـەوە بـۆ مـاوەی شـازدە سـاڵ و تـاکو کۆچـی دواییکردنی لە ساڵی (٧٠٠ك/١٣٠١ز)[8].

گومانی تێدانییە مانەوەی ناوبراو بۆ ئەو ماوە درێژە لە فەرمانڕەوایەتیکردنی شاری دیمەشق لە سەردەمێکدا کە پڕیەتی لە ڕووداوی گەورە و چڕ بە شەڕوشۆڕ دژی مەغۆل و تەتەرەکان لە ڕۆژهەڵات و خاچ دروشمان لە باکور و ڕۆژئاوا، ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە لەسەر لێهاتوویی میر عزالدین لە شەڕو ئاشتیدا، بەتایبەتی لە بەڕێوەبردنی شارەکە هەروەکو الصفدي لە بارەیەوە دەڵێت: ((... وكان جيد السياسة))[9]، هەر بۆیە ئەو ماوە زۆرە ماوەتەوە لە پۆستەکەیدا، هەروەها بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە تا ئەوپەڕی جێگای متمانەی سوڵتانە مەمالیکەکان بووە، لەبەر ئەوەی هەر وەك دەزانرێت ولاتی شام باڵی لای ڕۆژهەلاتی دەسەلاتی مەمالیکەکان و قوولایی ستراتیجییەتی سیاسەتی پێکدەهێنان.

هەروەها دەبێت ئەوەش بوترێت کە مانەوەی میری ناوبراو بۆ ئەو ماوە درێژە بە فەرمانڕەوایی دیمەشقی پایتەختی ولاتی شام دەبێت بەشدارییەکی زۆریشی هەبێت لە دروستکردنی ڕووداوە سیاسی و سەربازییەکان، بەتایبەتی بە شێوەیەکی کرداری لە سالی (٦٩٠ك/١٢٩٠ز) بەشداری دەکات لە جیهاد و شەڕکردن دژی خاچ دروشمان، کە ئەو کاتە سەردەمی سوڵتانی مەملوکی الملك الاشرف خليل کوڕی منصور قلاوون(٦٨٩-٦٩٣ك/١٢٩٠-١٢٩٣ز) بوو[10].

میر ابن أبي الهيجاء شوێنی نیشتەجێبوونی لە شاری دیمەشق وەك مێژوونووس ابن كثير ئاماژەی بۆ دەکات لە شوێنێك بوو ناسرابوو بە (درب سعود-سقور)[11]. بەلام بەهۆی خۆشەویستی و ناودەرکردنی میری ناوبراو بەڕادەیەك لە نێو خەڵکی شارەکەدا ئەم شوێنە ناوەکەی زیاتر لە نێو خەڵکەکە دەناسرا بە(درب ابن أبي الهيجاء)[12]، ئەمەش گومانی تێدانییە دەبێت زیاتر بۆ ڕەنگدانەوەی کارو کردەوەکانی ئەم فەرمانڕەوایە بگەڕێتەوە بەرامبەر بە خەڵکی ژێر فەرمانڕەواییەکەی بۆیە ئەمەش بۆتە هۆکارێك کە خەڵکی شارەکە ئەوەندە لایان خۆشەویست بێت و تەنانەت ناوچەکە بە ناوی ئەوەوە ناوبنێن، ئەوەتا ژمارەیەکیش لە مێژوونووسان کاتێك دێنە سەر باسی مردنی کەسایەتییە ناودارەکانی سالانی (٧٠٠ك/١٣٠١ز) ئاماژە بە میر ابن أبي الهيجاء دەکەن و

دەستەواژەیەك دووبارە دەکەنەوە و دەڵێن: ((...زانا بووە بە ئـەدەب و مێـژوو، و خاوەن ژیاننامە و خووڕەوشتێکی باش بوو))[13].

میر عزالدین محمد کوڕی ابن أبي الهیجـاء کـوڕی محمـدی (أربـل)—هـەولێری هەزبانی لە ساڵی (٧٠٠ك/١٣٠١ز) لە کاتی گەڕانەوەیدا لە میسرەوە بۆ دیمەشق لـە ڕێگادا لە ناوچەیەك بە ناوی (السوادة) کە گوندێکی سـەر بـە پارێزگـای ڕۆژهـەڵات (الشرقیة)یە[14] لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کۆچی دوایی دەکـات[15] و دەگوازرێتـەوە بۆ چیای قاسیون[16] و هەر لەوێش دەنێژرێت[17].

**دووەم/ سەردەمەکەی لە ڕووی زانستییەوە:**

مـیر عزالـدین کـوڕی ابـن أبـي الهیجـاء هـەر لـە تەمـەنی گەنجێتییـەوە وەك دەردەکەوێت ڕووی کردۆتە وڵاتی شـام، و بەشـداری بەرچـاوی کـردووە لـە بـواری زانستی ناوچـەکە، هـەروەك بـە گـوێرەی شـایەتیدانی مێـژوونووس (الصـفدي) لـە کتێبـی (الـوافي بالوفیـات)دا دەڵێـت: ((بەشـدارییەکی باشـی هـەبوو لـە مێـژوو، و ئـەدەب، و زانسـتی کـەلام))[18]. هـەروەها هاوڕێیـەتی و بەشـداری دانیشـتنەکانی فەیلەسووف و زانای ئیسلامی سەردەمەکەی خۆی (العز الضریر)[19]ی کـردووە[20] و چـەندین شـیعری لێـی وەرگرتـووەو گێڕاویەتیـەوە، هـەردوو کەسـایەتیی نـاوبراو هاوڕێیەتییـەکی پتـەویان لـە نێوانـدا هـەبووە. تەنانـەت لـە ڕۆژی مردنـی (العـز الضـریر)دا مـیری هـەزبانی لـە لایـدا ئامـادە بـووە[21]، و زۆر پێـی کاریگـەر بـووە بەڕادەیەك هەندێ لە مێژوونووسان پێیان وایە لەسـەر مەزهـەبی شـیعەی عەلـەوی بێت[22] لەبەر ئەو هاوڕێیەتییە و هەندێ لە نووسینەکانی، وەك: ناوبردنی خەلیفەی فاتیمییەکان بە نازناوی (ئیمام)[23].

بەڵام دەکرێت وەڵامـی ئـەو مێژوونووسـانە بـەوە بدرێتـەوە، کـە نـەخێر ئـەو بۆچوونە هەڵەیە و دوورە لە ڕاستییەوە، بـەڵکو لەبـەر ئەوەیـە ئـەو کاریگەربوونـە دەبینرێت چونکە میر ابن أبي الهیجاء و عز الضریر خەڵکی یـەك ناوچـە و لـە یـەك نەتەوە بوونە و لە وڵاتی شامدا ژیاون کە شوێنی نەتەوەیی خۆیان نییەو هەستیان بە نامۆیی کردووە لە ناوچەکە ئەگەرچـی هاوئـاینیش بـن، بۆیـە ئەمـە وایکـردووە ئەوەندە نێوانیان خۆش بێت، ئەمە جگە لـە بـوونی هاوڕێیەتییـەکی ئاسـایی و بـە یەکتر سەرسام بوون.

هەروەها ناوبردنی خەلیفەی فاتیمییەکانیش بە (ئیمام–پێشەوا) لەبەر ئەوە بووە کە مێژوونووسێکی بابەتییانە بووە و مامەڵەی لەگەڵ ڕاستییە مێژووییەکان هەروەك چۆن بووە لە سەردەمەکەیدا ئاوا کردووە، واتە دەکرێت بوترێت مەرجی ئەمانەتی زانستی مێژوویی و ڕێبازی زانستییانەی مێژوویی جێبەجێکردووە لەم لایەنەدا، لەبەر ئەوەی بەو جۆرەی دەوترێت ئەگەر بە لایەنگیری مەزهەبی شیعەگەری بینووسیبایە دەبوو نازناوی خەلیفەکانی دەوڵەتی عەباسی کە دوژمنی فاتیمییەکان بوون بە خەلیفە نەبردبایە، بەڵام ئەوەی جێی تێڕامانە ئەوەیە کە بە هەمان شێوە نازناوی خەلیفەکانی عەباسیشی بە خەلیفە بردووە[٢٤] بۆیە دەکرێت بوترێت کە مێژوونووس ابن أبي الهيجاء لە نووسینەکانیدا پابەند بووە بە نووسینی ڕێبازگری مێژوویی.

سەرەڕای ئەمانەی باسکرا ئەم گوتەیەی لە بارەی تاوانبارکردنی بە شیعە دەگوترێت، لەگەڵ ڕاستییە مێژووییەکانی ئەو کاتەش ناگونجێ کە مەمالیکەکان خۆیان بە پارێزەری مەزهەبی سوننی ئیسلام دادەنا وەك ئەیوبییەکانی پێش خۆیان، چۆن کەسێکی وەکو میر ابن أبي الهيجاء لە پۆستی فەرمانڕەوایەتی ولایەتی دیمەشق دادەنێن بۆ ماوەی چارەگە سەدەیەك.

بە هەر جۆرێ بێت، هەندێ لە مێژوونووسی دیکە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی ئاماژەی بۆکرا، هەڵدەستن بە پاگژکردنەوەی پەرێزی میری ناوبراو، و وەك سوننە مەزهەبێك مامەڵەی لەگەڵ دەکەن لەم تۆمەتەدا و دەڵێن: ((... و خاوەن ژیاننامە و خووڕەوشت و گوتاری باش بوو))[٢٥].

سەردەمی ناوبراو سەردەمی زێڕینی چالاکیی زانستی و هزری بوو، و ژمارەیەکی زۆر لە زانایان سەریانهەڵدا لە پاڵ بەرهەمێکی یەکجار زۆری زانستی، ئەمەش زیاتر لە ئەنجامی ئەو گرنگیدانەی دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەی مەمالیکەکان بوو بە زانست و زانیاری، یان درێژکراوەی سەردەمی پێشووتر بوو کە ئەیوبییەکان بوون، ئەوەبوو چەندین کتێبخانە و بنکەی زانستی بنیادنرا و گرنگی زۆر بە زانایان و نووسین و پەیداکردنی کتێب درا، ئەوەتا ئەو کتێبخانەیەی سەر بە قوتابخانەی کاملی بوو، کە مەلیك کاملی ئەیوبی لە ساڵی (٦٢١ك/١٢٢٤ز) بنیادی نا، نزیکەی سەد هەزار کتێبی لە خۆ دەگرت.

هەر لەو سەردەمەدا ژمارەیەكی زۆر لە زانایان لە چەندین لایـەن ناوبانگییـان دەركردبـوو لەمانـە وەك: (ابـن العـديم، م: ٦٦٠ك/١٢٦١ز) خـاوەنی كتێبـی (بغيـة الطلـب في تـاريخ حلـب) و (زبـدة الحلـب مـن تـاريخ حلـب). و (أبـو شـامة، م: ٦٦٥ك/١٢٦٦ز) خاوەنی كتێبی (الروضتين في اخبار الدولتين النوريـة والصـلاحية)، و(ابن ابي أصـيبعة، م: ٦٦٨ك/١٢٦٩ز) خـاوەنی كتێبـی (عيـون الأنبـاء في طبقـات الأطباء)، وە(ابن خلكان، م: ٦٨١ك/١٢٨٢ز) خاوەنی كتێبی (وفيات الأعيان وانباء ابناء الزمان)، و( ابن واصل، م: ٦٩٧ك/١٢٩٧ز) خاوەنی كتێبی (مفـرج الكـروب في اخبار بني أيـوب)، وە(ابـن منظـور المصـري الافريقـي، م: ٧١١ك/١٣١١ز) خـاوەنی كتێبی زمانەوانیی ناودار (لسان العرب)، وە (قطب الـدين ابـي الفـتح موسـی كـوڕی محمـد اليـونيني، م: ٧٢٦ك/ ١٣٢٥ز) خـاوەنی كتێبـی (ذيـل مـرآة الزمـان) كـە هاوڕێیەتییـەكی پتـەوی لەگـەڵ مير(ابـن أبـي الهيجـاء)دا هـەبووە، هـەروەها زانیارییەكی زۆری لە میری ناوبراو وەرگرتـووە بـۆ نووسـینی كتێبـی نـاوبراوی[٢٦]. هەروەها ( الذهبي، م: ٧٤٨ك/١٣٤٧ز) كە خاوەنی ژمارەیەك كتێبـە بـە ناوەكـانی (تاريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام)، (دول الاسلام)، (العبر فی خبر مـن غـبر) ئەمەو چەندین كتێـب و مێژوونووسـی تـر كـە ئەمانـە هـەمووی مانـای گەشـاوەیی سەردەمی میر (عزالدين ابن أبي الهيجاء)ی هەزبانییە لە ڕووی زانسـت و زانیـاری و پێشكەوتنی جیهانی ئیسلامیی ئەو كاتە.

### تەوەرەی یەکەم/ ( ابن أبی الهیجاء )ی هەزبانی و نووسینەوەی مێژوو:

دەستنووسەکەی ئەم کتێبە وەك تەحقیقکارانی ئاماژەی بۆ دەکەن کە بە ناوی (الاول في تاريخ ابن أبي الهيجاء)ە لە (٢٠٧) پەڕە پێکدێت[٢٧] و هەر پەڕەیەك لە (٢٣)دێر و لە هەر دێرێك نزیکەی (١٠) وشەیە، جگە لەو پەڕانەی ئاماژەی بە دێرە شیعرەکان کردووە، کە هەر بەیتە شیعرێکی لە دێرێك نووسیوە[٢٨].

ئەم دەستنووسە پارێزراوە لە کتێبخانەی (الاحمدی) لە تونس بە ژمارەی (٤٩١٥ ف ١٦)[٢٩]، وێنەیەکیشی لە پەیمانگای زانکۆی عەرەبی بۆ دەستنووسەکان لە قاهیرە بە ژمارە (٩٤٥ تاريخ) پارێزراوە[٣٠].

ئەوەی جێگەی گرنگی پێدانە ئەوەیە کە ئەم دەستنووسە دوو جار تەحقیقاکراوە، یەکەمیان لە لایەن صبحي عبدالمنعم محمد، لە چاپخانەی (الشروق) لە شاری (الفيوم) لە میسر لە ساڵی (١٩٩٣ز) تەنها بۆ یەك جار بە چاپ گەیەنراوە. بەڵام دووەمیان لە لایەن أحمد فريد المزيدي وەکو پاشکۆی کتێبی (تاريخ القضاعي) ناسراو بە(عيون المعارف و فنون اخبار الخلائف)ی (أبي عبدالله محمد بن سلامة بن جعفر القضاعي، م: ٤٥٤ك/١٠٦٢ز) لە چاپخانەی (دار الكتب العلمية) لە شاری بەیروت لە ساڵی (٢٠٠٤ز)دا بۆ یەك جار لە چاپ دراوە.

#### یەکەم/ قەبارە و ڕووپێوی ڕووداوەکانی:

ئەوەی لەم دوو تەحقیقکرانەدا دەبینرێت و خراوەتەڕوو دەردەکەوێت کە ئەم کتێبە لە کتێبەکانی مێژوویی گشتییە و لەسەر شێوازی تۆماری ساڵانە (حوليات)یە و ئاماژە بە ڕووداوی بچووك و هەندێ لە ساڵی مردنی کەسایەتییەکان لە کۆتایی ڕووداوە مێژووییەکان دەکات، و هەروەها زۆر زیاتریشی نووسیوە لەوەی لەبەر دەستە لە بارەی مێژووەوە، لەبەر ئەوەی کۆتاییهاتنی تۆماری ڕووداوە مێژووییەکانی کتێبی (تاريخ ابن أبي الهيجاء) لە ساڵی (٥٥٢ك/١١٥٧ز) شتێکە دەکرێت چەند لێکدانەوەیەکی جیاوازی بۆ بکرێت، ئەویش وەك ئەوەی کە ئایا ناوبراو خۆی لێرەوە کۆتایی بە زنجیرەی ڕووداوەکان هێناوە؟ یان هۆکارێك هەبووە؟ یان ڕووداوێکی گرنگ ڕوویداوە و وایکردووە ناوبراو نووسینەکانی ڕابگرێت. بەڵام وەك دیارە هیچ ڕووداوێکی ئەوتۆ بەدی ناکرێ یان بەپێ زنجیرەی مێژوویی هیچ وەستان لەو ساڵەدا بەدی ناکرێت. هەروەها عزالدين ابن أبي الهيجاء

خۆیشی لە ساڵی (٦٢٠ك/١٢٢٣ز) لە دایك بووە و تاكو ساڵی (٧٠٠ك/١٣٠١ز) ژیاوە و نزیكەی (١٦) ساڵیش لە نێو دەسەڵاتدا بووە لە دیمەشق، بەمە دەبوو نووسینەكانی زۆر بە پێز و دەوڵەمەندتر بكردایە بە زانیاریی مێژوویی گرنگ لە ڕاستیدا ڕووداوەكانی سەردەمی خۆی یان (حسام الدین)ی باوكی و باپیریشی كە ڕۆڵی زۆریان هەبووە لە سەردەمەكەی خۆیاندا. لە كۆتاییدا دەكرێت بوترێت گومان لەوەدانییە كە ئەم كتێبە زۆر زیاترە لەوەی لەبەر دەستدایە، بە بەڵگەی ئەوەی هەروەكو مێژوونووس (بدرالدین العیني، م: ٨٥٥ك/١٤٥١ز) لە بارەی چوارچێوەی ڕووداوەكانی كتێبی ناوبراو دەڵێت: ((تیایدا دەستی پێكردووە لە پێغەمبەرەوە (د.خ) تاكو ڕووداوی یان شەڕی غازان))[٣١].

ئەو شەڕەی لە نێوان غازان (٦٩٥-٧٠٤ك/١٢٩٥-١٣٠٤ز)ی پاشای تەتەر و سوڵتان الناصر محمد كوڕی قلاوون (٦٩٣-٧٤١ك/١٢٩٣-١٣٤٠ز) ڕوویدا[٣٢] لە (٢٨ی ربیع الاول)ی ساڵی (٦٩٩ك/١٣٠٠ز) واتە بەر لە مردنی (ابن أبي الهیجاء)ی هەزبانی خۆی بە یەك ساڵ، لەبەر ئەوەی خۆی لە ساڵی (٧٠٠ك/١٣٠١ز) وەك ئاماژەی بۆكرا مردووە. واتە ئەوەی ڕوونە ئەوەیە كە بەشێكی زۆری ئەم كتێبە تاوەكو ئێستا نەدۆزراوەتەوە، یان بەهۆی ئەو هەموو كارەسات و نەهامەتی و تاڵانییە لە دوای ئەودا لە جیهانی ئیسلامیدا ڕوویانداوە بۆتە هۆی لەناوچوونی.

بەڵام ئەوەی تاوەكو ئێستا دۆزراوەتەوە و لەبەر دەستە تەنها بەشێكی ناوەڕاستی كتێبە گەورەو گشتییەكەی پێكدێنێ كە لە ساڵی (٣٥٨ك/٩٦٨ز)یە ئەوە ئەگەر ئەو ڕایە ڕاست بێت، كە نووسەر لەسەر بیروباوەڕی مەزهەبی شیعی بێت دەبێت لەبەر ڕووداوی دەست بەسەرداگرتنی وڵاتی میسر لە لایەن فاتیمییەكانی كردبێتە سەرەتای ئەو بەشەی كتێبەكەی كە لەو ساڵەدا دوای ئەم ڕووداوە خیلافەتەكەیان بە شێوەیەكی گەورەو فراوان دروست دەبێت. بەڵام لە بارەی ساڵی كۆتاییهاتنی ڕووداوەكانی كتێبەكە (هەرچەندە هەردوو موحەقیق لە پێشەكیدا كەوتوونەتە هەڵەوە كە هی یەكەمیان (صبحي عبدالمنعم محمد)ە كۆتاییەكەی بە ساڵی (٥٨٩ك/١١٩٣ز) ئاماژە بۆ دەكات، دووەمیان كە (أحمد فرید المزیدي )یە كۆتایی ڕووداوەكانی لە پێشەكی بە ساڵی (٥٢٢ك/١١٢٨ز) دیاری دەكات، بەڵام ئەوەی جێگای باسە ئەوەیە كە هەردووكیان لە خستنەڕووی

نــاوەڕۆکی کتێبەکــەدا لــە ســاڵی (٥٥٢ك/١١٥٧ز) کۆتاییيــان بــە باســکردنی ڕووداوەکان هێناوە، ئینجا ئەم هەڵەیەی لە پێشەکیدا کردوویانە هەڵەی چاپە یان خۆیــان هــەر ئەوەنــدەیان لــە دەستنووســەکە زیــاد و کــەمیان بــە ڕووداوەکــانی ناوەڕۆکەکە کردووە لەبەر ناڕوونیی دەستنووسەکە وەك (صبحي عبدالمنعم محمد) پێی هەڵساوە، یان بۆ زیادکردنی ڕووداوەکانی لەبەر گرنگیــی ئــەو ڕووداوانــەی لــە دوای (٥٢٢ك/١١٢٨ز)یەوە دێت وەك (أحمد فريد المزيدي) کردوویەتی.

ئەوانــەی باســکران ســەبارەت بــە مــاوەی زەمــەنی کتێبەکــە بــوون. بــەڵام سەبارەت بە چوارچێوەی مەکانیشی ئەوە وەك لە شوێنی ڕووداوەکانــەوە تێبینــی دەکرێت زیاتر گرنگیداوە بە وڵاتی شــام و میســر کــە شــوێنی نیشــتەجێبوونیەتی، هەروەها لەگەڵ عێراق و (ناوچــە کوردنشــینەکان) کــە شــوێنی نەتــەوەیی و زێــدی باوك و باپیرانیەتی، ئەمە سەرەڕای گرنگیدانی بە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئیسلامی ئەو کاتە لە (ماوراء النهر)و (مەغریب) و(ئەندەلوس)، بــەڵام بەڕادەیــەکی کــەمتر. بەتایبــەتیش وەك لــە خوێنــدنی ڕووداوەکــان هەســتی پێــدەکرێت زیــاتر نووسینەکانی چڕکردۆتەوە لەسەر ناوچــەکانی کوردســتان و عێــراق و شــام، لەبــەر ئەوەی ئەو ناوچانە زیاتر گۆڕەپانی ڕووداوە سیاسی و سەربازییە گرنگــەکانی ئــەو کاتە بوون لە نێو ئەو ڕووداوانەش، و لە هەموویان گرنگتر میرنشینە کوردییــەکانی وەکو هەزبانی و مــەڕوانی و عەنازییــە، یــان دەســەڵاتداریەتی بــوەیهی و هەڵمــەتی خاچی و ئەتابەگیەی زەنگییەکان و ململانێکانیانە لە جیهانی ئیسلامیدا.

هەر سەبارەت بە قەبارە و ڕووپێوی ڕووداوەکــانی ئــەم کتێبــە ئــەوەی زیــاتر تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە نایەکسانی، یان ناهاوسەنگییەکی زۆر هەیــە لــە نێــوان گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا، کە لە هەندێکیاندا ئەوەندە زانیارییەکان کورت و پوخــت دەبنەوە، بە دێرێك یان نیو دێر ئاماژەی بۆ دەکات، و خەریك دەبێت ماناکــەی لــە دەســت بــدات، نموونــە هــەروەکو لــە ڕووداوی ســاڵانی (٤٠٧، ٤٠٩، ٤١٩ك/١٠١٦، ١٠١٨، ١٠٢٨ز)[٣٣] و چــەند ســاڵێکی تــر ئامــاژەی بــۆ کــردووە، لــە بەرامبــەردا لــە هەندێك ساڵدا ڕووداوەکان ئەوەندە درێــژ دەکاتــەوە کــە لــە لاپەڕەیــەك تــاکو ســێ لاپــەڕە داگــیر دەکــات، بــە نموونــە وەك لــە ڕووداوەکــانی ســاڵانی (٥٤٤، ٥٤٩، ٥٥٢ك/١١٤٩، ١١٥٤، ١١٥٧ز)[٣٤].

دەکرێت ئەم زۆرو کەمەی زانیاریی تۆمارکراوی نووسەر بۆ ئاست و توانای زانیارییەکانی بگێڕدرێتەوە، کە لە هەندێ ساڵدا یان ڕووداودا زانیاریی زۆری دەستکەوتووە، و لە هەندێکیانیش کەمی دەستکەوتووە. یاخود لەو زانیارییانەی بە کورتی باسی کردوون وەك بڵێی مەبەستی ئەوە بووە خۆی لێیان ببوورێت و لابدات، یان زەق و دیاریان نەکات.

**دووەم/ مێژووی ڕووداوەکانی:**

ڕێبازی (ابن أبي الهيجاء) لەو کتێبەدا تۆمارکردنێکی ساڵانەیە، و ئاماژەی ڕووداوی بچووك، و هەندێك لە ساڵی مردنی کەسایەتییەکان لە کۆتایی هەر ساڵێکدا، بەڵام هەرچی ڕووداوە گەورەکانە لە چوارچێوەی ساڵەکەدا ناونیشانی بۆ داناون، بە نموونە هەروەکو کاتێك لە ڕووداوەکانی ساڵی (٤٨٧ك/١٠٩٤ز) دێتە سەر باسی میرنشینیی مەڕوانی ناونیشانێکی تایبەتی بۆ دادەنێت و دەڵێت: ((فصل في ولاية بني مروان الكردي) کە لێرەدا هاوسۆزی نەتەوەیی بە ئاشکرا دەردەکەوێت لەبەر ئەم گرنگیدانەی. وە ڕووداوی ساڵێك لە ساڵێکی تردا باس ناکات تەنها ئەگەر پێویستی بە تێکهەڵکێشان هەبێت، لە ترسی پەرتەوازە بوونی هەواڵەکان، بەڵام نەیتوانیوە هاوسەنگییەك دروست بکات لە نێوان قەبارەی ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، و نێوان هەواڵی دەوڵەت و دەسەڵاتدارە جیاوازەکاندا، هەروەکو تێبینی دەکرێت مێژووی ڕووداوەکانی ڕۆژئاوای ئیسلامی بە شێوەیەکی کورت و پوخت و کەم دەخاتەڕوو، لەو کاتەدا کە لە باسی ڕووداوە ناوخۆییەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، بەتایبەتیش دەسەڵاتدار و میرە کوردەکان[٣٥]، یان دیاردەکانی کەشوهەواو زەوی لەرزین و گرانی و قات و قڕی و پەتا.

ئەو کەرەستە مێژووییانەی لەم کتێبەدا هەیە دەکرێت بخرێتە چوارچێوەی دوو شێواز لە شێوازەکانی نووسینەوەی مێژوویی، یەکەمیان: هەواڵی، و دووەمیانە ساڵانە (حولی).

شێوازی هەواڵی لە لایەن (ابن أبي الهيجاء)دا لەو کاتەدا دەردەکەوێت کاتێك وەسفی یەك ڕووداو دەکات و زۆرجار دەگات بە چەند دێڕێك، لە هەمان کاتدا هەندێ جاریش چەند لاپەڕەیەك لەخۆ دەگرێت، هەروەها دەبینین دەستەواژەی

((وفيها ورد الخبر)، يان ((والسبب فيه))، دوای ئەوە پوختەیەكی هەواڵی جێی مەبەست دەخاتەڕوو[٣٦].

لە جیاكارییەكانی نووسینی هەواڵی لە لایەن (ابن أبي الهيجاء) پشت بەستانە بە بەڵگەی شیعری شاعیرانی هاوسەردەمی خۆی، یان ئەوانەی پێش خۆی، وە دەكرێت بوترێت كە ئەو شیعرانە خزمەتێكی ئەوتۆ بە دەقە مێژووییەكان ناكات لەبەر ئەوەی ئەگەر بێتو لە دەقەكانی دەربێنین هیچ زیانێكی بۆ بونیادی دەقە مێژووییەكەو لاوازكردنی نابێت، ئەمەش لەبەر پەیوەندیی لاوازی بە ڕووداوەكانی كە بەهۆیەوە دەوترێت، یان وتراوە[٣٧].

لە سروشتی نووسینی هەواڵی لە لایەن دانەر خستنەڕووی هەندێ لە ڕووداوە كاریگەرەكانە لەسەر شێوەی گفتوگۆ لە نێوان دروستكەری ڕووداو. لەوانەیە ئەوەشی بۆ ئەوە كردووە كە ویستوویەتی ئەو وێنەیە بخاتەڕوو بەبێ لێكدانەوە و شیكردنەوە، بۆ ئەوەی بوار بڕەخسێنێ بۆ خوێنەر خۆی تاكو تێڕامان و لێكدانەوە بۆ ڕووداوەكان بكات.

بەڵام لە لایەنی شێوازی ساڵانە، ئەوە شێوەیەك لە شێوەكانی نووسینەوەی مێژووییە بە گوێرەی ڕووداوەكانی ساڵانە، و بە دوای یەكداهاتنی، (ابن أبي الهيجاء) بابەتە مێژووییەكەی ئەم كتێبەی بە شێوازێكی ساڵانە داناوە، و بەمەش لە خستنەڕووی نووسینە مێژووییەكانیدا دەرنەچووە یان لای نەداوە لەو كلتوورە ئیسلامییە نووسراوانەی شێوازی ساڵانە. بەڵام ئەوەی جێگای تێبینییە ئەوەیە كە بازدانێكی زۆر لە نێوان ڕووداوەكانی ساڵێك بۆ ساڵێكی تر دەبینرێت واتە دوای كۆتاییهاتنی ڕووداوەكانی ساڵێك گەلێك جار ساڵێك یان چەند ساڵێكی بازداوە، واتە ئاماژەی بە ڕووداوەكانی نەكردووە و چۆتە سەر ڕووداوی چەند ساڵێك دواتر، بە نموونە هەروەكو لە دوای تەواوبوونی لە خستنەڕووی ڕووداوەكانی ساڵی (٤١١ك/١٠٢٠ز) ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر ساڵی (٤١٨ك/١٠٢٧ز)[٣٨] یان لە دوای ڕووداوەكانی ساڵی (٥٠٩ك/١١١٥ز) بەبێ ئەوەی هیچ ڕووداوێك لەساڵی (٥١٠ك/١١١٦ز) ئاماژە بۆبكات ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر ڕووداوەكانی ساڵی (٥١١ك/١١١٧ز)[٣٩] ئەمەو چەندین جار ئەوەی دووبارە كردۆتەوە. ئینجا ئەمەش یان لەبەر نەبوونی زانیارییە كە نووسەر ئەوەندەی دەستنەكەوتووە، یان حەزی

بە ڕووداوەکانی ئەم سالانە نەکردووە کە پشتگوێی خستوون ، چونکە دەیتوانی چۆن بۆ ئەو زانیارییانەی نووسیویەتی سەیری سەرچاوەی پێش خۆی کردووە دەیتوانی بۆ ئەمانەش هەر وا بکات. یاخود دەشکرێت ئەم دەست نووسەی کە دۆزراوەتەوە دەست و خەتی خۆی نییەو ئەو کەسەی لە دوای ئەو هاتووە و دووبارە نووسیویەتیەوە ئەم سالانەی پشتگوێ خستووە و هەولی کورتکردنەوەی کتێبەکەی داوە.

سەرەڕای ئەمانەی باسکران (ابن أبي الهيجاء)ی هەزبانی لە کتێبەکەیدا لە خستنەڕووی ڕووداوەکاندا کەمتر وردەکاری لە کاتی ڕوودانیان دەخاتەڕوو بەتایبەتی دیاریکردنی بە کاتژمێر یان شەو یان ڕۆژ یاخود ڕێکەوتی ڕۆژ و مانگ، بەلکو زیاتر بە سال دیاریان دەکات تەنها لە چەند ڕووداوێکی دیاریکراودا نەبێت ئەوەتا هەروەکو لە باسی ڕووداوی باران بارین لە نیسانی سالی (٥٤٢ك/١١٤٧ن)[٤٠] یاخود لە خستنەڕووی ڕووداوی دەست بەسەرداگرتنی شاری دیمەشق لە لایەن نورالدين محمود (٥٤١-٥٦٩ك/١١٤٦-١١٧٣ن) ئاماژە بەوە دەکات کە ناوبراو لە (١٠-صفر-٥٤٩ك/١١٥٤ن) هێرشی کردۆتەسەر شارەکە[٤١]. کە ئەمانەش هەمووی مانای ورد نەبوونی نووسەری ناوبراوە لە مێژووی ڕووداوەکاندا.

لە ڕووی زاراوەیی و وردی لە دیاریکردنی کاتی ڕووداوەکانیش جیاوازی، یان دەکرێت بوترێت هەلەی زۆری لێ بەدی دەکرێت، بە نموونە هەروەکو لە ڕووداوەکانی سالی (٤١٩ك/١٠٢٨ن) لە باسی گرتنی شاری داقوق (دقوقا) لە لایەن (ابن ابي الشوك)ی میر میرنشینی عەنازی نازناوەکەی بە (الشاهنكاری) دەبات[٤٢]، کە لە بنەچەدا (الشاذنجانية-شادنجانی)[٤٣]یە هەر لەبەر ئەوەشە دەکرێت بلێی کە زۆر لەو جیاوازییانەی لە ڕێکەوتی ڕووداوەکاندا هەیەتی لەگەل سەرچاوەکانی تردا بەشی زۆری هەلەیە چونکە لە چەند ڕووداوێکدا بە تەنیا ئەو نووسەرە جیاوازی هەیە لەگەل کۆمەلێك لە سەرچاوەی دیکە، ئینجا لەم هەلەکردنەی یان بەهۆی دووری بووە لە ڕووداوەکاندا، بەتایبەتی ئەوانەی لە کوردستان یان میسر و ناوچەی دیکە ڕوویانداوە، یان بەشێکی زۆری سەرچاوەی زانیارییەکانی زاردەمین و هەلەی تێ کەوتووە تا گەیشتۆتە دەستی، یاخود بە کەمتەرخەمی وەریگرتوون یان سەرچاوەکانی لاوازبوون، بە نموونە وەك لە ڕووداوی کوژرانی ئەو سەرکردە

ڕۆمییەی ناوی (دامیانوس–دهلاسینۆس) بوو بە دەستی سەربازێکی کوردی نێو سوپای فاتیمی بە ناوی (ابوالحجر احمد کوڕی الضحاك)ی کوردی دەکوژرێ. مێژوونووسان ڕێکەوتی ڕووداوەکە بە ساڵی (٣٨١ك/٩٩١ز) دیاری دەکەن[٤٤]. بەڵام (ابن أبي الهيجاء) پێیوایە ئەم ڕووداوە لە ساڵی (٣٨٧ك/٩٩٧ز) ڕوویدابێت[٤٥].

لە بارەی ڕووداوی دەست بەسەرداگرتنی (أربل)– هەولێر و کۆتاییهێنان بە میرنشینی هەزبانی لە لایەن عمادالدین زنكی (٥٢١–٥٤١ك/١١٢٧–١١٤٦ز) لە ساڵی (٥١٩ك/١١٢٥ز) دیاری دەکات[٤٦]، بەڵام ئەگەرچی مێژوونووسانی تر جیاوازییان لە نێواندا هەیە لەوەی (ابن العبري) ساڵی (٥٢٠ك/١١٢٦ز)[٤٧] دیاریدەکات و (ابن واصل)[٤٨]، وسبط ابن الجوزي)یش ساڵی (٥٢٦ك/١١٣١ز)[٤٩].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زانیارییەکەی (ابن أبي الهيجاء) هەر هەڵەیە لەبەر ئەوەی عمادالدین دوای وەرگرتنی دەسەڵاتی ئەتابەگیەی موسڵ لە ساڵی (٥٢١ك/١١٢٧ز) دەستی بە هەڵمەتەکانی بۆ ناوچە کوردییەکان کرد نەوەکو ساڵی (٥١٩ك/١١٢٥ز) کە هێشتا ئەو دەسەڵاتەی نەبوو یاخود سەبارەت بە کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی سەلجوقییەکان دیسان کەوتۆتە هەڵەوە کە ساڵی (٥٤٨ك/١١٥٣ز)ی بۆ دیاریدەکات[٥٠].

هەروەها لە هەندێ شوێن لە کتێبەکەیدا نەگونجان لە نێوان زانیارییەکاندا هەستی پێدەکرێت ئەوەتا هەروەکو ئەوەی لە ڕووداوی ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧٠ز) دەڵێت: ((تيايدا فەرەنگەکان دوورگەی سەقلیە[٥١]یان گرت))[٥٢]. دوای ئەوە هەمان گوتە لە ڕووداوەکانی ساڵی (٤٦٤ك/١٠٧١ز) دیسان دووبارە دەکاتەوە[٥٣]، بەبێ ئەوەی ئاماژە بەوە بکات کە لە دوای داگیرکرانی یەکەمی فەرەنگەکان بۆ سەقلیە موسڵمانەکان لەژێر دەستیان دەرهێناون یان نا!

### سێیەم/ زانیارییە شارستانییەکان:

لەم کتێبەدا زانیارییەکی زۆر سەبارەت بە بوارە جیاوازەکانی شارستانیەتی ئیسلامی لە بنیادنان و شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و باج و پیتاك و دسەڵاتداران و شاعیران و نەهامەتی و قات و قڕی و گرانی و کارەساتە سروشتی و گۆڕانە کەش و هەواییەکان دەبینرێت. بەتایبەتی لە بارەی بنیادنان و بیناسازیدا چەند ئاماژەیەکی مێژوویی دەبینرێت لەم کتێبەدا ئەویش هەروەکو بنیادنانی

مزگـەوتی (السـلطان) لـە لایـەن سـوڵتان (مليكشـاه)ی سـەلجوقی (٤٦٥-٤٨٥ك/١٠٧٢-١٠٩٢ز) لە شاری بەغدا لە ساڵی (٤٨٥ك/١٠٩٢ز)[٥٤]، یان بنیادنانی قوتابخانـە و تەکیـە و خانـەقا، لـە لایـەن وەزیـر (نظـام الملـك أبوالحسـن علـي الطوسـي)، و بنیادنـانی دوو منـارەش هـەر لـە لایـەن (مليكشـاه)و لـە هـەمان ساڵیشدا[٥٥].

لە بواری ئابووریشدا بە هەمان شێوە چەند ڕووداوێك دەخاتەڕوو کە گرنگیـی خۆیان هەیـە ئـەویش وەك ئـەوەی هـەر لـە ڕووداوەکـانی سـاڵی (٤٨٥ك/١٠٩٢ز)دا ئاماژە بـە لادانـی ڕێژەیـەکی زۆری بـاج و پیتـاك دەکـات لەسـەر خـەڵك لـە لایـەن سوڵتان (مليكشـاه)[٥٦]دا. ئەمـە جگـە لـە باسـکردنی بـوونی ئـەمن و ئاسـایش لـە سەردەمی سوڵتانی ناوبراودا[٥٧].

گومانی تێدانییە ڕووداو و کارەساتە سروشـتییەکان و بڵاوبوونـەوەی پـەتا و نەخۆشییەکانیش کە خۆی لـە خۆیـدا بەشـێکی گرنگـی نووسـراوە مێژوویییـەکانی سـەدەکانی ناوەڕاسـتی ئیسـلامی پێکـدەهێنن، و تەنانـەت سـەرەڕای ئـەوەی لـە درێژەی باسی ڕووداوە سیاسی و سەربازییەکانیان دەپرژانـە سـەر ئـەو کارەسـاتە سروشـتییانەی لـە سـەردەمی پـێش خۆیـان، یـان هـەر لـە سـەردەمەکەی خۆیـان ڕوویـان دەدا، تەنانـەت گـەلێك جـار مێـژوونووس و زانـای وا هەڵدەکـەوت کتێبـی تایبەتی لە بارەوە دەنووسین، ئینجا (ابن أبي الهيجاء)ی نووسەری کتێبی (تـاريخ ابن أبي الهيجاء)ی هەزبانیش یەکێکە لە مێژوونووسە ساڵانەییەکانی کە لـە کـاتی خستنەڕووی ڕووداوە سیاسی و سەربازییەکان گرنگیی زۆری بە گۆڕانکارییە کـەش و هەواییـەکان و پـەتا و نەخۆشـییە بڵاوەکـان، و کارەسـاتی سروشـتی داوە بەڕادەیەکی زۆر، ئەوەتا هەروەکو لە ڕووداوەکانی سـاڵی (٤٢٠ك/١٠٢٩ز) بـاس لـە بارینی تەزرەیەك دەکات لە عێراق کێشەکەی (گوایـە) ١٥٠ ڕەتـڵ[٥٨] بـووە[٥٩]. لـە هەمان کاتدا هەر لەو دەقە وەسفێکی جوان بۆ ئەو تەزرەیە دەردەبـڕێ و دەڵێـت: ((وەکو گای نووستوو وابوو))[٦٠]. یان وەك لە ڕووداوەکانی سـاڵی (٤٨٥ك/١٠٩٢ز) ئاماژە بە بارینی تەزرەیەك دەکات لە شاری بەسـرە و دەڵێـت: ((... کێشـی هـەر تەزرەیەك ١٠ ڕەتڵ دەبوو))[٦١]، یاخود هەر لەو بوارەدا ئامـاژە بـە ژمارەیـەك لـەو دیاردە کەش و هەوایی و سروشتی وەکو بومەلەرزە یان زریان و هەورە تریشـقە و

برووسك و بەفر و باران و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و پەتا دەکات لە ڕووداوی ساڵەکانی (٥٤١، ٥٤٢، ٥٤٣، ٥٤٦ك/١١٤٦، ١١٤٧، ١١٤٨، ١١٥١ز)[٦٢] و چەندین ساڵی دیکە لە نێو کتێبەکەدا.

هەروەها سەبارەت بە بارودۆخی تەندروستی و کاروباری ئاینی و نوێژ و خوداپەرستی و کۆڕ و کۆبوونەوە و ژمارەی دانیشتوانی چەند ناوچەیەکی وەکو موسڵ، دیسان زانیاریی گرنگ دەخاتەڕوو ئەوەتا لە کاتی ئاماژەدان بە بڵاوبوونەوەی ئەو پەتایەی لە ساڵی (٤٤٠ك/١٠٤٨ز) لە موسڵ و جەزیرە و بەغدا بڵاوبوویەوە ئەوە دەخاتەڕوو کە ژمارەی دانیشتوانی شاری موسڵ بەر لە پەتایەکە (٣٠٠.٠٠٠) کەس بووە، و هەفتانە (٤٠٠) کەسیان لە نوێژی هەینیدا ئامادە دەبوون، بەڵام دوای ئەم پەتایە زۆربەی دەمرن و تەنانەت لاشەی مردووشیان خواردووە[٦٣]. واتە بە گوێرەی ئەمە دەبێت تووشی گرانی و قات و قڕیش بووبن بە گوێرەی ئەم ڕووداوە و خستنەڕووی ئەو ژمارە وردانەی نوێژکەران و دانیشتوانی شارەکە ئەوە دەردەخات کە مێژوونووس سەرەڕای ورد نەبوونی لە هەندێ لایەنی تر و نەگونجانی زانیارییەکانی کتێبەکەی، بەلام لەم بوارەدا ڕووداوەکانی بە ڕێکوپێکتر دەخاتە بەردەستی خوێنەرانی بۆ ئاشنابوون بە ژمارەی دانیشتوان و بواری تەندروستی و نەهامەتی و قات و قڕی و گرانییەکانی کە بەسەر ناوچەکەدا هاتوون.

هەر لە بواری کۆمەڵایەتی و ئاینیدا لە ڕووداوی چەند ساڵێکدا کۆمەڵێك لە کێشە و ململانێی دانیشتوانی عێراقی خاوەن مەزهەبی سوننی و شیعی و هەوڵەکانی چارەسەری و نەمانی کێشەکان دەکات بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ لایەنگیرییەکی لەم بوارەدا هەبێت بۆ لایەنێك لە لایەنەکان، بەتایبەتی مەزهەبی شیعی [کە ئەمەش وەڵامێکی ترە بۆ ئەو کەسانەی پێیان وایە شیعە مەزهەب بووە، لەبەر هاوڕێیەتییەکەی بۆ العز الضرير و لە نووسینەکانیشی گوایە لایەنگیری مەزهەبی شیعی کردبێت بەهۆی هێنانی ناوی خەلیفەکانی فاتیمی بە نازناوی ئیمام. لە بری ئەوەی بە مێژوونووسێکی بێلایەن و پابەند بە زانستی مێژوویی ڕێبازگر ناوزەدی بکەن] هەروەکو لە ڕووداوەکانی ساڵانی (٤٤١، ٤٤٢، ٤٤٣ك/١٠٤٩، ١٠٥٠، ١٠٥١ز) ئاماژەی بۆ کردووە[٦٤].

یەکێکی دیکە لە لایەنە شارستانییەکانی، گرنگیدانی زۆریتی بە بواری ئەدەب و شیعر و شاعیران کە لە زۆربەی ڕووداوەکانـدا چـەند دێـرە شـیعرێکی خـۆی یـان شاعیرانی نووسیوە، یان وەك لە بابەتی کەسـایەتییەکان دێینـە سـەری زۆرترینـی ئەو کەسایەتییانەی ساڵی مردنی تۆمارکردوون شاعیرن کە لەگەڵ چـەن دێڕێـك لـە شیعرەکانیان ئاماژەی بۆ کردوون گومانی تێدانییە ئەمەش دەگەڕایەوە بـۆ حـەز و خولیا و بەهرەمەندیی خۆی لەو بوارەدا هەروەکو (المقريزي) لە بارەیەوە دەڵێـت: ((... وكان عالماً بالأدب والتاريخ... — زانا بووە بە ئەدەب و مێژوو...))[٦٥]، یـان وەك (الصـفدي)، دەڵێـت: ((بەشـدارییەکی باشـی هـەبوو لـە مێـژوو، و ئـەدەب، و زانستی کەلام))[٦٦].

هـەروەها دانیشـتنی زۆری لەگـەڵ (العـز الضـرير) هـەبووە و چـەندین دێـرە شیعری لێ گێڕاوەتەوە[٦٧]. واتە بە گشتی ئەم بوارە کە شیعر و ئەدەبە بە یـەکێك لە زانستە گرنگی پێدراوەکانی خۆی بووە بۆیە بەو جـۆرە لـە کتێبەکەیـدا ڕەنگـی داوەتەوە.

نموونەی ئەمەش هەروەکو لە کاتی مردنی کەسایەتی و شاعیر (ابوالعلاء) لـە ساڵی (٤٤٩ك/١٠٥٧ز) لـە هـەمان کاتـدا چـەند دێڕێـك لـە شـیعرەکانی دەخاتـەڕوو وەك:

((صرف الزمان مفـرق الالفين فاحكم الهي بين ذاك وبيني
انهيت عن قتل النفوس تعمدا وبعثت انت لقبضها ملكين
وزعمت ان لـــــــها معادا ثانيا ماكان اغناها عن الحالين...))[٦٨]

لە هەمان کاتدا لە ڕووداوی وەرگرتنی دەسەڵات لە لایـەن (مـیر سـديد الملـك علي کوڕی منقذ) لە ساڵی (٤٧٩ك/١٠٨٦ز) لە قەڵای شیزر[٦٩]، کـە یـەکێك بـوو لـە شـارەزایانی زمـان و نـەحو و شـیعر لـە وڵاتـی شـام وەك ئـەوەی کـە شـیعرەکانی دەنووسێت و دەڵێت:

((احبابنا لو لقيتم في مقامـــــكم من الصبابة مالاقيت في الطعن
لاصبح البحر من انفاسكم يبسا كالبر من ادمعي ليشق بالدفن..))[٧٠].

**چوارەم/ کەسایەتییەکان:**

لایەنێکی هـەرە گرنگـی دیکـەی نووسـینەوەی مێـژوویی بـە شـێوازی سـاڵانە ژیاننامـەی کەسـایەتییە ناودارەکانـە کـە لـە چوارچـێوەی ڕووداوە مێژووییـەکان ئامـاژەی بـۆ دەکرێـت، (ابـن ابـي الهیجـاء)ی هـەزبانیش بـە هـەمان شـێوەی مێژوونووسانی سەدەکانی ناوەڕاست لەم ڕێبازە لای نـەداوە، بـەڵام ڕێژەکـەی زۆر کەمترە بە بەراورد بە گەورەیی و زۆریی ڕووداوە سیاسی و سەربازییەکانی دیکەی کە جێگای گرنگی پێدانیەتی تەنانـەت لـە چـەند سـاڵێکدا هەڵکـەوتووە و ڕووداوی مێژوویی خستۆتە ڕوو بەبێ ئەوەی هیچ ژیاننامە و کەسـایەتییەکی ناسـاندبێ یـان ئامـاژەی بـۆ کردبـێ، بـە نموونـە وەك لـە سـاڵی (٣٥٨ك/٩٦٨ز) تـاوەکو سـاڵی (٣٦٥ك/٩٧٥ز) هیچ ئاماژەیەك لە بارەی مردنی کەسایەتییەکان نابینرێت[٧١]، یـان لە هەندێ ساڵدا تەنها ئاماژەی بـە مردنـی کەسـایەتییەك کـردووە بـە تـەنها بـەبێ باسـکردنی ڕووداوی مێـژوویی، نموونـە وەك سـاڵی (٣٨٠ك/٩٩٠ز)[٧٢]، یـاخود لـە باسـی کەسـایەتییەکاندا زۆر بـە کـەمی ژیاننامـەی تـەواوی کەسـەکان دەخاتـەڕوو بەڵکو زۆرجار تەنها ئاماژە بە مردنەکەی دەکات یان تەنها ڕۆڵەکـەی یـان نازنـاوی یـان شـیعرەکەی. زۆرجـاریش خووڕەوشـت و کـەرەم و پیـاوەتی و ئازایـەتی و خۆشەویستی بۆ زانست و هەژاران و کەسـایەتییەکان وەك لـە ڕووداوەکـانی سـاڵی (٥٠٩ك/١١١٥ز) لە باسی میر ئەحمەدیلی ڕەوادی ئامـاژەی بـۆ دەکـات[٧٣]، یـاخود سـاڵی (٥١٩ك/١١٢٥ز) لـە باسـی مـیری هەزبانییـەکان دەیخاتـەڕوو[٧٤]. یـان ئـەو بینایانەی کەسایەتییەکان بنیادیان ناون وەك لـە ڕووداوی سـاڵانی (٤٨٥ك/١٠٩٢ز) باسـی لـە بنیادنـانی مزگـەوت و قوتابخانـە و ڕەبـات و تەکیـە و منـارە لـە لایـەن سـوڵتان (مەلیکشـاه)و وەزیـر نظـام الملـك[٧٥]، یـان ئـەو خەلیفانـەی مـردوون و جێگرەکانیان کێن کە هاتوونەتـە شـوێنیان وەك لـە ڕووداوەکـانی سـاڵانی (٥٢٩-٥٣٠ك/١١٣٤-١١٣٥ز)[٧٦] ئاماژەیان بۆ کراوە لـەم کتێبـەدا، بـەڵام بـە شـێوەیەکی گشتی وەك ئەوەی دەبینرێت مێژووی کەسایەتییەکانی پشتگوێ نەخسـتووە و لـە ڕووداوەکانی تری دانەبڕیوە، لەگەڵ ئـەوەش کـە ئـەم کتێبـە (تـراجم) ژیاننامـەیی نییە بەڵام تاڕادەیـەکی بـاش گرنگـی بـەو بـوارە داوە لـە خسـتنەڕووی ژیاننامـەی ژمارەیەك لە دەسەڵاتداران لە خەلیفەکان و وەزیران و والی و میرەکان، یان زانایان و فوقەها و بازرگان و ئەدیب و شاعیران و کەسانی تر...

ئـەوەی لـە هـەموو جـۆرە کەسـایەتییەکان زیـاتر هەسـتی پێـدەکرێت بۆتـە جێگای گرنگیپێدانی ناوبراو چـینی شـاعیرانن ئـەوەش وەك ئامـاژەی بـۆکرا لەبـەر حـەز و بەهرەمەنـدی و گرنگیپێدانـەکانی خـۆی بـەو بـوارە، یـان نزیکایـەتی و هاوڕێیەتی زۆری لەگـەڵ شـاعیران. بۆیـە بەڕادەیـەکی زۆر لـە نێـو ژیاننامـەی ئـەو کەسایەتییانەی خستویەتیە ڕوو نـاوی شـاعیران دەبینرێـت و لـە هـەمان کاتیشـدا لەبەر تامەزرۆیی (ابن ابـي الهیجـاء) بـۆ ئـەم زانسـتە بەشـێك لـە شـیعرەکانی ئـەم کەسایەتییانەشی لەگەڵ ژیاننامەکانیان خسـتۆتە بـەردەم خوێنـەرەکانی، نموونـە هەروەکو لە باسی سـاڵی مردنـی (محمـد کـوڕی الحسـین)ی شـاعیری بەغـدادی لـە ساڵی (٤٧٣ك/١٠٨٠ز) نزیکەی یازدە دێـر لـە شـیعرەکانی نـاوبراو دەخاتـەڕوو[٧٧]. یان لە باسی مردنی (ابومي، ابوالفتیا محمد کوڕی حیوس الدمشقي الغنوي) شاعیر هەر لەو ساڵەدا لە دیمەشق مـردووە، یـەك دێـر لـە شـیعرەکانی دەنووسـێت، وەك دەڵێت:

((أسكان نعمان الاراك تيقنوا    بأنكم في ريع قلبي سكان))[٧٨].

یان (على کوڕ أفلح)ی نووسەری بەغدادی[٧٩]، و (أبـي الحسـین أحمـد کـوڕی منیر)ی شاعیری تەرابلوسی، و (أبو عبدالله کوڕی القیسـرانی)ی شـاعیر[٨٠]. ئەمـەو ژمارەیـەکی زۆری دیکـەی شـاعیران کـە سـاڵی مـردن و نـاو و شـیعرەکانیان لـەم کتێبەدا هاتووە بەڵام ئەوەی لێرەدا خرانەڕوو تەنها چەند نموونەیەك بوون.

هــەروەها هەنــدێك جــار لــە باســکردنی ڕووداوێکــی مێــژوویی تایبــەت بــە کەسایەتییەکی سیاسی یان سەربازی پیاهەڵدان، یـان زەم و بـە خـراپ باسـکردن دەبینرێت، بەتایبەتیش لەو کەسایەتییانە زیاتر هەست بە پیاهەڵدانەکانی دەکرێت کە لە نەتەوەی کورد بن، ئەمەش دەکرێت بوترێت کـە لەبـەر کاریگـەربوونی بـووە بە بیری بنەماڵەیی و نەتەوەیی و ناوچەگەرێتی، ئەوەتا هەروەکو لە بارەی یـەکێك لە میرە هەزبانییەکانی بنەماڵەکەی خۆی بە ناوی میر (عزالدین شهاب الدولة ممهـد الاسلام تـاج الملـوك أبوالهیجـاءی ابـی علـی موسـك کـوڕی حکویـە)ی هـەزبانی لـە ڕووداوەکانی سـاڵی (٥١٩ك/١١٢٥ز) دەڵێـت: ((بـە یـەکێك لـە پاشـا یەکەمینـەکان دادەنرێت لە دڵفراوانـی و بەخششـی، و خـواردن و خواردنـەوەی، و جلوبـەرگی، و ئازا و دادپـەروەر بوو، لە خەڵکە تەواوەکان بوو لە درێژی و وێنەیدا...))[٨١].ئینجـا

دوای چەند گوتەیەکی تر لە پیاهەڵدانی چەند دێرە شیعرێکی یەك لە شاعیران لە بارەیەوە دەخاتەڕوو[82].

نموونەیەکی تر لە باسی ڕووداوی کوژرانی (ئەحمەدیلی کوردی) ڕەوادی لە ساڵی (٥٠٩ك/١١١٥ز) دەردەکەوێت کاتێك باس لە ژیاننامەی دەکات بە ((پاشای گەورە...))[83] وەسفی دەکات و پیای هەڵدەدات و دەڵێت: ((خاوەن بەخشش و ئازا و پێشەوا و پایەبەرز بوو))[84]. ئەمەو چەند نموونەیەکی تر...

هەروەها وەك تێبینی دەکرێت لە باسی کەسایەتییەکاندا پابەندبوونێکی زۆری هەیە بە نازناو و شوهرەت، یان ناوی هۆز و بنەماڵە، یان ناوی پیشە و ناسراوی بوارێکی زانستی، یاخود نازناوی شوێنی لەدایکبوون، وەك ((خەلیفە– الامام– الهذباني –المرواني – الامير– الوزير– الشاعر – الدمشقي – الكاتب..))[85].

هەندێ جار لە کاتی گێڕانەوەی ڕووداوێکی مێژوویی کە تایبەتە بە کەسایەتییەك یان چەند کەسێك ناوی بەشداربووانی ڕووداوەکە بەتەواوی نابات، یەکێك لە نموونەکان ئەو شەڕ و کێشەیەیە کە لە نێوان سوڵتان مەسعود کوڕی محمد مەلیکشاه (٥٢٧–٥٤٧ك/١١٣٢–١١٥٢ز)ی سەلجوقی و خەلیفە مسترشد باللە (٥١٢–٥٢٩ك/١١١٨–١١٣٤ز) لە ساڵی (٥٢٩ك/١١٣٤ز) ڕوودەدات[86]، (ابن ابي الهيجاء) لەم ڕووداوەدا دوای ئەوەی بۆ دە جار نازناوی خەلیفە دەبات و دووبارەی دەکاتەوە لە نێو ڕووداوەکەدا بۆ تەنها جارێکیش ناوی (المسترشد) نابات تەنها لە کۆتایی ڕووداوەکە نەبێت یەك جار ناوی دەبات ئەویش بۆ ئەوەیە کە ڕووداوەکە بە دوو بەش باسدەکات و ڕووداوێکی تری لە نێواندا باسکردووە و بۆ جاری دووەم کە دێتەوە سەر باسکردنی بۆ بەبیرهێنانەوەی ناوی دەبات، و دەڵێت: ((ئاماژەمان بە ڕووداوی پێشەوا مسترشد و سوڵتان مەسعود کرد))[87].

نووسەری ناوبراو لەم پەیڕەوییەشدا هەست زیاتر بە هەوڵەکانی دەکرێت بۆ کورتکردنەوەی نووسین و ڕووداوە مێژووییەکانی، یان خۆدزینەوە لە هەندێ بابەت.

**تەوەرەی دووەم/ سەرچاوەکانی کتێبی (تاریخ ابن ابي الهيجاء):**

مێـژوونووس (ابـن ابـي الهيجـاء) لـە نووسـينی ئـەم کتێبـەدا هـەروەك لـە ناوەڕۆکەکەیدا دەردەکەوێت سوودی لە ژمارەیەکی زۆر لە سەرچـاوە وەرگرتـووە، بەتایبەتی وەك دەزانین ماوەی زەمەنییەکەی ئەم کتێبـە زۆر دوورو درێـژە کـە لـە ژیاننامەی پێغەمبەرەوە (د.خ) دەست پێدەکات تاکو سـەردەمەکەی خـۆی، بۆیـە گومانی تێدانییە کەرەستە و زانیارییەکانی کتێبەکە جیاوازن بە جیاوازبوونی ماوە زەمەنییەکە و سروشتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری.

نووسەری ناوبراوی هەزبانی ئاماژەی بە گرنگترین ئەو سەرچاوانە نەداوە کـە پشتی پێی بەستاوە بۆ دەسکەوتنی زانیارییەکانی، تەنها ئەوە نەبێ لەو کاتانـەی کە ویستوویەتی (سەنەد) بەڵگە بۆ یەکێك لە ڕووداوە مێژووییەکانی بێنێتـەوە بـە نموونە کاتێك دەڵێت: ((ورأيت بخط القاضـي الفاضـل...)). بـەڵام وەك ئاماژەمـان بۆ کرد ناوی کتێبەکەی نابات، یان هەندێ جار ناوی هەندێ کەسایەتی دیکەیان بە شـێوەیەکی گشـتی دەڵێـت: ((بۆیـان گێڕاینـەوە...))(٨٨) یـان ((هەواڵـەکان گەیشتن...))(٨٩)، واتـە جگـە لـە سەرچـاوە نووسـراوەکانی سەرچـاوەی زاردەمـی هـەبووە بـۆ ڕووداوەکـانی بۆیـە دەکرێـت ئـەو سەرچـاوانەی نووسـەر سـوودی لـێ بینیون دابەشی سەر دوو جۆری کتێبی نووسراو، و گێڕانەوەی زاردەمی بکەین:

**یەکەم/ کتێب و سەرچاوەی نووسراو:**

(ابن ابي الهيجاء)ی هەزبانی ئاماژە بە ژمارەیەکی کـەم لـەو کتێبانـە دەکـات کە ڕاستەوخۆ زانیاری لێ وەرگرتوون نموونە ئەویش ئەوەیە کە لە باسـی کـوژرانی مەلیك عادل ابو الحسن سيف الدولة علي کـوڕی سـالاری کـوردی زەرزاری وەزیـری دەوڵـەتی فـاتیمی ( ٥٤٤-٥٤٨ك/١١٤٩-١١٥٣ز)یـە لـە ڕووداوەکـانی سـاڵی (٥٤٨ك/١١٥٣ز) کە دەڵێت: ((قال القاضي شمس الدين بن خلكان في كتـاب وفيـات الاعيان هو الذي بنى مدرسة الشافعية بالاسكندرية وكـان قتلـه بمواطـأة مـن خليفـة الظافر))(٩٠).

وە لە ڕووداوەکانی هەمان ساڵدا باس لە مردنی دوو شاعیر دەکات کە ناویان (ابوالحسين أحمد کوڕی منير الطرابلسي، وأبو عبدالله القيسراني)یـە، ئامـاژە بـەوە

دەکات کە (عماد الکاتب) لە (جریدە)دا بە (الفرزدق و جریر)ی چواندوون[٩١]، مەبەستی لەوە کتێبی (کتاب خریدة القصر وجریدة العصر)ە.

بە گوێرەی ئەم دوو ڕووداوە نووسەر دوو لە سەرچاوەکانی خۆی بۆ ئێمە بەدیار خستوون بە ڕوونی، ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە کە توێژەران بە هۆی گەڕان و وردبوونەوە لەو سەرچاوە زۆرانەی لەبەردەستدان، و بەهۆی لێکچوونەوە، ئینجا لە ڕووی ماناوە بێت، یان دەق و دەربڕین بەشێکی تر لە سەرچاوەکانی بدۆزرێتەوە یان ئاشکرا بکرێت، بەتایبەتی وەك لە ژیاننامەکەی (ابن ابي الهیجاء)ەوە دەردەکەوێ زیاتر ژیانی لە وڵاتی شام بەسەر بردووە، واتە لە تەمەنی (٢٠) بیست ساڵییەوە تاکو مردنی، بۆیە بە پلەی یەکەم پشتی بەستاوە بە کتێبەکەی (ابن القلانسي، م: ٥٥٥ك/١١٦٠ز) بە ناوی (ذیل تاریخ دمشق) ئەوەتا هەروەکو لە ڕووداوەکانی ساڵی (٣٦٣-٣٦٨ك/٩٧٣-٩٧٨ز) لە باسی ئەو هێرشکاری و پشێوییەی لە شاری دیمەشق ڕوودەدات لێکچوونێکی زۆر لە نێوان هەردوو کتێبی تاریخ ابن ابي الهیجاء و (ذیل تاریخ دمشق) دا هەیە[٩٢].

یاخود ئەو هێرشکارییەی لە ساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز) سەربازانی میسری کردیانە سەر شاری دیمەشق، دیسان لێکچوون لە نێوان هەردوو سەرچاوەی ناوبراودا دەبینرێت[٩٣]. ئەمەو چەند نموونەو ڕووداوێکی تر، کە ئاستی پشتبەستانی (ابن ابي الهیجاء) بە کتێبی (ذیل تاریخ دمشق)ی (ابن القلانسي) دەردەخات.

هەروەها ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە (ابن ابي الهیجاء) بە هەمان شێوە لە نووسینی ئەم کتێبەدا سوودی زۆری لە کتێبەکانی (ابن الاثیر، م: ٦٣٠ك/١٢٣٢ز) وەرگرتووە، بەتایبەتیش کتێبی (الکامل في التاریخ)، لە هەمووشیان گرنگتر ئەوەیانە کە لە ڕووداوەکانی ساڵی (٣٥٨ك/٩٦٨ز) دەردەکەوێت کاتێك باسی ململانێی نێوان فاتیمییەکان و خەڵکی دیمەشق دەکرێت لە ڕووی ماناوە لێکچوون هەیە لە نێوان هەردوو سەرچاوەدا[٩٤]. دیسان لە باسی خەلیفەی فاتیمی (المعز لدین الله (٣٤١-٣٦٥ك/٩٥٣-٩٧٥ز)و سیفات و دانانی جێگریەتیدا لە ڕووداوەکانی ساڵی (٣٦٥ك/٩٧٥ز)دا دیسان لێکچوونی تەواو هەیە لە نێوان (ابن ابي الهیجاء)و (ابن الاثیر)دا[٩٥].

گومانی تێدانییە سەردەمی مێژوونووسی هەزبانی هاوسەردەمی کۆمەڵێك لە زانا و مێژوونووسە بەناوبانگەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامییە هەروەکو ئاماژەی بۆ کرا لە دەروازەدا[٩٦]. ئینجا یەکێك لەمانە (سبط ابن الجوزي، م: ٦٥٤ك/١٢٥٥ز)یە کە خۆی و بنەماڵەکەشی هەر لە خزمەتی زانست و مێژوودا بوون و لەگەڵ (ابن ابي الهيجاء) لە یەك سەردەمدا ژیاون بۆیە زۆر ئاساییە کە بەشێکی زۆرو گرنگی زانیارییەکانی لە کتێبی (مرآة الزمان في تاريخ الاعيان)ی (سبط ابن الجوزي) وەرگرتبێ، بەڵام ئاماژەی بۆی نەکردووە بەڵگەش بۆ ئەمە لەیەکچوونی زانیارییەکانیەتی بە مێژوونووسی ناوبراو لە ژمارەیەك لە دەقەکانی، ئەوەتا بە نموونە لە ڕووداوی ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧٠ز) لە چۆنیەتی خستنەڕووی زانیاری لەسەر بەشداری کورد بە(١٠) هەزار سەرباز لە شەڕی مەلازگرد لە پاڵ ئەلب ئەرسەلانی سەلجوقی (٤٥٥-٤٦٥ك/١٠٦٣-١٠٧٢ز)و چۆنیەتی ئامادەکاری شەڕەکە لەیەکچوونی تەواو هەیە لە نێوانیاندا[٩٧]. بە پێچەوانەوە لە سەرچاوەی تردا بەو جۆرە نییە، هەروەکو (سبط ابن الجوزي، دەڵێت: قد اجتمع اليه عشرة آلاف من الاكراد))[٩٨].

(ابن ابي الهيجاء)یش دەڵێت: ((قد اجتمع إلى السلطان عشرة الاف من الاكراد))[٩٩]. ئەمەو جگە لە وردەکارییەکانی تری ڕووداوەکە، کە زۆربەیان لە یەکتر دەچن[١٠٠] واتە : ابن ابی الهيجاء بەشێك لە زانیارییەکانی لە سبط ابن الجوزی وەرگرتووە.

بە هەمان شێوە دیسان نزیکبوونەوە هەیە لە نێوان زانیارییەکانی هەردوو سەرچاوەی ناوبراو لە ڕووداوی مردنی میری عەننازی (بدر کوڕی مهلهل کوڕی ابي الشوك)ی کوردی و دانانی (نصر)ی کوڕی بە جێگرەوەی لە شوێنیدا. ئەوەتا لە ساڵی(٤٦٧ك/١٠٧٤ز) هەردووکیان ڕووداوەکە بە یەك شێواز دەخەنەڕوو[١٠١] کە لە سەرچاوەی تردا بەو جۆرە بوونی نییە.سەرەڕای ئەم دوو ڕووداوە مێژووییە کۆمەڵێك لەیەکچوونی تر هەن کە لێرەدا پێویستی بە خستنەڕووی هەموویان ناکات.

هەروەها نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە بۆ شیعرەکانی سەرەڕای سوودبینینی لە (العز الضرير)ی هاوڕێی لە زۆربەی شاعیران خۆیان دێرە شیعری

وەرگرتووە، واتە شاعیرانیش بە یەکێك لە سەرچاوە هەرە گرنگەکانی بوون چونکە گومانی تێدانییە شیعری شاعیران و شاعیران خۆشیان بەشێکی هەرە گرنگی ئەم کتێبە پێکدەهێنن[١٠٢]. هەروەکو شیعرەکانی (توفیق کوڕی محمد الحسین الطرابلسي)[١٠٣]، یان شیعرەکانی (أحمد کوڕی محمد الخیاط الدمشقي)ی شاعیر[١٠٤]، ئەمەو چەندین دێرە شیعری شاعیران لە نێو ئەم کتێبەدا.

**دووەم/ زانیاریی زاردەمی:**

هەروەکو دیارە بەشی زۆری زانیاریی مێژوویی سەدەکانی کۆن و ناوەڕاست بە زاردەمی لە یەکتر وەردەگیرا بە تایبەتیش هەندێکیان لە باوکەوە بۆ کوڕ، یان نەوە دوای نەوە دەگوازرایەوە، بۆیە زۆر ئاساییە کە زانیارییە زاردەمییەکان بە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی نووسەر لەم کتێبەی دابنرێت، ئەوەی کە گوێبیستی بووە لە باوك و باپیرانی و بنەماڵەکەی، لە هەمووشیان زیاتر ئەوەی تایبەتن بە مێژووی بنەماڵەی هەزبانی خۆیان، یان نەتەوەی کورد بە گشتی، لەبەر ئەوەی هەروەك بە گوێرەی هەندێ لە زانیارییەکانی لە بارەی بنەچە و دەسەڵاتی هەزبانییەکان خستوویەتیە ڕوو تەواو دەگمەنن و لە سەرچاوەی دیکەدا نابینرێت بۆیە تەنها دەبێت بە زاردەمی لە بنەماڵەکەی خۆی وەریگرتبێ، بە نموونە هەروەکو ئەو زانیارییەی لە ڕووداوەکانی ساڵی (٥١٩ك/١١٢٥ز) لە بارەی بنەچەی هەزبانییەکان باسی دەکات کە گوایە دەگەڕێتەوە بۆ (الجلندي کوڕی کرکر)[١٠٥] ئەوەی کە خودای گەورە لە بارەیەوە دەفەرموێ ((وکان وراءهم ملك يأخذ كل سفينة غصباً))[١٠٦].

هەروەها لە بارەی ئەم بنەماڵەیە زانیاری لەسەر ناوی دوایین میر دەداتە دەست کە ناوی (میر علي حسین شهاب الدین) بووە و دەسەڵاتەکەی لە لایەن تورکەکان (مەبەستی عمادالدین زنکی)یە، کۆتایی بە دەسەڵاتەکەی هێنراوە هەر لە ساڵی (٥١٩ك/١١٢٥ز)[١٠٧].

لە هەمان کاتدا بوونی زانیاریی نەگونجاو (متناقض) لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ سەرجەمی سەرچاوەکان دیسان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زۆر لە زانیارییەکانی بە زاردەمی وەرگرتووە هەروەك لە بارەی گیرانی دوورگەی سەقلیە لە لایەن فەرەنگەکان لە دوو ساڵی جیاوازی (٤٦٣ك/١٠٧٠ز)، و (٤٦٤ك/١٠٧١ز) یەك جۆر

لە گوتەی (فيها ملكت الفرنج جزيرة صقلية) واتـە: تيايـدا فەرەنگـەكان دوورگـەی سەقليەيان دەسـت بەسـەرداگرت[١٠٨]. بـەبێ ئـەوەی لـە نێـوان ئـەو ماوەيـە و دوو گوتەيەدا ئاماژە بەوە بكات كە موسڵمانەكان ئەم دوورگەيەيان گرتبێتەوە.

هـەروەها لـە بـارەی ڕووخـانی میرنشـینیی مـەڕوانیش دیسـان لـە سـاڵی (٤٧٧ك/١٠٨٤ز) ئاماژە بـە ڕووخـانی دەكـات[١٠٩]. بـەڵام بـەبێ ئـەوەی ئامـاژە بـە دروستبوونەوەی بكـات لـە ڕووداوەكـانی سـاڵی (٤٨٧ك/١٠٩٤ز) دەڵێـت: دەسـتی بەسەرداگیرا لە ساڵی (٤٧٩ك/١٠٨٦ز)[١١٠].

بەڵگەیەكی تر لەسەر وەرگرتنی زانیـاریی زاردەمـی بـوونی چـەند ڕووداوێكـی ئەفسانەییە لە نێو ڕووداوە مێژووییەكان، یەكێك لەو نموونانەش ئەوەیانە كە لـە ڕووداوەكانی ساڵی (٥١٣ك/١١١٩ز) باس لە دەركەوتنی گۆڕی پێغەمبـەران ابـراهیم و كوڕەكانی ئیسحاق و یەعقوب (سەلامی خوایان لێ بێ) دەكات و گوایـە لەشـیان وەكو خۆی بووە، وەك ئەوە بووە كە زیندووبن، و ئەمەو چـەندین گوتـەی دیكـەی ئەفسانەییی لە بارەیانەوە دەڵێت[١١١]. بەڵام لە سەرەتای گوتەكەیـدا دەڵێـت: ((في هذه السـنة حكـی مـن ورد بيـت المقـدس...))[١١٢]، واتـە زانیارییەكـە بـە زاردەمـی وەرگـیراوە لـە بنەچـەدا و گەیشـتۆتە (ابـن ابـي الهيجـاء) هـەر بـە زاردەمـی و ئەفسانەیی.

یـان ئـەو ڕووداوەی كـە لـە سـاڵی (٥٤٥ك/١١٥٠ز) دەربـارەی یـەكێك لـە دیاردەكانی كەش و هەوا دەدوێت كە لە یەمەن ڕوویداوە ئـەویش بـارینی بارانێكـە لەو وڵاتەدا، كە نووسەر دەڵێت: ((كله دم – هەمووی خوێن بوو))[١١٣]. كە خۆی لە ڕاستیدا لەوانەیە بارانەكە لە كاتی خۆڵبارینـدا ڕوویدابێت و خۆڵ و تۆزەكەی لەگەڵ خۆیدا هێنابێتە خوارەوە و خۆڵەكەش سوور بـووە، بـەڵام زیـادەڕۆیی تێـدا كـراوە، وەك دیاریشە نووسەر خۆی لەو ناوچەیە نەژیاوە و بە دەماودەمی گەیشتۆتە ئەو، و سەردەمەكەی و گۆڕانكاری زۆری بەسەردا هاتووە و خۆڵەكە بۆتە خوێن، ئەگـەر وانـەبێت ئـەوە ڕووداوەكـە جێگـای قـەبووڵكردن نییـە و ئەفسـانەیە. ئەمـەش بەڵگەیەكی دیكە بوو لەسەر بـەكارهێنانی زانیـاریی زاردەمـی وەكـو سەرچـاوە بـۆ نووسینی كتێبی (تاريخ ابن ابي الهيجاء).

سەرەڕای ئەمانە شتێکی دیکە کە جێگای تێڕامانە ئەوەیە کە لە بارەی زۆر لەو ڕووداوە مێژووییانەی تۆماری کردوون زۆر لە پێش سەردەمەکەی خۆی ڕوویانداوە بەڵام هەر دەشڵێ: ((فیها ورد الخبر...))[114]، یان ((وفیها وردت الاخبار...))[115]، ئەمەو چەند گوتەیەکی تری لەو جۆرە کە سەدەیەك یان دوو سەدە لە سەردەمەکەی خۆی دوورن، بەڵام دەکرێ هۆکارەکەی ئەوەبێ دەقاودەق و ڕاستەوخۆ ئەم زانیارییانەی لە هەندێ سەرچاوەکان وەرگرتبێ بەبێ گۆڕانکاری، و ناوی خاوەنەکەشی نەبردووە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو جۆرە گێڕانەوە زاردەمییانە گرنگیی خۆیان لەو وردبوونەوە و ڕێکخستنی زانیارییەکان هەیە، لەبەر ئەوەی نووسەر دەتوانێت هەڵاوێریان تێدا بکات و ڕاستترینیان هەڵبژێرێ، ئەگەر بیەوێ، یان تەنها ئەوە وەربگرێ کە متمانەی پێیەتی لە وردی و ڕاستگۆیی.

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە (ابن ابي الهيجاء) پشتی بە ژمارەیەکی زۆر لە سەرچاوەی مێژوویی نووسراو و زاردەمی پێش سەردەمەکەی خۆی بەستاوە بۆ نووسینی ئەم کتێبە بەڵام لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییەی بەسەر نووسینەوەی بابەتی مێژووییدا هات ئاماژەکردن بە سەرچاوەکانی پشتگوێ خستووە، یان ئاماژەکان پاش خۆی نووسراونەتەوە و لەناوچوون کە ئەمەش زۆر گونجاو نییە، ئەگەرچی هەندێك جاریش هەوڵیداوە لە چەند ڕووداوێکی مێژووییدا تیشك بخاتەسەر ژمارەیەك لە نووسەران یان کتێبەکانیان کە زانیاری لێ وەرگرتوون بە شێوەیەکی کورت، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە وەك لەو ئاماژە کورتانە دەردەکەوێ مەبەستی نەبووە و هەوڵی نەداوە خۆی لە بە بەڵگەکردن، و وردبوونەوە لە گواستنەوەی زانیاری ببوورێت یان بدزێتەوە، و ئاماژەکردنی بە سەرچاوە بە تەواوی پشتگوێ نەخستووە.

**سێیەم/ ئەو سەرچاوانەی زانیارییان لێی وەرگرتووە:**

گومانی تێدانییە لەو کاتەی ژمارەیەك لە مێژوونووس هاوسەردەمن زانیاریی زۆر لە یەکتر وەردەگرن، یان لەوانەی پێش خۆیان، یاخود ئەوانەی لەگەڵیاندا هاوڕێن زۆر لە زانیاری لە یەکتر وەردەگرن ئینجا یەکێك لەو مێژوونووسانەش کە هاوسەردەم و هاوڕێی (ابن ابي الهيجاء) بووە (قطب الدين ابي الفتح موسى کوڕی محمد اليونيني، م: ٧٢٦ك/١٣٢٥ز)یە کە خاوەنی کتێبی (ذيل مرآة الزمان)ە لە چەند شوێنێکی کتێبەکەیدا لە بارەی چەند ڕووداو و کەسایەتییەك باس لەوە دەکات کە گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتر کردووە[١١٦].

هەروەها زۆر لە گێڕانەوەی ڕووداو و شیعری شاعیراندا (اليونيني) ئاماژەی بە (ابن ابي الهيجاء) کردووە کە زانیاری لێی وەرگرتووە، بەتایبەتیش ئەو زانیارییانەی کە تایبەتن بە ناوچە کوردییەکان، یان کەسایەتییە کوردەکان کە بە دڵنیاییەوە لەبەر ئەوە بووە ناوبراو لە بارەی نەتەوە و وڵاتەکەی زۆر شارەزا بووە و زانیاری پێگەیشتووە لە شام. ئەوەتا هەروەکو (اليونيني) لە بارەی ژیاننامەی کەسایەتی (اسعد کوڕی ابراهيم کوڕی حسن کوڕی علی، أبو المجد مجدالدين الشيباني الاربلي النشابي، م: ٦٥٧ك/١٢٥٩ز) کە نووسەری (انشاء)ی سوڵتان مظفرالدين كوكبری (٥٨٦–٦٣٠ك/١١٩٠–١٢٣٣ز) بوو، دەڵێت: ((عزالدين محمد بن ابي الهيجاء (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئاماژەی بەوە کرد کە شەیبانییە))[١١٧].

هەروەها کاتێك (اليونيني) لە بارەی مردنی (العز الضرير) ((الحسن کوڕی محمد کوڕی نجا الغنوي الاربلي)) دەدوێت لە ساڵی (٦٦٠ك/١٢٦١ز)، دەڵێت: ((میر عزالدين محمد بن ابي الهيجاء دەسەڵاتداری دیمەشق گێڕایەوە، کە هاوڕێیەتییان هەبووە لە ڕێگەی وڵاتەکەیان (اربل – هەولێر).. وتی لە لای العز الضرير بووم کاتی گیان دەرچوونی...))[١١٨].

دوای ئەوەی (اليونيني) ژیاننامەیەکی تەواوی (العز الضرير) دەخاتەڕوو، دەڵێت: ((میر عزالدين محمد کوڕی ابي الهيجاء (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) هاوکاری کردم لە ڕەچەڵەکی (العز)))[١١٩].

ئەمەو جگە لە بارەی شیعر و کەسایەتی هەریەکە لە (میر حسام الـدین)[120] و (میر عمادالدین)ی خـەڵاتی[121] دیسـان (الیـونینی) زانیـاری لـە (ابـن ابـي الهیجـاء) وەرگرتووە [122].

ئەو هەموو گێڕانـەوە مێـژوویی و ئەدەبییـە زۆرانـەی کـە (ابـن ابـي الهیجـاء) گێڕاویەتیەوە و سەرچاوەکان لێیـان وەرگرتـووە، بەتایبـەتیش (الیـونیني) کـە لـە هەموویان زیاتر ئاماژەی بۆ کردووە لە کتێبی (ذیل مرآة الزمان) بە ڕادە و ئاسـتی توانا زیهنی و بیرکردنەوەکانی ئەو مێژوونووسـەمان ئاشـنا دەکـات کـە تـا چـەندە خـاوەنی بـیر و هزرێکـی بـە توانـا بـووە لـە هێشـتنەوەی زانیـاریی زۆر تیایـدا کـە ئەمــەش ئەوەنــدەی تــر کتێبەکــەی بــەنرختر دەکــات[123] هــەر بۆیــەش زۆر لــە مێژوونووسانی سـەدەکانی ناوەڕاسـت بـەو جـۆرە وەسـفیان کـردووە و وتوویانـە: ((زانــا بــووە بــە ئــەدەب و مێــژوو، و خــاوەن ژیاننامــە و خووڕەوشــتێکی بــاش بوو))[124].

## ئەنجام

**دوای لێکۆڵینەوە توێژەر دەگات بەو ئەنجامانەی خوارەوە:**

**یەکەم:** یەکێکە لە مێژوونووس و نووسەرە کورد و ئەو سەرچاوە گرنگانەی کە زانیاریی زۆر بە نرخ و دەگمەنی تۆمار کردووە، بەتایبەتیش لە بارەی مێژووی کورد و میر و بنەچەی بنەماڵەکەی خۆی کە هەزبانییەکانن.

**دووەم:** بە وردبوونەوە لە زانیارییەکانی ڕوون دەبێتەوە کە ناوبراو لەبەر هاوچەرخبوونی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە مێژوونووسە بەناوبانگەکانی ئیسلامی بۆ بەدەستهێنانی زانیاری پشتی بە ژمارەیەکی زۆر لەو سەرچاوانەی پێش خۆی، یان سەردەمی خۆی لە کتێبی نووسراو و زاردەمی بەستاوە، بەڵام لە ئەنجامی ئەو پێشکەوتنەی لە نووسینەوەی بابەتی مێژوویی هاتە ئاراوە بەڵگە و سەنەدی بۆ زانیارییەکانی تاڕادەیەك پشتگوێ خستووە کە سەرچاوەکانیەتی، ئەگەرچی چەند جارێکیش ئاماژەی کردووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوی بە بەڵگەکردنی زانیاری و وردبوونەوە لە زانیاری تۆمارکردن و سەرچاوەکانی بە تەواوی پشتگوێ نەخستووە.

**سێیەم:** سەرەڕای ئەوەی کە هەندێك هەڵەی مێژوویی و زاراوەیی لەم کتێبەدا دەبینرێت بەتایبەتی لە بارەی ڕێکەوتی هەندێ لە ڕووداوەکان، یان هەندێك لە ناو و نازناوی هەڵە و نەبوونی ناوی چەند کەسایەتییەکی گرنگ کە لە کتێبی تردا هەن، یاخود بازدان لە نێوان ڕووداوەکانی چەند ساڵێکدا، یان کورتکردنەوەی هەندێ ڕووداو بە ڕادەیەکی زۆر، یان نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان ڕووداوە مێژووییەکان و ژیاننامەی ئەو کەسایەتییانەی باسی کردوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە لە گرنگیی زانیارییەکانی لەم کتێبە کەم ناکەنەوە.

**چوارەم:** تاوانبارکردنی (ابن ابي الهيجاء)ی هەزبانی بە مەزهەبی شیعی و گرنگیدانی زۆری بە خەلیفەکانی فاتیمی و شیعی و ڕووداوەکانی تایبەت بەوان، یان گوایە لەبەر هاوڕێیەتی لەگەڵ (العز الضرير) ئەم مەزهەبەی وەرگرتبێ. دەکرێت وەڵامی ئەم گوتانە بدرێتەوە بەوەی کە نەخێر بەڵکو ناوبراو یەکێك لە مێژوونووسە بێلایەن و ڕێبازگرەکانی مێژووە لە نووسینەکانیدا بە تایبەتی لە بواری ئاینی و مەزهەبیدا، لەبەر ئەوەی وەك لە کتێبەکەیدا دەبینرێت لە هەمان

کاتـدا گرنگیـدانی زۆری بـە مێـژووی سـونە مەزهـەب و خەلیفـەکانی عەباسـی و دەسەڵاتدارە سونییەکانی تری وەکو سەلجوقی و ئەتابەگی عمادالدین و نورالـدینی کوڕیشی و هی دیکەش دەبینرێت، تەنانـەت بەڵگـەش بـۆ ئەمـە پیاهەڵدانیـەتی لـە لایـەن مێژوونووسـە سـونییەکانی وەکـو (ابـن کـثیر، م: ٧٧٤ك/١٣٧٢ن)ە، یـاخود پێدانی پۆستی ولایەتی دیمەشقە لە لایەن دەوڵەتی مەمالیك، کـە خـۆی لـە خۆیـدا باشترین بەڵگەیە چـونکە ئـەم دەوڵەتـە دەوڵـەتێکی سـونی مەزهـەب بـوون ، یـان بەڵگەی تر ئەوەیە کە کاتێك باس لە ململانێ مەزهەبییەکانی شیعە و سونە دەکات هیچ لایەنگیرییەکی لێ نابینرێ، بـەڵکو ئـەوەی لـە بارەشـیەوە دەگوترێـت کـە لـە (العز الضریر) مەزهەبی شیعی وەرگرتبێ، ئەوەش هەڵەیە چونکە پەیوەندییەکـەی لەگـەڵ نـاوبراودا وەك دەردەکـەوێ تـەنها هاوڕێیـەتی و ناوچـەگەرێتی بـووە کـە هەردووکیان خەڵکی هەولێر بوون یان دەکرێت بوترێت بەهۆی سەرسامی بـووە بـە شیعرەکانی (العز).

**پێنجەم:** لە هەمان کاتدا دەکرێـت بوترێـت کـە (ابـن ابـي الهیجـاء) پـەیڕەوی مێژوونووسە موسڵمانەکانی پێش خـۆی یـان هاوچـەرخی کـردووە و بـەبێ گومـان سوودیشی لێ بینیون، و کتێبەکەی بە شێوەی ئینسکلۆپیدیایەکی ساڵانەی پڕ بـە ڕووداوەکـانی موسـڵمانان نووسـیوە، وە تۆمـارێکی گرنگـە بـۆ مێـژووی جیهـانی ئیسلامی بـە گشـتی، ماوەیـەکی دوورو درێـژ لـەخۆ دەگرێـت کـە بـە لـەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ)ەوە دەست پێدەکات تاکو (٦٩٩ك/١٣٠٠ن) تیایدا باس لـە ڕووداوە سیاسـی و ئـابووری و دیـاردە کۆمەڵایـەتی و کـەش و هـەوایی و سروشـتی و بیناسازییەکانی دەکات، لەگەڵ کاروبارە گشتی و تایبەتییەکانی زانایان و فوقـەها ئەدیب و شاعیر و بازرگانان چەندینی تـر . بەتایبـەتیش لـەو کاتانـەدا کـە لـە نێـو دەسـەڵاتدا بـووە دەبێـت زانیـاریی زۆر ورد و دەگمـەنتری تۆمارکردبـێ بـەڵام بەداخەوە ئەوەی بەدەست گەیشتووە تەنها بەشێك و ئـەو مـاوە کورتەیـە کـە لـە ساڵی (٣٥٨ك/٩٦٨ن) دەست پێدەکات تاکو ساڵی (٥٥٢ك/١١٥٧ن).

## پەراوێز و سەرچاوەكان:

١- بە گوتەى يەكێك لە مێژوونووسەكانى سەردەمى نوێ، ناوبراو بە كوڕى مير مجيرالدين خوشترين (م: ٦٦١ك/١٢٦٣ز) كوڕى مير حسام الدين عيسى (م: ٦١٩ك/١٢٢٢ز)ى كوڕى مير خوشترينى هەزبانييە كە يەكێك لە ميرە ناسراوەكانى سوڵتان صلاح الدين ئەيوبى بوو. د.زرار صديق تۆفيق: چەند لێكۆڵينەوەيەك دەربارەى مێژووى كورد لە سەدەكانى ناوەڕاستدا،چاپخانەى خانى، (هەولێر: ٢٠٠٨)، ص١٣٥.

٢- الصفدي (ت: ٧٦٤هـ/١٣٦٢م): كتاب الوافي بالوفيات، تحقيق: أحمد الارناؤط –تركي مصطفى، دار احياء التراث العربي، (بيروت: ٢٠٠٠)، ج٥، ص١١٢؛ العيني: عقد الجمان في تاريخ أهل الزمان، TOPD: www.al-mostafa.com، ص٦٤٤.

٣- ابن كثير(ت: ٧٧٤هـ/١٣٧٢م): البداية والنهاية، تحقيق: عماد زكي البارودي–خيري سعيد ،المكتبة التوفيقية للطباعة، (القاهرة: ٢٠٠٨)، ج٩، ص٢٣٨؛ المقريزي (ت: ٨٤٥هـ/١٤٤١م): كتاب السلوك لمعرفة دول الملوك، (القاهرة: ١٩٥٦)، ج١، ق٣، ص٩١٨؛ العيني: عقد الجمان، ص٦٤٤.

٤- الصفدي (ت: ٧٦٤هـ/١٣٦٢م): أعيان العصر وأعوان النصر، تحقيق: فالح أحمد البكور، دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع،(بيروت: ١٩٩٨)، ج٤، ص١٩٨٨.

٥- الصفدي: الوافي بالوفيات، ج٥، ص١١٢؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص٢٣٨.

٦- بڕوانە: ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص٢٣٨؛ العيني: عقد الجمان، ص٦٤٤.

٧- ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص١٧٧.

٨- ابن كثير: البداية و النهاية، ج٩، ص٢٣٨؛ العيني: عقد الجمان، ص٦٤٤.

٩- أعيان العصر وأعوان النصر، ج٤، ص١٩٨٨.

١٠- بيبرس المنصورى (ت:٧٢٥/١٣٢٦م): مختار الاخبار تاريخ الدولة الايوبية ودولة المماليك البحرية سنة ٧٠٢ هجرية،تحقيق: عبدالحميد صالح حمدان، دار المصرية اللبنانية، (القاهرة:١٩٩٣)، ص٩١-٩٦.

١١- ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص٢٣٨.

١٢- ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص٢٣٨.

١٣- ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص٢٣٨؛ المقريزي: السلوك، ج١، ق٣، ص٩١٨ ؛ العيني: عقد الجمان، ص٦٤٤.

١٤- ابن أبي الهيجاء (ت:٧٠٠/١٣٠١م): تاريخ ابن أبي الهيجاء، تحقيق: احمد فريد المزيدي، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٤)، مقدمة المحقق، ص١٦٩.

١٥- ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص٢٣٨؛ المقريزي: السلوك، ج١، ق٣، ص٩١٨.
١٦- چیاى قاسیون: ئەو چیایەیە کە دەڕوانێتە سەرووى شارى دیمەشق و ژمارەیەك لە ئەشکەوت و گۆڕى بنەماڵەى سوڵتان صلاح الدینى لێیە و زۆر لە پیاهەڵدان و پیرۆزیەتى لە بارەوە گوتراوە لە مێژوودا. بڕوانە: ياقوت الحموي (ت: ٦٢٦هـ/١٢٢٩م): معجم البلدان، ط٨،دار صادر، (بيروت: ٢٠١٠)، ج٤، ص٢٩٥-٢٩٦.
١٧- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، تحقيق: أحمد فريد المزيدي، مقدمة المحقق، ص١٦٩.
١٨- الوافي بالوفيات، ج٥، ص١١٢؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص٢٣٨؛ المقريزي: السلوك، ج١، ق٣، ص٩١٨.
١٩- العز الضرير: فەیلەسوف و زاناى ئیسلامى کە ناوى تەواوى (الحسن کوڕى محمد کوڕى أحمد کوڕى نجا الاربلى)یە، و لە ساڵى (٥٨٦ك/١١٩٠ز) لە شارى نوسەیبین لە دایك بووە، و لە دانیشتوانى هەولێر بووە، وەك باسدەکرێت لەسەر بیروباوەڕى مەزهەبى شیعەى عەلەوى بووە، و دەستێکى باڵاى هەبووە لە ئەدەب و زمانى عەرەبى و زانستى تەراجوم، و لە ساڵى (٦٦٠ك/١٢٦١ز) لە شارى دیمەشق کۆچى دوایى کردووە و لە چیاى قاسیون هەر لەو شارە دەنێژرێت. اليونيني(ت: ٧٢٦هـ/١٣٢٦م): ذيل مرآة الزمان، مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية، (حيدر آباد: ١٩٥٤)، ج٢، ص٣٣؛ الصفدي: اعيان العصر واعوان النصر، ج٤، ص١٩٨٨.
٢٠- الصفدي: الوافي بالوفيات، ج٥، ص١١٢.
٢١- اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٣٣.
٢٢- الصفدي: الوافي بالوفيات، ج٥، ص١١٢؛ اعيان العصر وأعوان النصر، ج٤، ص١٩٨٨.
٢٣- د.أحمد خليل: مشاهير الكورد في التاريخ الاسلامي (الحلقة الرابعة عشرة) الحاكم المؤرخ ابن أبي الهيجاء (٦٢٠-٧٠٠هـ/١٢٢٣-١٣٠١م)، موقع مركز كلكامش للدراسات والبحوث الكردية، (د.م: ٢٠٠٦)، ص٢-٤؛ www.gilgamish.org،؛ موقع: وحدة العمل الوطني لكرد سورية، ص١؛ www.syriakurds.com.
٢٤- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٢٤-٢٢٥.
٢٥- ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص٢٣٨؛ العيني: عقد الجمان، ص٦٤٤.
٢٦- بڕوانە: اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ج١، ص١١١-١٢٣؛ ج٢، ص٣٣، ٧٧-٧٨، ٨٣-٨٤، ١٦٦-١٦٨، ٣٩٥-٣٩٨.

٢٧- یان (٢٠٦) لاپەڕە، وەك: صجي عبدالمنعم محمد ئاماژەی بۆ كردووە. ابن أبي الهيجاء (ت:١٣٠١/٧٠٠م): تاريخ ابن أبي الهيجاء، تحقيق: صجي عبدالمنعم محمد، رياض الصالحين للطباعة والنشر والتوزيع ،(الفيوم: ١٩٩٣)، مقدمة المحقق، ص٣٣.
٢٨- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٣٣.
٢٩- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٣٣.
٣٠- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، تحقيق: أحمد فريد المزيدي، (بيروت: ٢٠٠٤)، مقدمة المحقق، ص٥.
٣١- العيني: عقد الجمان، ص٦٤٤.
٣٢- بڕوانە: أبوالفداء (ت: ٧٣٢هـ/١٣٣١م): المختصر في أخبار البشر، تحقيق: محمد زينهم محمد عزب-يحيى سيد حسين، دار المعارف، (القاهرة: د.ت)، ج٤، ص٥٥-٥٦؛ الصفدي (ت: ٧٦٤هـ/١٣٦٢م):: تحفة ذوي الألباب فيمن حكم بدمشق من الخلفاء والملوك والنواب، تحقيق: احسان بنت سعيد خلوصي- زهير حميدان، ط٢، دار صادر-دار البشائر للطباعة والنشر والتوزيع، (بيروت + دمشق: ١٩٩٩)، ص٤٩١-٤٩٣؛ ابن تغري بردي (ت: ٨٧٤هـ/١٤٦٩م): النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٢)، ج٨، ص٩٥-١٠٦.
٣٣- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٨٦-١٨٧.
٣٤- بڕوانە: ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٣٢-٢٣٣، ٢٣٩-٢٤٤.
٣٥- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٠٨.
٣٦- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٩٤-١٩٥.
٣٧- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٧٦-١٨٧.
٣٨- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٨٦-١٨٧.
٣٩- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢١٦.
٤٠- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٣١.
٤١- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٣٩.
٤٢- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٨٧.
٤٣- بڕوانە: ابن الاثير (ت: ٦٣٠هـ/١٢٣٢م): الكامل في التاريخ ، دار صادر، (بيروت: ٢٠٠٩)، ج٩، ص١١٨؛ قادر محمد حسن: الامارات الكردية في العهد البويهي ((دراسة في علاقاتها السياسية والاقتصادية ٣٣٤-٤٤٧هـ/٩٤٥-١٠٥٥م))، مطبعة ڕۆژهەلات، (أربيل: ٢٠١١)، ص٥١-٥٥.

٤٤- الروذراوري (ت: ٤٨٨هـ/١٠٩٥م): ذيل كتاب تجارب الأمم، تحقيق: هـ.ف. امدروز، مطبعة شركة التمدن الصناعية، (القاهرة: ١٩١٦)، ج٣، ص٢٢٧-٢٢٨؛ ابن القلانسي (ت: ٥٥٥هـ/١١٦٠م): ذيل تاريخ دمشق ، دار احسان للطباعة والنشر، (بيروت: ١٩٠٨)، ص٥١-٥٢؛ ابن العبري (ت: ٦٨٥هـ/١٢٨٦م): تاريخ الزمان، دار المشرق، (بيروت: ١٩٩١)، ص٧٣؛ الذهبي (ت: ٧٤٨هـ/١٣٤٧م): سير اعلام النبلاء، تحقيق: بشار عواد معروف -محيي هلال سرجان، مؤسسة الرسالة، (بيروت: ١٩٨٤)، ج١٧، ص٥٤. بۆ زیاتر زانیاریش لە بارەی ئەم ڕووداوە بڕوانە: مەهدی عوسمان هەروتی: ڕۆڵی سەربازیی کورد لە دەوڵەت و میرنشینە ناکوردییەکان لە سەردەمی عەباسیدا (١٣٢-٦٥٦ك/٧٤٩-١٢٥٨ز)، چاپخانەی خانی، (هەولێر: ٢٠٠٨)، ص٢٤٢-٢٤٥.

٤٥- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٨٢.

٤٦-ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢١٩-٢٢٠.

٤٧-تاريخ الزمان، ص١٤١.

٤٨-(ت:٦٩٧هـ/١٢٩٧م):مفرج الكروب في اخبار بني أيوب، تحقيق: جمال الدين شيال، (القاهرة: ١٩٥٣)، ج١، ص٩٨.

٤٩- سبط ابن الجوزي (ت: ٦٥٤هـ/١٢٥٦م): مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية ،(الهند: ١٩٥١)، ج٨، ص١٨٩.

٥٠- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٣٨.

٥١- سەقلیە: یەکێکە لە دوورگەکانی دەریای ناوەڕاست و شێوەیەکی سێگۆشەیی لەخۆ دەگرێت دەکەوێتە خوارووی ئیتاڵیای ئێستا.

٥٢- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٩٨.

٥٣- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٩٨.

٥٤- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٠٥.

٥٥- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٠٦.

٥٦- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٠٦.

٥٧- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٠٦.

٥٨ -هەر (ڕەتڵێك) بريتييە لە (٨١٢.٥) غم. فالتر هنتس: المكاييل والاوزان الاسلامية ومايعادلها في النظام المتري، ت: كامل العسلي، مطابع القوات المسلحة الاردنية، (عمان: ١٩٧٠)، ص٣٠.

٥٩ ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٨٨.

٦٠- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٨٨.

٦١- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٠٥.
٦٢- بڕوانە: ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٣٠-٢٣٧.
٦٣- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٩١.
٦٤-ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٩٢.
٦٥- أعيان العصر وأعوان النصر، ج٤، ص١٩٨٨؛ السلوك، ج١، ق٣، ص٩١٨.
٦٦- الوافي بالوفيات، ج٥، ص١١٢؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص٢٣٨.
٦٧- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، مقدمة المحقق، ص١٦٩.
٦٨- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص١٩٣.
٦٩- قەڵای شیزەر: قەڵایەکی بەناوبانگی وڵاتی شام بووە لە نزیك هەردوو شاری (معره)و (حماه). بڕوانە: ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٣، ص٣٨٣.
٧٠- ابن أبي الهيجاء: تاريخ ابن أبي الهيجاء، ص٢٠٤.
٧١- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص١٧٠-١٧٤.
٧٢- بڕوانە: ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص١٧٩.
٧٣- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٦.
٧٤- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٨-٢١٩.
٧٥- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٠٦.
٧٦- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٢٥.
٧٧- بۆ بینینی شیعرەکانی بڕوانە: ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٠١.
٧٨- ابن ابى الهيجاء: تاريخ ابن ابى الهيجاء، ص٢٠١؛ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ئەم شاعیرە بڕوانە: ابن الجوزي (ت: ٥٩٧هـ/١٢٠٠م): المنتظم في تاريخ الملوك والأمم، تحقيق: محمد عبدالقادر عطا-مصطفى عبدالقادر عطا، دار الكتب العلمية،(بيروت: ١٩٩٢)، ج١٦، ص٢١١-٢١٢؛ اليافعي (ت: ٧٦٨هـ/١٣٦٦م): مرآة الجنان وعبرة اليقظان، في معرفة مايعتبر من حوادث الزمان، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٧)، ج٣، ص٧٨-٧٩.
٧٩- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٢٦.
٨٠- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٣٨-٢٣٩.
٨١- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٨.
٨٢- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٨-٢١٩.
٨٣- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٦.
٨٤- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٦.

٨٥-ابن ابي الهيجـاء: تـاريخ ابـن ابـي الهيجـاء، ص١٨١، ١٨٧، ١٩٣، ١٩٥، ٢٠١، ٢١٦، ٢١٨-٢٢٠، ٢٢٥، ٢٣٨-٢٣٩.

٨٦- بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی ئەم ڕووداوە بڕوانە: ابن العمراني (ت: ٥٨٠هـ/١١٨٤م): الانباء في تاريخ الخلفـاء، تحقيـق: قاسـم السـامرائي، (ليـدن: ١٩٧٣)، ص٢١٩-٢٢٠؛ الازدي (ت: ٦١٣هـ/١٢١٦م): اخبار الدول المنقطعة، تحقيق: عصـام هزايمـة وآخـرون، دار الكنــدي للنشــر والتوزيــع، (الأردن: ١٩٩٩)، ج٢، ص٤٤٠-٤٤٢؛ السـيوطي (ت: ٩١١هـ/١٥٠٥م): تاريخ الخلفاء، دار المعرفه، (بيروت: ٢٠٠٤)، ص٤٧٣-٤٧٤؛ مەهدی عوسمان هەروتی: ڕۆڵی سەربازیی کـورد لـە دەوڵـەت و میرنشـینە ناکوردییـەکان لـە سەردەمی عەباسیدا، ص١٠٣-١٠٥.

٨٧- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٢٥.

٨٨- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص١٩١.

٨٩- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص ١٩١، ٢٠٠، ٢٠٣.

٩٠- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٣٨.

٩١-ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٣٨-٢٣٩.

٩٢-ابـن القلانسـي: ذيـل تـاريخ دمشـق، (دمشـق: ١٩٨٢)، ص١٠-١١، ٣٨؛ ابـن ابـي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص١٧٢-١٧٦.

٩٣-ابن القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، ص٤٢؛ ابن ابي الهيجاء: تـاريخ ابـن ابـي الهيجـاء، ص١٧٧.

٩٤-ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج٨، ص٢٧٨-٢٧٩؛ ابن ابي الهيجاء: تـاريخ ابـن ابـي الهيجاء، ص١٧٠-١٧١.

٩٥- ابـن الاثـير: الكامـل في التـاريخ، ج٨، ص٣١٣؛ ابـن ابـي الهيجـاء: تـاريخ ابـن ابـي الهيجاء، ص١٧٤.

٩٦- بڕوانە: لاپەڕە (٣-٥) توێژینەوە.

٩٧- بڕوانە: سبط ابن الجـوزي: مـرآة الزمـان في تـاريخ الاعيـان، ج٨، ص١٤٨؛ ابـن ابـي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص١٩٨.

٩٨- سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، ج٨، ص١٤٨.

٩٩- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص١٩٨.

١٠٠- بڕوانە: سبط ابن الجوزي: مـرآة الزمـان في تـاريخ الاعيـان، ج٨، ص١٤٨؛ ابـن ابـي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص١٩٨.

١٠١- بڕوانە: سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، ج٨، ص١٧٢؛ ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٠٠.
١٠٢- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص١٧٦، ٢١٧.
١٠٣- بۆ شیعرەکانی بڕوانە: ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٧.
١٠٤- بۆ شیعرەکانی بڕوانە: ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٧.
١٠٥- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٩.
١٠٦- القرآن الكريم: سورة الكهف، آية (٧٩)؛ هەرچەندە (ابن كثير) لە تەفسیرەکەیدا ناوی ئەم پاشایەی بە گوێرەی گێڕانەوەیەك بە (هدد بن بدد) هێناوە و، وەك لە شرۆڤەی ئایەتەکەشدا باسی دەکات دەڵێت: پاشایەکی ستەمکار بووە و ویستوویەتی بەلەمی خەڵك و هەژاران دەست بەسەردابگرێت بەتایبەتیش ئەوەی کە پێغەمبەر موسا و (خدری زندە) یان پیاو چاکەکە سواری ببوون. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: تفسير القرآن العظيم، دار الهيثم، (القاهرة: ٢٠٠٥)، ج٣، ص١٧٨٢.
١٠٧- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٩.
١٠٨- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص١٩٨.
١٠٩- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٠٤.
١١٠- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٠٨.
١١١- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٦.
١١٢- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢١٦.
١١٣- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٣٦.
١١٤- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٠١.
١١٥- ابن ابي الهيجاء: تاريخ ابن ابي الهيجاء، ص٢٠٣.
١١٦- بڕوانە: اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٤٤١.
١١٧- اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ج١، ص١١١-١٢٣.
١١٨- اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٣٣.
١١٩- اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص١٦٦-١٦٨.
١٢٠- واتە (میر أبوعلی کوڕی محمد کوڕی ابی باساك میر حسام الدینی هەزبانی کوردی) کە یەکێکە لەو میرە کوردانەی لەگەڵ ملك الصالح نجم الدين أيوبی دوایین سوڵتانی ئەیوبی خزمەتیان کردووە و میرێکی گەورە و خاوەن پلەوپایە بوو، و لە ساڵی (٦٥٨ك/١٢٦٠ز) کۆچی دوایی کردووە. اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٧٧-٧٨، ٨٣-٨٤.

١٢١- عمـر کـوڕی اسـحاق کـوڕی هبـة الله کـوڕی صـدیق کـوڕی محمـود کـوڕی صـالح أبوحفص الامیر عمادالدینی خەلاتییە، و لە ساڵی (٥٩٨ك/١٢٠١ز) لە شاری خەلات لە دایـك بـووە و لـە سـاڵی (٦٦٦ك/١٢٦٧ز) کۆچـی دوایـی کـردووە. بـۆ تـەواوی ژیاننامەکەشی بڕوانە: الیونیني: ذیل مرآة الزمان، ج٢، ص٣٩٥-٣٩٨.

١٢٢- بڕوانە: الیونیني: ذیل مرآة الزمان، مج٢، ص٧٧-٧٨، ٨٣-٨٤، ٣٩٥-٣٩٨.

١٢٣- ابن ابي الهیجاء: تاریخ ابن ابي الهیجاء، تحقیق: صـجي عبـدالمنعم محمـد، مقدمـة المحقق، ص١١-١٥.

١٢٤- الصفدي: الوافي بالوفیات، ج٥، ص١١٢؛ العیني: عقد الجمان، ص٦٤٤.

## ملخص البحث

## ( ابن ابى الهيجاء الهذبانى ومنهجه في كتابة التأريخ )

## "دراسة تحليلية"

لقد ظهر في القرن السابع الهجري/ الثالث عشر الميلادي عدد من المؤرخين في العالم الاسلامي، تمكنوا من تطوير الكتابة التاريخية، ومنهم المؤرخ (الامير عزالدين محمد بن ابي الهيجاء الهذباني الاربلي)، الذي لم يكن مؤرخا فقط بل شاعراً وسياسياً إذ كان يتولى حكم دمشق في العصر المملوكي، وفي مجال التاريخ ألف كتاب (تاريخ ابن ابي الهيجاء) وهو موضوع هذه الدراسة.

لقد اثبت ابن ابي الهيجاء مكانته الهامة بين معاصريه من المؤرخين، أو الذين جاؤوا من بعده، بل تميز عنهم في المنهج التاريخي الذي استخدمه، فكتابه لم يكن مجرد سرد للاحداث التاريخية، واستخدم شتى الطرق في الكتابة التاريخية من أجل تحقيق هدفه، مما أعطى الكتاب أهمية كبيرة، بالاضافة إلى أنه انفرد بذكر وقائع لم تذكرها كتب التاريخ الأخرى المعاصرة لها.

يتكون البحث من تمهيد ومبحثين: خصص التمهيد للتحدث عن حياته وعصره، أما المبحث الأول فقد تناول منهج ابن ابي الهيجاء في كتابة التاريخ، وتضمن أربعة مواضيع منها، أولاً: حجم ومساحة الاحداث، وثانياً: تاريخ الاحداث، وثالثاً: المعطيات الحضارية، ورابعاً: التراجم، وفي المبحث الثاني: اشار الباحث إلى مصادر كتابه المدونة والشفهية.

## Abstract

( Ibn Aby Al-Hijah Al- Hazbani and his Methodology in Writing History)

In the 7th Hijrah century, several historians have been emerged in Islamic world who developed the methodology of writing history. For instance, prince Azadin Muhamed bn Abi-Hija Al-Hazbani Al-Arbily. He was not only a historian, but also a poet and a politician who ruled Damascus at the time of Mamluks. In the historical field, he wrote the History of Ibn Aby Al-Hijah which is the main topic of this study.

Ibn Aby Al-Hijah was not only as famous as his contemporaries, but, he was also adopted a distinguished methodology in writing history. His book was not merely a narration of historical stories, but he used several techniques to achieve his purpose in history and arriving at conclusions. Thus, this book is an essential historical source and recorded such historical events that none of his contemporaries mentioned.

This study includes an introduction and two sections. In the introduction, his life and era have been covered. In the first section, the methodology in historical studies of ibn Abi Al-Hija has been studied through considering the following subjects: first; the size and area of the events, second; the history of the events, third; the remains of the civilizations. Forth; biographies. And in the second section, the researcher studied the written and aural sources of his book.

# ڕۆڵی هۆکاره کۆمەڵایەتییەکانی خێزان و قوتابخانە لە سەرهەڵدانی نەخۆشییە دەروونییەکان لەلای قوتابیانی پۆلی یانزەمی ئامادەیی

## ( توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە قەزای سۆران )

**د. ڕۆزە عەبدوڵڵا شەریف**

ب. گ. چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی

**پێشەکی:**

لــەم توێژینەوەیــەدا ڕۆڵــی هــەردوو دەزگــا پەروەردەییــەکانی خێــزان و قوتابخانــە دەخەینــە ڕوو کــە تاچــەند بەشــێوەیەکی زانســتی و تەندروســت بــە ئەرکەکانیان هەڵدەستن لە پێگەیاندنی تـاکی دەروون دروسـت، ئـەم توێژینەوەیـە دابەش دەبێت بەسەر دوو تەوەری سەرەکیدا تیۆری و مەیـدانی، لـە تیۆرییەکەیـدا چوارچێوەی تیۆری  توێژینەوە و باسکردنێکی تیۆری نووسراوە لەسەر بابەتەکە و لە تەوەری دووەمدا چوارچێوەی کارڕاییە مەیدانییەکان و خستنەڕوو شیکردنەوە بۆ زانیارییە وەدەستهاتووەکان کـراوە و بەشـی کۆتـاییش ئـەنجام و ڕاسـپاردە و پێشنیازەکانی توێژینەوە دەگرێتەخۆ.

**تەوەری یەکەم/ لایەنی تیۆری توێژینەوە:**

**بەشی یەکەم/ ڕەهەندەکانی توێژینەوە و دیاریکردنی چەمکەکان:**

**باسی یەکەم/ ڕەهەندەکانی توێژینەوە:**

**١- گرفتی توێژینەوەکە:** مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی خاوەن هـۆش و هەسـتیار هەمیشە لێکدانەوە و بیرکردنەوەی هەیە بۆ ڕووداوەکان و پێشهات و گۆڕانکـاری و هـەموو ئـەو دیاردانـەی کـە لـە دەوروبەریـدا هـەن و ڕوودەدەن، لەگـەڵ ئەمەشـدا سروشــتی مرۆڤایــەتی وایکــردووە مــرۆڤ بەشــێوەی ژیــانی کۆمــەڵی بــژیت و لــە پەیوەندیدا لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا بوونی کۆمەڵایەتی خۆی دەستەبەر بکات، هـەر ئەو کۆمەڵبوون و پەیوەندییەش دیاردەگـەلێکی کۆمەڵایـەتی لەگـەڵ خۆیـدا پەیـدا

دەکات و پەیوەندییەکی دیالەکتیکیشی خولقاندووە لە نێوان خودی مرۆڤ و ئەو دیاردانە، ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییە کاریگەرییەکی بەردەوامی دەبێت لەسەری و کاری تێدەکات زیاتر لە ڕەفتار بەڵکو ئەم کارتێکردنە دەچێتە ناو ناخی مرۆڤەکان و بیرکردنەوەکانیشی گۆڕانکاریيان بەسەردادێت، بەتایبەت لە سەردەمی ئێستادا کە گۆڕانکارییەکان زۆر خێران و چەمکی جیهانگیری (Globalisation) کە جیهانی کردووە بە گوندێکی بچووك و گۆڕانکارییەکانی زۆر خێرا کردوون کە ڕەهەندی کۆمەڵایەتی فراوان لەخۆ دەگرێت، ڕووداوەکان زۆر بەخێرایی دەگوازرێنەوە، هەموو ئەمانەش ژیانی کۆمەڵایەتی ئێمەی زیاتر ئاڵۆز کردووە و زیاتر لەوەش ئەو کاریگەرییانە شۆڕدەبنەوە بۆ ناو ناخ و دەروونی مرۆڤەکان. بەو پێیە کێشەی توێژینەوە لەوەدا دەبینینەوە کە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان (قوتابخانە، خێزان) تاچەند ڕۆڵیان هەیە لەسەر دروستبوونی نەخۆشییە دەروونییەکان.

**٢- ئامانجەکانی توێژینەوەکە:** ئەم توێژینەوەیە کۆمەڵێك ئامانجی لەپشتە کە لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەی خوارەوە دەتوانین بگەینە وەڵام:

أ- ئایا خێزان وەك هۆکارێکی کۆمەڵایەتی تاچەند ڕۆڵی هەیە لە دروستبوونی نەخۆشییە دەروونییەکان.

ب- خێزان تاچەند توانیویەتی کەشێکی تەندروستیی دەروونی بۆ منداڵەکانی دابین بکات؟

ج- ئایا تاچەند قوتابخانە وەك فاکتەرێکی کۆمەڵایەتی کاریگەری هەیە لەسەر تێکچوونی باری دەروونی قوتابییەکانی و کەشێکی وای ڕەخساندووە کە قوتابی بتوانێت گرفتەکانی شەفافانە لەلای مامۆستایەك یاخود توێژەری کۆمەڵایەتی باس بکات؟

**٣- گرنگیی توێژینەوەکە:** سەردەمی ئێستای ژیانی مرۆڤەکان لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەی بە خۆیەوەی دیوە لە هەموو بوارەکاندا لەگەڵ ئەوەی ئامانجی ئەم بەرەوپێشچوونە لە بنەمادا بۆ خۆشگوزەرانییە، بەڵام لە ڕووەکەی تری ئاڵۆزییەکی بەرچاوی بۆ مرۆڤ هێناوە، وایکردووە پێداویستی ژیانکردن زیاد بێت هەم لەڕووی ماددی هەمیش لەڕووی مەعنەوییەوە، لە نێو ئەم جەنجاڵییەشدا

زۆرجار مرۆڤەکان خۆیان لە نێو ژیانێکی تاکگەرایی و تەنهاییی دەروون ئالۆزیدا دەبیننەوە سەرهەڵدانی نەخۆشییە دەروونییەکان ناکاتە شتێکی سەرسامی و ئاساییە ببێتە نەخۆشییەکی بەربلاو، هەموو ئەو فراوانبوون و پێشکەوتنانەی لە بوارە جیاجیاکانەوە هاتوونەتەدی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن زیاتر ئالۆز دەکات و بەجۆرێك ئەم پرۆسەیە دەبێت وەلامدەرەوەی ئەو واقعە بێت کە تاك هێندە بەهێز بکات توانای وەلامدانەوە و هەزمکردنی ئەو فەزایەی هەبێت کە لە کۆمەڵگاکەیدا هەیە، رەفتار و کەسایەتی مرۆڤ لە بۆشاییدا دروست نابێت بەڵکو زادەی ئەو واقعەیە کە تیایدا دەژیت و لە نێو ئەو واقعەشدا دەزگا پەروەردەییەکان ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە پێگەیاندنی تاك، کۆمەڵگا لە کۆی خێزانەکان پێکدێت و بارودۆخی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا رەنگدانەوەی رەوشی خێزانەکانە چونکە هەر تاکێکی کۆمەڵگا ئەندامە لە خێزانێك ، بۆ گۆڕانکاریی ریشەیی و چارەسەری گرفتە بنچینەییەکانیش سەرەتا پێویستە لە خێزان و دواتریش لە دامەزراوە پەروەردەییە فەرمییەکان دەست پێبکەین، لەم توێژینەوەیەشدا ڕۆڵی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی (خێزان و قوتابخانە) لە سەرهەڵدانی نەخۆشییە دەروونییەکان کراوە بە بابەتی توێژینەوە، هەموو توێژینەوەیەکی زانستی گرنگیی خۆی هەیە چونکە بەپێی ڕێباز و میتۆدی زانستی ئەنجام دەدرێت، گرنگیی ئەم توێژینەوەیە بەکورتی لەوەدا دەبینینەوە: هۆشیارکرنەوەی چین و توێژەکان لە مەترسیی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی تووشبوون بە نەخۆشییە دەروونییەکان و دەرخستنی ڕۆڵی فاکتەرە پەروەردەییەکان لە دروستبوونی نەخۆشییە دەروونییەکان، لەرێگەی دەرئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە دەکرێت هەندێ ڕێگەچارە دابنێین بۆ کێشەو گرفتەکانی قوتابخانە و پەروەردەی خێزانی و هەروەها خۆپاراستن لە نەخۆشییە دەروونییەکان.

**باسی دووەم/ پێناسەکردنی چەمکەکان:**

**یەکەم/ ڕۆڵی کۆمەڵایەتی** (social role):

١- پێگەکان ڕۆڵەکان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن و ڕۆڵەکان شانۆیەك پێکدەهێنن و کە دەدرێ بە تاکەکەس لە پێگەیەکی دیاریکراودا، ڕۆڵ نیشانی

تاکەکەس دەدات کە لەپێگەیەکی دیاریکراودا بە چ شێوەیەك هەڵسوکەوت بکات و ڕۆڵ وادەکات چاوەڕوانی چ شتێك لەو بکەین، چۆن هەڵسوکەوت بکەین و چۆن بیربکەینەوە و چ کەسێکین (شارۆن ٢٠١٠ ، ل ٢٤١).

٢- بریتییە لە ڕەفتارێك کە کۆمەڵگا چاوەڕێی دەکات و داوای دەکات لە تاکێك بۆ ئەوەی پێگەیەکی دیاریکراوی هەبێت، وە بریتییە لە ڕەفتاری جیاکردنەوەی تاك لە دەوروبەری و لەو تاکانەی لە پێگەی تردان (راجح ١٩٨٥، ل٥٣٠).

٣- منوچێهر موحسنی (٢٠٠٧، ل١٣٥) پێی وایە ڕۆڵەکان بریتین لەو نموونە ڕەفتارییانەی کە بۆ بەدەستهێنان و پاراستنی پێگە کۆمەڵایەتییەکان پێویستە ڕەچاو بکرێن.

پێناسەی ئیجرائی: بریتییە لەو کاریگەرییەی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی (قوتابخانە و خێزان) هەیانە لە سەرهەڵدانی نەخۆشییە دەروونییەکان .

**دووەم/ هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان** social factors:

١- گرنگترین هۆکارەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون بریتین لە: خێزان، هاوەڵان، برادەران، قوتابخانە، هۆکارەکانی بەیەکگەیشتنی کۆمەڵی (موحسنی٢٠٠٧، ل١٤٥).

٢- کۆمەڵێك بارودۆخن کە پەیوەستن بە کەسێکی دیاریکراو جیای دەکاتەوە لە کەسانی تر ئەمەش دەرئەنجامی مۆرکی ئەو بارودۆخە گشتییانەیە کە پەیوەستن بەو کەسە و کەسانی تر لە ناو کۆمەڵدا، بەو مانایەش بارودۆخی کۆمەڵایەتی لەوەدا کورت دەبێتەوە کۆمەڵێك لە پەیوەندیی دروست دەبن لە نێوان تاکێك و کۆمەڵێکی دیاریکراو لە خەڵك و تێکەڵاویان دەبێت بە پەیوەندییەکی پتەو وەکو تاکەکانی خێزان و گرووپ و قوتابخانە و دۆست و هاوڕێیان کە هەڵیاندەبژێرێت (عبدالله ٢٠١١، ل١٤٢).

٣- هۆکارە کۆمەڵایەتیەکان ئەمانە دەگرێتەوە، لە هەمان کاتدا گرینگترین ئامرازەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون (socialization) یشن ئەوانیش: خێزان، قوتابخانە، فەرهەنگ، گرووپە مەرجەعەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن (ترکیە٢٠٠٤، ص٢٣٧).

پێناســـەی ئیجرائـــی: هۆکـــارە کۆمەڵایەتییـــەکان بـــریتین لـــە دامـــەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی (خێزان، قوتابخانە) کـە هەڵدەسـتن بـە پـەروەردە و فێرکردنـی قوتابی و ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیـە لـە بونیادنـانی کەسـایەتی تـاك لـە کۆمـەڵگای کوردی.

**سێیەم/ خێزان** family:

١- ئاماژە بۆ کۆمەڵە تاکێك دەکات کـە پەیوەنـدیی هاوسـەرگیری و خـوێن پێکیان دەبەستێ، لە یەکـە یەکـەی نیشـتەجێبووندا دەژیـن و کـارلێکی بـەردەوام لەگـەڵ یەکتریـدا دەکـەن، هـەروەك چـەند ڕۆڵێکـی کۆمەڵایەتیشـیان هەیـە کـە دەیگێـڕن، لـە نموونـەی ڕۆڵـی دایـك و بـاوك و ژن و مێـرد و منداڵـەکان، خـاوەنی ڕۆشنبیریی هاوبەشی خۆیانن (سەمیرە ٢٠٠٩، ل١٠٢).

٢- خێزان یەکەمین و گـرنگترین هۆکـاری پەروەردەیـە کـە بـەهای ئـایینی و ڕەوشتی لـە هەڵسـوکەوتی تاکـدا دەچـێنێت و ڕەفتارەکـانی بـەپێی ئـەو بەهایانـە (القیم) ڕێك دەخات، (غباری ٢٠٠٦، ص ٢٨٨).

٣- یاخود خێزان یەکێکە لە گرنگترین دامـەزراوە کۆمەڵایەتییـەکان بـەواتای بەردەوامیی ژیانی مرۆڤەکان، وە بناغەیە بـۆ گشـت دامـەزراوە کۆمەڵایەتییـەکانی تـر، کـە ناکرێـت بـەردەوام بـن بـەبێ بـەردەوامیی خێـزان وەکـو دامەزراوەیـەکی کۆمەڵایەتی ( العزاوي و ابراهيم ٢٠٠٢، ص٢٩).

پێناسەی ئیجرائی: بریتییە لەو دامەزراوە کۆمەڵایەتییـەی کـە قوتـابی تێیـدا پەروەردە دەبێت و هەموو ئـەو تایبەتمەنـدی و بارودۆخانـەی لـەناو خێزانـدا هـەن ڕوودەدەن کاریگەری لەسەر کەسایەتی و باری دەروونی ئەو قوتابییە دەبێت.

**چوارەم/ قوتابخانە** school:

١- جۆن دیـوی دەڵێـت قوتابخانـە دەزگایـەکی کۆمەڵایەتییـە، پـەروەردەش ڕووداوێکی کۆمەڵایەتییە، ژیانی ناو خوێندنگە چەشنێکە لە ژیانی نـاو کۆمـەڵ کـە هـەموو دەزگـا و ڕووداوە کۆمەڵایەتییـەکانی تیـا کۆبۆتـەوە. یـاخود قوتابخانـە دەزگایەکی پەروەردەییە، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان کۆمەڵگا بـەدی هێنـاوە، دەزگایەکی پەروەردەییە لە ڕەخساندنی دەوروبـەرێکی پـەروەردەییش بەرپرسـە

کە گەشەپێدانی کەسێتی قوتابی لە هەموو ڕووەکانییەوە ئامانجیەتی (کەریم ٢٠٠٧، ل١٨).

٢- قوتابخانە شوێنێکە دونیابینی، داب و نەریت و زۆرێك لە زانین و شارەزایی بۆ منداڵ دەگوازێتەوە ( نجاتی ١٣٨٨، ص ٥٧).

٣- قوتابخانە دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییە، پێویستە بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی کە زامنی پەیوەندییەکان بکات لەنێوان خێزان و دەوڵەت لە ئامادەکردنی نەوەی نوێ و تێکەڵکردنیان لەناو چوارچێوەی ژیانی کۆمەڵایەتی (راجح ١٩٨٥، ص٥٣)

پێناسەی ئیجرائی: قوتابخانە دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییە، یەکێکە لە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی پەروەردەکردنی قوتابی، قوتابی لەئەنجامی ئەندامبوون تیایدا فێری کۆمەڵێك پرەنسیپی زانستی و کولتووری و گونجان دەبن کاریگەرییەکانی خۆی لەسەر قوتابیان بەجێ دەهێڵێت.

**پێنجەم/ نەخۆشییە دەروونییەکان** psychiatry :

١- هەندێك لە زانایان تەنها ئەو پەشێوییانە بە نەخۆشی دەروونی دادەنێن، کە لەبارەی سۆزی مرۆڤەوە ڕوودەدەن، بەڵام زۆربەی نووسەرەکانی دەروون دروست مانای نەخۆشی دەروونی بەفراوانتر دادەنێن بەجۆرێك کە هەموو گۆڕان و شێوانێکی مرۆڤ دەگرێتەوە، وەکو: پەشێوی سۆزی، پەشێوی ژیری، پەشێوی لەش، پەشێوی ڕەوشت (ژالەیی ١٩٨٦، ل٥٨).

٢- یاخود بریتین لە کۆمەڵێك لەو لادانانەی بەهۆی گرفت و تێکچوونی دۆخی جەستەیی و ئەندامییانەی پێکهاتەی مێشکدا ڕوونادەن (جا ئەگەر ماکەکانیشی جەستەیی و ئەندامی بن) ئەم لادانانە چەند دیمەن و لێکەوتەیەکیان هەیە، گرنگترینیان بریتین لە: گرژیی دەروونی و خەمۆکی و نیگەرانی و وەسواسی و ئەو ڕەفتارە ناچارییانەی کە خۆیان بەسەر مرۆڤدا دەسەپێنن و بەبێ ویستی خۆی ئەنجامیان نادات (فەهمی٢٠١٢، ل٢٧٤).

٣- یاخود نەخۆشی دەروونی شڵەژانێکی کردارییە لە کەسایەتی مرۆڤ بە نیشانەی جەستەیی و دەروونیی جیاواز دەردەکەوێت وەك: دڵەڕاوکێ، وەسواس،

فۆبیـا و دروسـتبوونی گومـان لـە دەوروبـەری بـەبێ هـیچ بەڵگەیـەك (عزیـز ٢٠١٢، ل٢٢٦).

پێناسەی ئیجرائی: نەخۆشییە دەروونییەکان تێکچوونی هاوسەنگی دەروونی قوتابیـانی پـۆلی یانزەیـەمی ئامـادەیی دەگرێتـەوە لـە دەرئـەنجامی کاریگـەریی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی خێزان و قوتابخانە.

## بەشی دووەم/ زەمینە کۆمەڵایەتییەکانی نەخۆشییە دەروونییەکان

### باسی یەکەم/ ڕۆڵی هۆکـارە کۆمەڵایەتییـەکان لـە سـەرهەڵدانی نەخۆشـییە دەروونییەکان:

منداڵ دوای لەدایکبوون دەکەوێتە ژێر کاریگەری ژینگـە بـە مانـا فراوانەکـەی (ژینگـەی جـوگرافی، مێـژوویی، کۆمەڵایـەتی، دەروونـی) هەریەکـە لـەو ژینگانـەی سەرەوە شوێن پەنجـەی خـۆی لەسـەر کەسـایەتی و بـاری دەروونـی مـرۆڤ بـەجێ دەهێڵێت. هەموو گەل و نەتەوە و دەستە و تاقمێك خاوەنی داب و نەریت و بەها و ئاکاری کۆمەڵایەتی خۆیانن و لەزۆر لایەنـەوە هەڵسـوکەوت و ڕەوشـتیان پابەنـدی ئەو داب و نەریت و بەها کۆمەڵایەتییانە دەبێت و لە نەوەی تری جیا دەکاتەوە کە لەوانەیـە خـاوەنی هـەمان ژینگـەی جـوگرافی و مێـژووییش بـن، بـەڵام جیـاوازیی ژینگەی کۆمەڵایەتی، زۆر جیاوازی تریان بۆ دروست دەکـات. بەهـەمان شـێوەش ژینگەی دەروونیش ڕەنگدانەوەی تایبـەتی خـۆی هەیـە، ژینگـەی دەروونـیش ئـەو بارودۆخ و کەش و ئـاو و هـەوا تایبەتییـە کـە تـاك لـەناو خێـزان و کۆمەڵەکەیـدا بەرەنگاری دەبێتەوە، ئینجا ئەگەر ژینگە دەروونییەکە ئاسایی و بێ گرێ و گرفت بێت ئەوا بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە لە هەڵسوکەوت و بیر و بۆچـوونی تاکـدا ڕەنـگ دەداتەوە، بەڵام ئەگەر پڕ بـوو لـە گرفـت و ئەندێشـە و بێبەشـبوون و جیـاوازی و کۆسـپ، ئەوکاتـە بەشـێوەیەکی خـراپ لەسـەر کەسـایەتیی تـاك دەکەوێتـەوە (قەرەچەتانی ٢٠٠٧، ل٤٨–٥١).

ئـــەو ناوەندانـــەی کۆمـــەڵگا بەدرێـــژایی قۆناغـــەکانی پێگەیشـــتنی مـــرۆڤ شـــێوازەکانی ژیـــان و بەگشـــتی کولتـــوور دەگوێزنـــەوە بـــە هۆکارەکـــانی بەکۆمەڵایەتیبوون ناو دەبرێن، ئەم هۆکارانە هەمیشە کۆمەڵە ڕێنماییـەکی نـەگۆڕ فێری کەسـەکان ناکـەن، بـەڵکو هەرکەسـێك لەهـەر هۆکارێکـەوە شـتی جیاجیـا و

تەنانەت هەندێ جار شتی دژبەیەکیش فێر دەبن. سەرەڕای ناوەڕۆکی هەریەك لەم هۆکارانە، کاریگەری و شێوازی فێرکاری هەریەك لەمانەش جیاوازن، بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین سەرلەبەری کۆمەڵگا بە هۆکاری بەکۆمەڵایەتیبوون دابنێین (موحسنی٢٠٠٧، ل١٣٥-١٣٦).

مرۆڤ هەر خۆی بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و ئەندامە لەم کۆمەڵانە، بۆیە ڕەفتارەکانی بەندە بە کاریگەریی خۆی و کارتێکردنی لە کۆمەڵەیەکی تایبەت هەروەها بە پەیوەندی لەگەڵ ئەم کۆمەڵانە، بەهەڵەدا دەچین ئەگەر حوکمەکانمان بەردەوام بوو بەچەند تایبەتمەندییەکی هەڵچوونیان، بۆیە ناکرێ بڕیارێکی هەتا هەتایی بەسەر یەکێك بدەین کە ئەمە هەردەم شەڕەنگێزە یان ملکەچ یاخود ئارەزووی کۆنترۆڵکردنی هەیە و ...هتد. بەڵکو لەوانەیە مرۆڤ لەهەندێ کاتدا ڕەفتاری وەك تاکەکەسێکی ئاسایی بێ، بەلاّم هەر خۆی لە ساتێکی تردا هەڵوێستی شەڕەنگێزی هەبێت، ئەو ژینگەیەی کە دەوری مرۆڤی داوە بەکەسایەتی و بابەت و هەروەها فێربوون و پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتی ڕۆڵی کاریگەر دەبینێ لە ئاراستەکردنی دیدی تاك بۆ ژیان و شێوازەکانی ڕەفتاری و لایەنە جۆراوجۆرەکانی. تێڕوانینی مرۆڤ و باوەڕهێنانی بە هەندێ لەو ئایدۆلۆژیانە و مەزهەبە کۆمەڵایەتی و ئایینی و سیاسییەکان کافییە بۆئەوەی بزانێ کە ئەم شتانەی وەرگرتووە و باوەڕی پێهێناوە بێ ئەوەی هیچ هەوڵێکی دابێ بۆ گفتوگۆکردنی یاخود شیتەڵکردنەوەیەکی ئەقڵیانە کە باوەڕی پێیەتی و وەری گرتووە، بەڵکو ئەمەیان واقیعێکە لەو کاریگەرییە ژینگە کۆمەڵایەتییەی کە پێی پەروەردەبوونە کە هەردەم کارلێکی لەگەڵ دەکات و گەشەی پێدەکات (عوض ١٩٨٨، ص٣٦٩).

بەپێی ئەوەی سنووری بابەتی ئەم توێژینەوەیە هەردوو هۆکاری خێزان و قوتابخانەیە لێرەدا باسی ئەم دوو هۆکارە دەکەین:

**یەکەم/ خێزان:** ڕێکخراوێکی ناڕەسمییە"عورفی"و دەسەلاّتی بەسەر تاکەکانیدا گەیشتۆتە ئاستی کۆنترۆڵکردنی ڕەوشی ڕۆژانەیان و پەیوەندیی کۆمەڵایەتییان و چارەنووسی ئابوورییان دواتر وەکو خانەیەکی کۆمەڵایەتی وەسفکرا کە هەڵدەستێ بە بەرهەمهێنانی مرۆیی. کاتێك لە میانەی مێژووی

کۆمەڵگا مرۆییەکانەوە ژیانی خێزانی دەخەینەڕوو، دەبینین گۆڕانکارییە وەزیفی و ستراکتۆرییەکانی هاوگوزەری گۆڕانکاری ئەو کۆمەڵگایە بووە کە تێیدا ژیاوە. لە قۆناغی سەرەتایی پێشکەوتنی کۆمەڵگادا خێزان هەموو پێداویستییەکی ئەندامەکانی"تەندروستی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و سەربازی" ئامادە دەکرد، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی بەردەوامی کۆمەڵگا و سەرهەڵدانی پەرستگا و سوپا و حکومەتی مەرکەزی و قوتابخانە و نەخۆشخانە و کارگە و پیشەسازییەکە وەکو دامەزراوەیەك، ئیتر ئەم دامەزراوانە، زۆربەی ئەو کارانەی کە خێزان دەیکرد لێی سەندنەوە، خێزانیش تەنها ئەرکی زیادکردنی کۆمەڵگا بە ئەندامی نوێ و ئەرکی هاودەنگیکردنیان لە قۆناغی منداڵی و ئاراستەکردن و راهێنانیان بەو وڵاتانەی کە کۆمەڵگاکانیان پێیان دەسپێرێ (خلیل ٢٠٠٧، ل١-٣).

تاك بەو پێیەی بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە بۆ گەشەکردنی پێویست بە تێرکردنی پێویستییە دەروونییە بنچینەییەکان هەیە، کەسایەتی تاك زۆر کاریگەر و دڵگران دەبێ بە دەستەبەر نەکردنی یان فەرامۆشکردنی یاخود نەهاتنەدیی یەکێك لە ئامانجەکانی. بەشێوەیەکی گشتی کاریگەر دەبێ بەو شێوازەی یان ئەو ڕێگایەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە هێنانەکایەی پێداویستییەکانی بەتایبەت لە قۆناغی منداڵەتیدا. لەگرنگترین ئەو پێداویستییانەش پێداویستی تاك لە بەدەم وەهاتنی لایەنی سۆز و میهرەبانی لە نێو خێزاندا، پێویستی بەپێگە و ڕێزگرتنی کۆمەڵایەتی هەیە، پێویستی بۆ دەستەبەرکردنی دەسەڵات، هەروەها دەرچوون و دەسکەوت و دەستەبەرکردنی خۆی و حەزکردنی بەهێمنی و ئارامی و هەوڵدانی بۆ توێژینەوەی شارەزاییە مرۆڤایەتییەکە و هەوڵدانی بەستنەوەی لەگەڵ یەکتر. ئەم پێویستییانە گەورە و بچووك، قوتابی بۆ مامۆستا و منداڵ بۆ باوکی ڕادەکێشێ، وێڕای گۆڕانکاری و جیاوازی لە پێویستییەکان لە قۆناغێك بۆ قۆناغێکی تر، لە گەشەکردنێك بۆ گەشەکردنێکی تر گۆڕانکاری بەخۆوە دەبینێ. دەبێ ئاگاداری ئەو حاڵەتانەبین بۆنموونە کاتێك مامۆستایەك سزای قوتابی خۆی دەدات یاخود باوکێك ئەزیەتی منداڵەکەی دەدات و لێی دەدات ئەم تێرکردنی حەز و ئارەزووی مامۆستاکە یان باوکەکەیە نەك تێرکردنی بەرامبەرەکەی، ئەم هەڵانەش زۆر لە باوکان و مامۆستاکان پیادەی دەکەن و ئەم ڕەفتارانەش بۆ قەرەبووکردنەوەی

پێداویستییەك لە پێداویستییەکانی خۆیانە کە پێشتر لەدەستیان داوە (جلال١٩٧٠، ص١٧).

زانایانی دەروونزانی ئێستا زۆر دووپاتی گرنگیدان بەسۆزە ئالوگۆڕکراوەی نێوان منداڵ و دایك دەدەن بۆ داهاتووی کەسایەتی و تەندروستیی دەروونی ئەم منداڵە، ئەگەر منداڵ بەپێی پێویست ئەم سۆز و میهرەبانییەی لەماڵەوە بۆ دەستەبەر نەکرا، ئەوا ئاکامی خراپی لێدەکەوێتەوە لەکاتی گەورەبوونیدا دوور نییە تووشی لادان و کەسانی خراپ بێ، زوو فریو بدرێ لەلایەن کەسانی تر، بەتایبەت کچان ئەگەر باوك بەپێی پێویست سۆزی باوکایەتی پێنەبەخشی و فەرامۆشی کرد، ئەوا لەکاتی گەورەبوونیدا زوو بەقسەی کوڕێك فریو دەدرێ لەوانەشە ئاکامی خراپی لێبکەوێتەوە و بە هەردوولا تەواو بێ. لەهەمان کاتدا زیادەڕۆیی لە خۆشەویستیی دایك بۆ منداڵەکەی ئاکامی پتەو نەبوونی کەسایەتی و ناتوانێ وەك کەسێکی خاوەن کەسایەتییەکی تەواو ڕەفتار بکات، زۆرجار تووشی پێکدادان دەبێ و ناتوانێ بڕیار لەسەر شتێك بدات یان دەستنیشانی هاوسەری ژیانی بکات. هەروەها منداڵ پێویستی بە ڕێزگرتنی کەسایەتیی و پێگەی کۆمەڵایەتی هەیە تاکو هەست بە بوونی کەسایەتیی خۆی بکات و ڕۆڵێکی ئەکتیڤ ببینێ و گەشبین بێ لەژیاندا چونکە ئەگەر ئەمەی بۆ دەستەبەر نەکرا، دوور نییە پەنا بباتە بەر کەسانی خراپ و تووشی لادان بێ، وێڕای هەست بە پەراوێزی و فەرامۆشکردنی لەلایەن کەسانی دەوروبەر و کۆمەڵگەکەی و شێوەیەکی خراپی خۆی و کۆمەڵگاکەی بۆ وێنا دەبێ ( زهران ١٩٧٤، ص٤٢).

زۆرجار کێشە لە خێزاندا ڕوودەدات چونکە منداڵەکان دەیانەوێت لەگەڵ سەردەمی سەدەی ئێستا بەڵام دایکان و باوکان دەیانەوێت بەپێی سەدەی رابردوو بژین، کێشەی تر زۆر جار دروست دەبێت بەهۆی بیرتەسکی یەکێك لە دایکان یان باوکان بۆ ژیان و ڕەتکردنەوەی ڕای بەرامبەر. پاراستنی خێزان لە هەڵوەشانەوە و تێکچوون پێویستە بۆ نەهێشتنی ئەو کاریگەرییانەش لەسەر لادانی منداڵەکان، وە لە خێزاندا تەندروستی دەروونی و تێکچوونی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەردەکەوێت، توخمە بنچینەیییەکانی خێزان باوك و دایك و خوشك و براکان و خزمەکان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە پەروەردەکردنی منداڵ، کە بەها و

داب و نەریت و هەتا چوارچێوەی کەسایەتی و شێواز و ئاراستە ڕەفتارییەکان و بیرکردنەوەشی پێ دەنۆشێ. (غباري ٢٠٠٦، ص٢٨٨-٢٨٩ ).

زانایانی کۆمەڵایەتی گرنگی بە خێزان دەدەن چونکە کۆمەڵگا لە کۆمەڵێك خێزان پێکدێت، هەموو خێزانێکیش بەشێکە لە بونیادی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی، چونکە بەرپرسیاریەتی پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی تاکەکانی لە ئەستۆدایە، ئەو پرۆسەیەش پێوەر و نموونە ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا لەو تاکانەدا دەچێنێت، ئەو هێزەش وادەکات هەڵبستن بە ئەرك و ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان و مومارەسەی بەرپرسیاریەتی بکەن بەرامبەر بە کۆمەڵگا (العزاوي و ابراهيم ٢٠٠٢،ص٢٩).

هەندێك هۆکاری بنچینەیی هەن کە بەشداری لە گەشەی خێزانی دەکەن ئەوانیش: ١- پەیوەندیی مرۆڤایەتی نێوان دایك و باوك و منداڵەکان واتا جیاکاری لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی نێوان منداڵەکانی یەك خێزان، زۆر جار گوێمان لەوە دەبێت کە باوکێك دەڵێ ئەم منداڵەم لەوانی تر خۆشتر دەوێت. ٢- ژمارەی ئەندامانی خێزان، ڕوانینی دایك و باوك بۆ قەبارەی خێزان دەکەوێتە سەر توانستی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئایینی. ٣- جۆری منداڵ و پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی: لە کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵاتی شاخاوی هەتا ئەم دوایانەش کوڕ پێگەیەکی تایبەتی هەبوو. ٤- لایەنی فێرکردنی خێزان: فێرکردن ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە بونیادی ئاراستەکردنی منداڵ بۆ وەرگرتنی بەها و پێوەری تایبەت بە کۆمەڵگا. ٥ - چینی کۆمەڵایەتیی دایك و باوك: دایك و باوکانی کە سەر بە چینی کۆمەڵایەتی نزمن ڕێزگرتن و گوێڕایەڵی و ڕاستی و ئەدەب لە پەروەدەی منالەکانیان ڕەنگ دەداتەوە، بەڵام ئەو دایك و باوکانەی کە لە چینی کۆمەڵایەتیی ناوەندن گرینگیدانیان بە منداڵەکانیان لە گەشەی خودی منالەکە چڕ دەکەنەوە (ترکیە ٢٠٠٤، ص٢٣٦).

خێزان بەسەرچاوەیەکی سەرەکی توندوتیژی قوتابخانەیی هەژمار دەکرێت، ساڵانی یەکەمی ژیانی منداڵ چوارچێوەی گشتی کەسایەتی منداڵ دیاریدەکات، بۆیە دابین نەکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی منداڵ لەلایەن باوکیەوە، جا بەهۆی هەژاری یان دەستتەنگی بێت یان هەر هۆکارێکی تر بێت، هەروەها فەرامۆشکردنی منداڵ لەلایەن دایك و باوکیەوە و بێبەشبوونی لە سۆز و

خۆشەویستیی دایك و باوك، هەروەها مشتومڕ و دەمەقاڵێ و بگرەو بەردەی بەردەوام لەناو خێزاندا و بەکارهێنانی توندوتیژی لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ناو خێزاندا، کاریگەری لەسەر کەسایەتی منداڵ بەجێ دێڵێ، چونکە ئاکار و ڕەوشت لە دەرئەنجامی شارەزابوون و هەستەکان و کاریگەرییە ژینگەییەکان و دەروونییەکان و کۆمەڵایەتییەکانی ڕابردوو و ئێستا دێتە ئاراوە و منداڵ ئەو کاریگەرییانە دەگوازێتەوە بۆ قوتابخانە، هۆکارەکانی ڕابردوو لەگەڵ هۆکارەکانی ئێستای قوتابخانە کارلێك دەکەن و ئاکاری منداڵی توندوتیژی قوتابخانەیی لێ پەیدا دەبێت (پێندرۆیی ٢٠١٢، ل٨٥).

دەتوانین زیانەکانی توندوتیژی خێزانی لەم چەند خاڵەدا کورت بکەینەوە: "لێکترازان و هەڵوەشانەوە و پەرتەوازەبوونی خێزان، نەمانی خۆشەویستی، نەمانی لێبوردەیی و بەخشین، نەمانی ئاسوودەیی و ئارامی و خۆشی، دواکەوتن لە ڕووی زانستی و ئەقڵی و داهێنانەوە، لاوازکردنی هەستی بەرپرسیاریەتی مرۆڤ، زیادکردنی هەستی بەدگومانی و بەدبینی، دووچاری ڕەشبینی بوون و کوژانەوەی چرایی گەشبینی بۆ ژیان، دووچاری گۆشەگیربوون، دووچاری نەخۆشی جەستەیی دەروونی بوون (پێندرۆیی ٢٠١٢، ل١٠٤).

**دووەم/ قوتابخانە:** پەروەردە "بریتییە لە پرۆسەی سازدان و بونیادنانێکی دوور ئەنجام هەرچەندە هەندێ لە مژدە و ئاماژەکانی بەخێرایی بەدی دەکرێت، بەڵام هەندێ لە مەبەستەکانی تا چەند ساڵێك تێنەپەڕێ نایەنە دی و تا چەند قۆناغێك لەتەمەنی تاك تێنەپەڕێ، پەروەردەی دەروونی بۆ قوتابی یان بۆ کۆمەڵگا مەبەستێکی پەروەردەی گرنگە، لەگەڵ مەبەستەکانی تردا ڕۆڵی تەواو دەبێت، بەڵام هەندێ جار تایبەتمەندییەکانی لە قوتابخانە یان خێزان و کۆمەڵگەدا دەردەکەون، کەواتە تەندروستی دەروونی پێوەرێکی گرنگ پێکدێنێت لە بڕیاردان لەسەر چالاکیی هەریەك لە مامۆستا و بەڕێوەبەرایەتی و میتۆد و ئەو چالاکی و جموجۆڵانەی کە لەخۆیان دەگرن. "تەندروستیی دەروونی قوتابی" پێوەرە بۆ مامۆستای پەروەردەیی چونکە مامۆستای باش لە ئێستادا پەیامەکەی لەوەدا کورت هەڵنایەت کە زانیاری لە سەرچاوە و پەرتووك و فەرهەنگەکانەوە بگوازێتەوە بۆ مێشکی قوتابیان و خەزنکردنی تیایدا، بەڵکو لەمە تێپەڕی کردووە

بەکارێکی گرنگتر و فراوانتر بە پەیامێکی فرەلایەنتر کە بریتییە لە برەودان بە تواناکانیان بە هاوسەنگییەکی باشە و لەگەڵ خۆیان و کۆمەڵگەکانیاندا لە ئێستاو ئاییندەدا، ئەمەش وا پێویست دەکات لەسەر مامۆستاکە ئاگادار بێت لە پێکهاتەی تاك و گەشەسەندنی و پێشکەوتنی تایبەتمەندییەکانی بەدرێژایی قۆناغەکانی گەشەسەندنی لەلایەك و پێداویستی و مەبەستەکانی کۆمەڵگە لە لایەکی تر، هەروەها دەبێت بەتوانا بێت لە ڕێکخستن و بەدیهێنانی پەیوەندییەك لەنێوان تاك و کۆمەڵگەدا کە مایەی خۆشبەختیی تاك و پێشخستنی کۆمەڵگە بێت (رشوان ٢٠٠٣، ص٩٢).

هەر مامۆستایەك لەو پلەی کە دەرسی پێدەڵێتەوە یان چاودێری دەکات بوو بە هۆی زیادبوونی ڕێژەی نەهاتنی قوتابیان و تووشبوونیان بەکەمتەرخەمی لە ئەنجامدانی کاروباریان و قۆپیەکردن لە تاقیکردنەوەکان و بووژاندنەوەی دژایەتی، ئەوە بەمامۆستایەکی شکست خواردوو دادەنرێت. پێویستە لەسەر کاربەدەستان چاوێکی پێدا بخشێننەوە تا چالاکتر و بەرچاوڕوونتری بکەن لەپێناو ئەو مەبەست و ئاواتانەی کۆمەڵگا لەسەر ئەو وەستاوە وەك چۆن ئەو مامۆستایەی کە هەوڵێکی گونجاو و بەردەوام دەدات لە پێناو بنیاتنانی کەسایەتیی قوتابی و ڕێکخستنی باری دەروونی سەرکەوتوو دەبێت و بەرهەمی باشتر دەبێت، ئەوەندەی کە پەیوەستە بە ئاستی زانستیی قوتابییەوە. پەروەردەی دەروونی قوتابی و ئەوانەی لە قوتابخانەدا کار دەکەن پێوەرێکی ڕاستە بۆ توانای بەڕێوەبەرایەتی لە گەیاندنی پەیامەکەیدا، بەرپرسیاریەتی مامۆستا بەشێکە لە بەرپرسیاریەتی بەڕێوەبەرایەتی دواتر بەشێکە لە هەموو، هەندێك وای بۆ دەچن کە لێپرسینەوە یان ڕێزگرتن لە بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکان لەسەر دەرئەنجامی تاقیکردنەوەکان گونجاوترین پێوەر و باشترین ڕێگە چارەیە بۆ هەڵسەنگاندنی بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکان ، ئەم بۆچوونە بەشێك لەو ڕاستییە ڕوون دەکاتەوە نەك هەموو ڕاستییەکە چونکە ئاستی زانستی مەبەستێکی گرنگە ناکرێ بە کەم سەیر بکرێ و وازی لێبهێنرێ، چونکە هەرگەلێك بیەوێ پێگەیەك بۆخۆی لەناو گەلاندا دیاری بکات پێویستە پێگەی زانستیی خۆی بەهێز بکات چونکە پێگەی زانستی وەك لووتکەیەکی بەرز وایە لەنێوان گرد و تەپۆڵکەکاندا، بەلام ئەم

مەبەستە گەورەیە نابێ لەسەر حسابی مەبەستەکانی تر بێت، چونکە ئەوکاتە بەشێوەیەکی دروست بەرجەستە نابێت مەگەر بەهاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ مەبەستەکانی تری پەروەردە وەك مەبەستی مرۆیی، نەتەوەیی، ئەقڵی، جەستەیی، کۆمەڵایەتی، پیشەیی ...هتد ( المعروف ١٩٨٦، ص١٣٧).

بەرپرسیاریەتی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە لە بواری تەندروستی دەروونی بەشێوەیەکی ئاشکرا دەردەکەوێت لە میانەی چاوخشاندن بە هەندێ لەو مەبەستە پەروەردەییانە کە ساڵی ١٩٨٦ لە عیراق بڕیاریان لەسەر درا، وەك:

أ- وا لە قوتابی بکرێت سەربەخۆیی خۆی بەدەست بێنێ و دڵنیابێ لەخۆی، ئەوەش بە پتەوکردنی متمانە بە خود و توانایی هەستکردن و پابەندبوونی بەرپرسیاریەتی، لەڕێی چڕوپڕکردنی چالاکییەکانی قوتابخانە و کۆمەڵگا.

ب- وا لە قوتابی بکرێت لەکاتی هەڵچووندا خۆڕاگر بێ، ئەمەش بەدابینکردنی ڕۆشنبیری دەروونی و خزمەتگوزاری.

ج- وا لە قوتابی بکرێت بتوانێت پێداویستییەکانی سەرکەوتن دەستەبەر بکات و هەست بە ڕازیبوون لەخود بکات، بەهۆی جۆراوجۆرکردنی مۆڵەتە زانستی و ئەکادیمی و پیشەیی و چالاکییە هونەرییەکان، ئەمەش بەدڵنیاکردنەوە لە بنەمایی بەئاگابوون لە جیاوازییەکانی نێوان تاکەکان.

د- مومارەسەکردنی شێوازەکانی بیرکردنەوەی زانستی بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە لە قوتابخانە ڕۆژانە ڕووبەڕووی قوتابیان دەبنەوە. دیاریکردنی ئەم مەبەستانە بەو شێوازە ڕوونە ئاماژەیە بۆ وابەستەیی تەندروستی دەروونی لەگەڵ مەبەستەکانی تر، بەو پێیەی ئەم تەندروستییە پێوەری سەرکەوتنی بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکانە لە کارەکانیان، تەندروستی دەروونی قوتابیان پێوەرە بۆ دروستیی میتۆدەکانی قوتابخانەکان، مەبەست لە میتۆد لەچوارچێوە گشتییەکەی، بریتییە لە یەکەکانی بابەتەکانی خوێندن و پەرتووکەکانی قوتابخانەکان و هۆکارە زانستییەکان و هەموو ئەو چالاکی و جموجۆڵانەی کە قوتابخانە بەهۆیانەوە مەبەستە سەرەکی و گشتییەکانی خۆی دەستەبەر دەکات، تەوەری ئەو مەبەستە سەرەکییانەی کە میتۆدەکان هەوڵی بەرجەستەکردنیان دەدەن بریتییە لە مرۆڤ، ئەو مرۆڤەی کە کۆمەڵگە بنیاد دەنێن، خۆ ئەگەر

میتۆدەکان نەتوانن تەندروستی دەروونی بۆ قوتابیان فەراهەم بکەن، میتۆدی شکست خواردوون و پێویستە چاویان پیا بخشێندرێتەوە (حسن ۱۹۷۳، ص۲۱۳).

هەر برگەیەك یان کارڕایەك لە کاراییەکانی پرۆگرامی خوێندن ڕەنگدانەوەیەکی دەبێت لەسەر پەیوەندیی قوتابی لەگەڵ خودی خۆی و هاوڕێ و خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگە فراوانەکەیدا لە ئێستا و داهاتوودا، ئەگەر ڕەنگدانەوەی پۆزەتیڤ زیاتر بوو لە نێگەتیڤ، ئەوا ئارامی دەروونیی قوتابی بەردەوام دەبێت لەلایەنی ئەقڵی و ویژدانی و کۆمەڵایەتی، بەڵام ئەگەر ڕەنگدانەوەکان نێگەتیڤ بن ئەوا دۆخەکە پێچەوانە دەبێتەوە، بەجۆرێك ژیانی هەریەك لە تاك و قوتابخانە تووشی جۆرێك لە شڵەژان دەبێت، ئەم شڵەژانەش قووڵ دەبێتەوە بەڕادەیەك لە نەخۆشی دەروونیدا بەدەردەکەوێ و هەڵسوکەوتی نالەباری لێدەکەوێتەوە کە دەبێتە هۆی جێبەجێنەبوونی مەبەستە پەروەردەییەکان لەسەر ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵگا ( الآلوسي ۱۹۹۰، ص۲٦۳).

قوتابخانە لە دەستەبەرکردنی تەندروستی دەروونیدا هەندێك مەبەستی هەیە لەوانەش هەست بەئەرکیان بکەن بەرامبەر گەل و نیشتیمان وەك بەرپرسیاریەتییەکی سەرەکی"هەستکردنی تاك بەئەرکی نەتەوایەتی پەیوەستە بە هەموو ئەو ئەرکانەی ترەوە کە تاك بۆ خۆی دەیانکات، یان بۆ خێزانەکەی کە دەزگایەکی کۆمەڵایەتی بچووکە و بۆ کۆمەڵگە و وڵاتەکەی کە ئەویش و خێزانەکەشی لەخۆ دەگرێ و ئاسوودەی هەمووان هیچ کات نایەتە دی، ئەگەر لە وڵاتێکی ئاسوودە و کۆمەڵگەیەکی ئارامدا نەبن، هەرکەس —بەتایبەتی قوتابی— ئەگەر هەست بەم ڕاستییانە نەکات واتای ئەوەیە هەستی بەو لایەن و بنەمایانە نەکردووە کە هەریەك لە تەندروستی دەروونی و سەلامەتی کیانی کەسی پشتیان پێدەبەستن. بەتوانابن لە چارەسەرکردنی کێشەکان و بڕیارەکانی ژیاندا و دوور بکەونەوە لە دەرئەنجامە خراپەکانیان (الآلوسی ۱۹۹۰، ص۸۳).

**باسی دووەم/ نەخۆشییە دەروونییەکان و جۆرەکانی:**

**یەکەم/ جیاوازی نێوان نەخۆشی دەروونی و نەخۆشی ئەقڵی:**

زانستی دەروونزانی باس لە نەخۆشییەکانی دەروونی عەقڵی لە شێوەی دابەشکردن و ریزبەندی جۆراوجۆر دەکات، ئەو نەخۆشییانەش یان بەشێوەی نەخۆشییەکی دەروونی _ دەماری دەبێ، یان بەشێوەی ئەقڵی نەخۆشی دەروونین. لادانی دەروونی نەخۆشییەکی وەزیفییە بەبێ هیچ کەموکوڕییەك لە پێکهاتەی مێشکدا ڕوودەدا، هەروەها لە دەرئەنجامی نەخۆشی لاشەیی بەرهەم نایەت پشت بەهیچ بنەمایەکی شیکاری دیاریکراو نابەستێ بۆنموونە: ڕەشبینی، دڵەڕاوکێ، واقوڕمان، لاوازبوونی دەمارەکان، دارمانی دەروونی، ترسەکانی نەخۆش، هستریا، بارۆنیا،...تد، نەخۆشی دەروونی لە نەخۆشی ئەقڵی بە چەند شتێك جیا دەکرێتەوە، کەسی تووشبوو بەنەخۆشی دەروونی نەخۆشییەکەی خۆی دەزانێ هەروەها چاك ئاگاداری ڕەفتار و چالاکییەکانی خودی خۆی و کۆمەڵگاکەیەتی، هەندێ لە جۆرەکانی شێتی نەخۆشەکە دەڵێ من گوێبیستی دەنگێك دەبم یاخود کەسێك دەبینم لە دوورەوە بەلایەوە دێ، هەر ئەم ئامادەگی و وەلامدانەوە ئەو پرسیارە وەهمییە یاخود قسە لەگەڵ ئەم دەنگەیە دەکات کە هەر بوونی نییە هەروەها ئامادەی پێشوازیکردن یاخود هێرشکردنی ئەو کەسەیە کە بەرامبەری دێ یاخود پەنجەکانی ڕێك ئەو حاڵەتەیە کە لە سەگ دەترسێ یاخود لە شوێنی بەرز یاخود تاریکە یان ئاو.(ریشاوی ١٩٨٦، ل٢٦).

نەخۆشی دەروونی پێچەوانەی نەخۆشی ئەقڵییە ئەو درککردن و زانینی هەیە، ئەو کەسەی کە وابزانێ دەرگای ژوورەکەی خۆی کلیل نەداوە دەگەڕێتەوە بۆ کلیلدانی، زۆر جار ئەم ڕەفتارە بەشێوەیەکی بەردەوام دووبارە دەبێتەوە، ئەمەیان کەسی تووشبوو بەنەخۆشی دەروونییە کە چاك هۆش و ڕەفتاری خۆی دەزانێ، بەلام ناتوانێ خۆی لەم حاڵەتە ڕزگار بکات ( الرفاعی١٩٨٧، ص٤٢). هەمان قسەش بۆ ئەوانە ڕاستە کە شوێنی ماڵی خۆیان بزر دەکەن لەگەڵ دروستی ئەقڵیان بەهۆی بوونی ململانێیەکی ناوخۆیی لەنێوان خۆی و ژینگەکەی یان کاری کۆمەلایەتی (ماڵ)، یاخود ئەو شتەی کە لەناویەتی یاخود تیایدا دەنوێنێت بەو مانایەی کە لەبیرکردنی ماڵ ئارەزوویەکی شاراوەیە بۆ لەبیرکردنی ئەو شتەی

دەبنە هۆکاری ماڵەکەی لە شەڕو ئاژاوە ناخۆشی و دووبەرەکی، نەخۆشییە دەروونییەکان وەك نەخۆشییەکانی جەستەیی دەکەوێتە بەر پارێزگاریکردن، یاساکان و چارەسەری، لە دواییدا زیاتر لە چارەسەرێك بۆ نەخۆشییە ئەقڵییەکان دۆزرایەوە، کۆمەڵگا هاوچەرخەکان زیاتر لە کۆمەڵگا کۆنەکان دوچاری ئەم نەخۆشییە دەبنەوە چونکە کۆمەڵگای ئەمڕۆ لەسەر کێبڕکێ و ململانێ و ماندووبوون حەزکردن بەکۆنترۆڵ و دەستەبەرکردنی شتەکان دەکات، ئەمڕۆ چەرخی نائارامی و ترس و دڵەڕاوکێ خەمۆکی و لاوازبوون واعزی ئایینییە هەروەها داڕمانی بەها و داب و نەریت و ئاکاری کۆمەڵایەتییە ( الزراد١٩٨٤، ص٩٤).

**دووەم/ جۆرەکانی نەخۆشی دەروونی:**

ژمارەیەکی زۆر نەخۆشی دەروونی جۆراوجۆر هەیە لەوانە دڵەڕاوکێ، دڵتەنگی، نائارامی، ترسی زۆر، لەبیرچوون، شەونخوونی، کەم خەوی، گێژی، وڕێنە، ناتەواوی لە قسەکردن، زۆرخەوتن، ڕێکردن لە کاتی خەوتن، قسەکردن لەکاتی خەوتن، میزکردنی نەخوازراو. لێرەدا هەندێ جۆری نەخۆشی دەروونی دەخەینەڕوو:

- **وەسواسی:** بریتییە لە نەخۆشییەکی دەروونی ڕەفتاری، ئەم نەخۆشە وای لێدەکات ئەو کەسە ئارەزوویەکی زۆری هەبێت بۆ کۆنترۆڵکردنی دەوروبەرەکەی، هەروەها هەندێ بیروبۆچوونی دووبارە بووەوەی هەیە کە کەسەکە خۆی حەزیشی لێناکات، بەڵام زاڵبوونە بەسەر دەروونیدا، زۆرجاریش هەوڵدەدات زاڵ بێ بەسەریاندا خۆی لێیان دوور بخاتەوە، کەسی نەخۆش بەچاکیش دەزانێت ئەم بیرو بۆچوونانە بیرو بۆچوونی خۆیین، کەسی تووشبوو بەم نەخۆشییە هەندێ ئیشوکار ئەنجام دەدات کە بەزۆرەملێ لەلایەن دەروونییەوە فرمانی پێدەدرێ، کەچی ناتوانێ ئەو ئیشانە ئەنجام نەدات چونکە بەئەنجامدانیان دڵەڕاوکێی کەم دەکاتەوە.ئەم دڵەڕاوکێیە بۆماوەیەکی کەم سووك دەبێ لەسەر دەروونی دوای ئەنجامدانی ئیشەکە دواتر دەگەڕێتەوە و وا لەنەخۆشەکە دەکات کە ئەو ئیشە بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر ئەنجام بدات و لەئەنجامدا دەبێتە هۆی لەدەستچوونی کاتەکەی و تووشی زیانی ماددی و مەعنەوی دەبێت، هەندێ جاریش هەندێ ئیشوکاری زۆرەملێ زیانی جەستەیی لێدەکەوێتەوە وەك شوشتنی هەندێك شوێنی

دیاریکراوی جەستە، ئەگەر ئەو شوشتنە بەماددەی کیمیاوی بێت (قەرەچەتانی ١٩٩٩، ل٢٦-٢٧).

- **شیزۆفرینیا:** ڕێژەی ١٪ی خەڵك تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن بەهەردوو ڕەگەزی نێر و مێ بێ جیاوازی، تووشبوو بەم نەخۆشییە بیروبۆچوونی لەبارەی واقعی ژیان دەگۆڕێ و توانایی پەیوەندیکردنی کۆمەڵایەتی نامێنێ. تائێستا هۆی ئەم نەخۆشییە ڕوون نییە،بەڵام زانایان لەو باوەڕەدان کە هۆکارە بۆماوەییەکان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە پەیدابوونی ئەم بارە.هەروەها لەوانەیە بەهۆی بارودۆخی ژیانی نالەبارەوە وەك مردنی کەسێکی خۆشەویست ببێتە هۆی پەیدابوونی شیزۆفرینیا لەلای ئەوانەی کە ئەم ئامادەباشییە بۆماوەییەیان تێدا هەیە. هەندێ دەرمان هەن بۆ چارەسەرکردنی وەك دەرمانی ئارەزوو ورووژێنکەر. شیزۆفرینیا بەزۆری لەپیاواندا لەماوەی نێوان کۆتایی قۆناغی هەرزەکاری و سەرەتای بیستەکانی تەمەندا ڕوودەدات. نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە بەرەبەرە لەماوەی چەند مانگێکدا دەردەکەون، لەوانەشە لەهەندێ کەسدا بەکتوپڕی بەبێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەك دەرکەون. نیشانە هەرە ناسراوەکانی ئەم نەخۆشییە بریتین لە: بیستنی دەنگی وەهمی، باوەڕهێنان بەبیروباوەڕی نالۆژیکی، گۆشەگیری، هەڵچوون، قسەکردن بەشێوەیەکی داپچڕاو، لەدەستدانی ژیری، کاردانەوەی سۆزی نابەجێ. زۆرجار هەندێ لەم نیشانانە وەك بیستنی دەنگەکان پەیوەندییان بە بیروباوەڕی خودی نەخۆشەکەوە هەیە (مغاریوس ١٩٧٤، ص٥٧).

- **تێکشکان:** مرۆڤ لەژیانی خۆیدا هەموو هەوڵ و کۆششێکی دەخاتە گەڕ بۆ دەستەبەرکردنی ئامانج و ئاواتە جۆربەجۆرەکانی، جا هەندێ لەو ئامانجانە نزیکن و هەندێکی تریش درێژخایەنن و دەستەبەرکردنیشی ئەرك و ماندووبوونێکی زۆری دەوێ. ئەو ئامانجانە هەندێکیان هاندەری مرۆڤن بۆ ڕەفتار و چالاکییەکانیان و پەیوەندییەکی بەستنەوەی ڕاستەوخۆی هەیە بە شێوازی ژیان لە کۆمەڵگەدا، هەروەها پەیوەستیشە بە زیرەکی ئەم تاکە و ئاواتەکانی جۆری کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکان و شارەزایی خۆی لەماوەی پێشووی ژیانیدا. مرۆڤ کاتێك زۆر لە ئامانجەکانی دێنەدی هەست بەئارامی و دڵنیاییەکی زۆر دەکات و تاموچێژێکی زۆر لە ژیانیدا دەنۆشێ، بەڵام ئەگەر ئامانجەکانی نەهاتنەدی کە بۆخۆی وێنای

کردووە ئەوا تووشی بێزاری و دڵتوندی و نائارامی و پەشۆکاوی دەکات. جا ئەم پەشۆکاوییە بەسروشت خۆی بەچۆنیەتی پەیوەستبوونی ئەم مرۆڤە بە هێنانەدی ئامانجەکان و کاریگەری لەسەر ڕێڕەوی ژیانی دەگۆڕێ، لەژیانی ڕۆژانەماندا ڕووبەڕووی چەندین کێشە دەبینەوە زۆر جار دەتوانین چارەسەری بۆ بدۆزینەوە یاخود ئاڵتەرناتیڤێکی تر دەستەبەر بکەین، یان هەر دەستبەرداری بین (قەرەچەتانی٢٠٠٧، ل١٦٧).

- **ململانێ**: ململانێی دەروونی بریتییە لەو ململانێیەی کە ئەو مرۆڤە سەرسام و حەیران ماوە لەنێوان دوو هێزی جیا کە لە دوو ئاراستەی دژیەك کاردەکەن، دەرئەنجامی ئەم ململانێیە بە سروشتی حاڵ یەکێك بەسەر ئەویتر زاڵدەبێ ئەوکات جووڵەی مرۆڤیش بەسەر لایەنی زلهێزەکە دەبێ و دوودڵییەکەش یەکلایی دەبێ و هاوسەنگییەکەش دەکەوێتە کار بەڵام ئەگەر هەردوو ئەم هێزە یەکسان بوون ئەوا مانای دەستەوسانی مرۆڤە لەجووڵەکردن بەرەو یەکێك لە ئاڕاستەکان، کە زۆر جاریش تووشی پاڵەپەستۆیەکی زۆر دەبێ و دەبێتە هۆی شەکەتبوون و دڵەڕاوکێیەکی توند. لەژیانی ڕۆژانەماندا ڕووبەڕووی زۆرێك لەو ململانێیەی جۆری یەکەم دەبینەوە بۆنموونە قوتابی تاقیکردنەوەی هەیە لەهەمان کاتدا ئارەزووی بینینی یارییەکی گرنگی تۆپی پێی هەیە دواتر قوتابییەکە بەسەیری تۆپی پێیەکە یەکلایی دەکاتەوە و خوێندنەکەشی بۆ کاتێکی تر دوادەخا (عوض ١٩٨٨، ص٢٢٢).

کاتێك مرۆڤ ڕووبەڕووی دوو هێزی هەستیاری وەك یەك بووەوە کە کاریگەریی ڕاستەوخۆی بەسەر ژیان و چارەنووس بووە ئەوا یەکلاکردنەوەی شتێکی ئەستەم دەبێ و تووشی ململانێیەکی درێژخایەن دەبێ، زۆرجار ئاکامی داتەپینی ژیانی سایکۆلۆژی لێدەکەوێتەوە بە کاریگەریی ئەو ململانێیە درێژخایەنانەی کە هیچ چارەسەرێکی بۆنییە و هەندێك جاریش ئەم نەخۆشییە بە تەقینی دەمارەکانی خوێن یان بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، بەستنی دەمارەکان و قورحەی گەدە یاخود حاڵەتی مردنی لەناکاو کۆتایی پێدێ. ئەمەش مانای یەکسانبوونی ئاکامی ململانێی دەروونی ناگەیەنێ بەڵکو لە تاکێك بۆ تاکێکی تر جیاوازی بەخۆیەوە دەبینێ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی

ئامادەکردنی ئـەو کەسـە و شـارەزایی و تەحـەمولکردنی بەرەنگاربوونـەوەی ئـەم نەخۆشییە (ارجایل ۱۹۸۲ ، ص۱۲۸).

گـرنگترین شـت کـە کەسـی تووشـبوو بـە نەخۆشـی دەروونـی بناسـرێتەوە نەگونجانیەتی لەگەڵ ئـەو ژینگەیـەی تیایـدا دەژیـت، ئـەو نـاتوانێ لەگـەڵ واقیعـە کۆمەڵایەتییەکـەی کـە لـە دەوروبـەردا واقیعـی خۆیـەتی ژیـان بباتەسـەر،ئەم ململانێیـە هەڵچـوونییە لـەنێوان خـۆی و واقیعەکـەی هۆکـاری تووشـبوونیەتی بـە نەخۆشی دەروونـی، لێـرەدا مانـدووبوون و ئـێش و ئـازار و نـەگونجان و ململانێـی نەخۆشەکە لەگەڵ کۆمەڵگا بەشێنەیی دەردەکەوێ. دەرئـەنجامی ئەمـەش هـەوڵی ڕێگە چارەسەرێك بۆ خۆدەربازبوون لە گێژاوە و هەوڵدان بۆ خـۆ گونجاندنـە، لـەم کاتەدا چەند هەوڵێکی خۆگونجاندنی نەخۆشەکە بەرجەسـتە دەبێـت لـە خـەوتن و گەڕانەوە بۆ منداڵیەتی و ڕاکردن لە واقیع چەند چارەسەرێکی سلبیی لەم جۆرەدا (مغاریوس ۱۹۷٤، ص٤٤-٤٥).

**باسی سێیەم/ تەندروستی دەروونی:**

لـە ژیـانی ڕۆژانەمانـدا کەسـانی زۆر دەبیـنین خـەم و پەشـۆکاوی سـەرتاپای ژیانیانی داپۆشیوە، هەردەم توانج و ڕەخنەی خۆیان لە واقیـع و قـەدەر دەدەن و توانـای ڕووبەڕووبونەوەشـیان کەمـە یـاخود هـەر نییـە، لەهـەمان کاتـدا کەسـانێك دەبینین کە هەمیشە بەدەم ژیانەوە پێدەکەنن و دەموچاوێکی گەشبینیان هەیـە و خەنـدە و قسـەی نەسـتەق و هیـوا و ئـاوات هـەموو ژیانیـانی داپۆشـیوە، لێـرەدا دەتوانین وێنای تەندروستی سایکۆلۆژی بەشێوەیەکی ڕێژەیی بکەین کە هەرتاکێك بە پلەیەك لە پلەکان چێژ لەم تەندروستییە وەردەگرێت و دەتوانین چـەمکی مـرۆڤ لێـرەدا بـەم جـۆرە پێناسـە بکـەین کـە پلـەی سـەرکەوتووی تـاك لـە توانـایی تەوافوقکردنی ناوەوەی خۆی لەنێوان حەز و ئارەزوو و خواستە جۆراوجۆرەکانیان هەروەها لەگەڵ تەوافوقکردنی پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ ئـەو ژینگەیـەی کـە تێیـدا گوزەر دەکات لە خەڵك و پێشهات و ڕووداوەکان و...هتد.

ئـەو تاکـەی ئەگـەر سـەرکەوتوو نـەبوو لـە مامەڵەکردنیـدا لـە کۆمەڵگایـەك لەوانەیە سەرکەوتوو بێت لە کرمەڵگایەکی تر ، مامەڵـەکردن لەگـەڵ خـەڵکی (دێ) جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ خەڵکی شار ، بۆیە پسپۆری دەروونزانی کاتێك بیـەوێ

حوکم بدات دەبێ شارەزاییەکی تەواوی هەبێت لە ژینگەی کەسەکان و ئاشنای دابونەریت و پێداویست و هۆکارەکانی ژیانی ئەو جێگایە بێت، هەروەها خوێندنەوەیەکی چاکیشی هەبێت بۆ جیاکردنەوەی ئەو جیاوازییە تاکییانە کە لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی تر گۆڕانکاری بەسەردا دێت، بۆیە ئەم هۆکارانە کە پزیشکی دەروونزانی بەکاری دێنێ دیمانەی کلینیکە ، هەروەها تاقیکردنەوەی هەڵوێست و زیرەکی و چۆنیەتی مامەڵەکردن و قسەکردنی ئەم کەسەیە، ئەم جۆرە ڕێگایانە بەشێکی گرنگ پێکدێنێ لە زانستی دەروونی کلینیکی (فهمی ١٩٧٦، ص١٦٣).

هەندێ نیشانە و ئاماژە هەیە یارمەتیدەرە بۆ درککردن بەتەندروستی سایکۆلۆژی (مغاریوس ١٩٧٤، ص٧٠-٧):

١- تەقەبولکردنی تاك بۆ سنووری توانا و ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی: ئەوانەی کە توانای لێهاتوویی و شارەزایی خۆیان دەزانن، خەون و هیوا و ئاواتەکانی خۆیان لەو ڕوانگەیەوە وێنا دەکەن، ئەوا ئەم جۆرە خوێندنەوەیە داهاتوویەکی باشیان دەبێ و توانایی بەرەنگاربوونەوە و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئاست و تەگەرەی ژیانیان دەبێ.

٢- تاموچێژ وەرگرتنی تاك لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان: هەندێ کەس توانایەکی بەهێزیان هەیە لە بەستنی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دەوروبەر لەسەر بناغەیەکی خۆشەویستی و هاوڕێیانە کە هەمیشە دڵخۆش دەبێ بە بینینی ئەم جۆرە کەسانە و چێژ لە هاوڕێیەتیان وەردەگرێ دەرئەنجام کەسێکی سەرکەوتووی لێدەردەچێت، بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی کە توانای هاوڕێیەتیان نییە، بەڵکو لە پەیوەندی بەستن لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایەی تیایدا دەژیت ناتوانێ بگوزەرێ دەبێتە هۆی نەوازە و قێزەونبوونی ئەم کەسە لای کەسانی دەوروبەری.

٣- سەرکەوتوویی تاك لە کارەکەی، ئەو کەسەی کە کارێك بە حەز و ئارەزوو و توانا و لێهاتوویی خۆی دەستنیشان دەکات: ئەم جۆرە کەسە زوو سەرکەوتن بەدەست دێنێ و ئیبداعی تیادا دەکات وێڕای هەستکردنی بە دڵنیایی و هەستکردن بە لێپرسراویەتی و ئینتیمابوون بۆ کارەکەی.

٤– بەدەمەوەچوونی تـاك بـۆ ژیـان بەشـێوەیەكی گشـتی: ئەمـەش پێـوەری ڕوانینی تاكە بۆ گەشبین بوون لە ژیاندا زۆرێك لە خەڵكان هەن كە هەمیشە بـەدەم ژیانەوە پێدەكەنن و گەشـبینن و خوێندنـەوەی چـاكیان هەیـە بـۆ ژیـان و توانـای بەرەنگاربوونەوەیان هەیە بە ئەقڵێكی لۆژیكییانە و ئەم جۆرە كەسانە كەسـانێكی سەركەوتوو دەبن هەم لەلایەنی سایكۆلۆژی و هەم لە لایەنەكانی تری ژیانیان.

٥– لێهاتوویی تاك بۆ چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی شـەكەتیی ژیـانی ڕۆژانـە: ئەم خاڵە گرنگییەكی زۆری هەیە و ئەو كەسانەی بە كارامەیی و ژیرییـەوە مامەڵـە لەگــەڵ ئاســتەنگەكان و تەگــەرەكان دەكــەن ، ڕێگەچـارەیەكی گونجـاوی بـۆ دەدۆزنەوە و بێگومان ئەم جۆرە كەسانە لێهاتوو كارا و سەركەوتوون لـە ژیانـدا و ئەمــە بــەپێوەرێكی هــەرە گرنگــی تەندروســتی ســایكۆلۆژی دادەنــرێ كــە توێژینەوەكانی تازە زۆر بایەخی پێدەدەن. (مغاریوس ١٩٧٤، ص٧١).

٦– جێگیربوونی لایەنەكانی تاك: جێگیربـوونی لایەنـەكان و هەڵوێسـتی تـاك بەرامبـەر ڕووداوە گرنگـەكان و بابـەتی ژینگـەی دەرەكـی وا بەئاسـانی نایەتـەوە، مەگەر كەسەكە خاوەنی هێڵی فكرەیەكی دیاریكراو نەبێت و خاوەنی باكگراوندێكی فەلسـەفی تۆكمـە بـێ كـە بڕیـار و هەڵسـوكەوتی تایبـەتی خـۆی دیـاری بكـات. مەبەستمان ئەوەنییـە كـە لایـەنی تـاك دۆگمـایی بـەخۆوە ببینـێ و قـابیلی گـۆڕان نەبێت بـەڵكو زۆر پێویسـتی بەڵگـەی گەشـەكردن و پێشڤەچوونە،وەك ئاشكراشـە جێگیربوونی لایەنی تاك لە تەواوكاری كەسایەتی تاكەكە و فرەلایـەنی ئـەم خـودە ڕەنگدەداتەوە.

٧– هاوســەنگی هەڵچــوونی: تەندروســتی ســایكۆلۆژی بــە جێگیربــوونی هەڵچوونی و پێگەیشتنی لایەنی (من) پێـوەر دەكـرێ هـەروەها لـە تـەوافوقكردنی لەنێوان داواكارییەكانی واقیع و لایەنەكانی خواوەندی و منی باڵا، بە توانای تاك لە تـەوافوقكردن و خۆگونجانـدن لەگـەڵ ئـەو پێویسـتییانەی كـە هەیـەتی تووشـی پێكدادان نەبێ لەگەڵ یەكتر (مغاریوس ١٩٧٤، ص٧٢).

## بەشی سێیەم/ توێژینەوەکانی پێشوو:

**یەکەم/** توێژینەوەی: ایمان عبدالوهاب موسی و باسمة فارس محمد (٢٠٠٥)، بە ناونیشانی (العوامل الاجتماعیة المؤدیة لظهور المرض النفسي"الاکتئاب" نموذجاً) توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە شاری موصل ئەنجام دراوە، ئامانجی توێژینەوەکە دیاریکردنی گرنگترین هۆکارە (کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی)یەکانە کە دەبنە هۆی دروستکردنی تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی و خێزان و کارکردن لە سەرهەڵدانی نەخۆشی خەمۆکی، میتۆدی دراسەی حاڵەت پەیڕەو کراوە و نموونەی توێژینەوەکە ( ١٢) حاڵەتە کە لە نەخۆشخانەی ابن سینا وەگیراوە و کەرەستەی کۆکردنەوەی زانیاری چاوپێکەوتن و تێبینیکردن بەکار هاتووە، توێژینەوەکە بەو ئەنجامە گەیشتووە کە هەموو هۆکارەکانی باری ماددی و هەڵوەشانەوەی خێزان و کەوتن لە خوێندن هەروەها تایبەتمەندیی کار و دەست بەتاڵی و شوێنی دانیشتن و داب و نەریتی کۆمەڵگا و چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ منداڵان کاریگەرییان هەیە لەسەر دروستبوونی ئەو نەخۆشییە (دراسات موصلیة عدد ١٠، ص١٠٧–١٤٠، ئەلیکترۆنی).

**دووەم/** توێژینەوەی: د.عبدالعباس مجید تایە اللامي(٢٠١٠) بەناونیشانی (الضغوط النفسیة لدی طلبة الدراسات المسائیة في الجامعة وبناء برنامج ارشادي مقترح لتخفیضها)، ئامانجی توێژینەوەکە زانینی ئاستی فشاری دەروونی قوتابیانی خوێندنی ئێوارانە لە کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی مستنصریە، و دانانی پرۆگرامێکی ئامۆژگاری (ارشادی) بۆ کەمکردنەوەی ئەم فشارە. کۆمەڵگای توێژینەوەکە قوتابیانی کۆلێژی پەروەردەی ئێوارانی زانکۆی مستنصریەیە کە ڕێژەیان (٣٤٩٥) قوتابییە لە هەردوو ڕەگەز لە بەشەکانی زانستی و مرۆڤایەتی بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠٠٩/٢٠١٠) و نموونەی توێژینەوەکە بریتییە لە (٢٠٠) قوتابی لە هەردوو ڕەگەز کە بەشێوەی هەڕەمەکی چینایەتی وەرگیراوە بەڕێژەی (٦٪). ئەنجامەکانی توێژینەوەکە: تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە ڕووبەڕووی فشاری دەروونی دەبنەوە بەڕێژەی زۆر و ناوەند، بوونی ئەم فشارەش لەلای ڕەگەزی مێ زیاترە، و بەنسبەت گۆڕاوی بژێوی دەلالەتی ئاماری لە بەرژەوەندی ئەوانەدایە کە

کاردەکەن، جیاوازی گۆڕاوی باری کۆمەڵایەتی (سەڵت، خێزاندار) کاریگەری نییە لەسەر ئاستی فشاری دەروونی (اللامي ٢٠١٠. ئەلیکترۆنی).

**سێیەم:** توێژینەوەی: عبدالله بن حميد السهلي (١٤٣١هـ) بە ناونیشانی (اساليب مواجهة الضغوط النفسية لدى الشباب من المرضى المترددين على مستشفى الطب النفسي بالمدينة المنورة وغير المرضى) توێژینەوەکە نامەیەکی دکتۆرایە پێشکەش بە زانکۆی (جامعة أم القرى) کۆلێژی پەروەردە بەشی دەروونزانی کراوە بۆ ساڵی (١٤٣٠/١٤٣١هـ)، ئامانجەکانی توێژینەوەکە زانینی ئاسەوارەکانی نەخۆشییەکانی کەئابەو قەلەقی لە نەخۆشخانەی پزیشکی دەروونی لە شاری مەدینە و بەراوردکردنیان بەو کەسانەی ئاسایین و نەخۆش نین، و زانینی تایبەتمەندییەکانی کەسانی تووشبوو بە نەخۆشی خەمۆکی و چۆنیەتی ڕەفتارکردنیان لەگەڵ پێشهاتەکانی ژیانی ڕۆژانەیان.

میتۆدی وەسفی (سببي المقارن) پەیڕەوکراوەو کۆمەڵگای توێژینەوەکە گشت ئەم لاوانەی کە نەخۆشن (دەروونی) و ئاساییشن واتا نەخۆشی دەروونییان نییە کە تەمەنیان لەنێوان (٢٠ـــــ٣٠) ساڵدایە لە هەردوو ڕەگەز دەگرێتەوە، ڕێژەی نموونەی توێژینەوەکە (٢١٠) کەسە کە دابەش دەبن بۆ دوو کۆمەڵە یەکەمیان نەخۆشەکانن کە ڕێژەیان (١٤٠)ە و دووەمیان ئەوانەن کە ئاسایین و ڕێژەیان (٧٠) کەسە. ئەنجامەکانی توێژینەوەکە: جیاوازی ئاستی دەلالەت لە نێوان هەردوو کۆمەڵەی بەراوردکردن هەیە بە ئاستی (٠.٠٥). و بەهەمان شێوە جیاوازیش لە نێوان ڕەگەزەکان هەیە بۆ نەخۆشی کەئابە و قەلەقی (السهلي ١٤٣١هـ. ئەلیکترۆنی).

## تەوەری دووەم/ لایەنی مەیدانی توێژینەوە:

## بەشی چوارەم/ چوارچێوەی تیۆری كارپاییە مەیدانییەكانی توێژینەوە

**یەكەم/ میتۆدی توێژینەوەكە:** لەم توێژینەوەیە میتۆدی **ڕووپێوی كۆمەڵایەتی** (social survery method) بەكار هاتووە كە ڕێگایەكە لە ڕێگاكانی توێژینەوەی كۆمەڵایەتی ، وە هاریسۆن (Harrison) دەڵێ بریتییە لە هێزی هاوكاری و بنەمای ڕێگای توێژینەوە و چارەسەركردنی كێشە كۆمەڵایەتییەكان لە چوارچێوەی سنوورێكی جوگرافی دیاریكراو، وە گیدینز (Giddings) دەڵێ ڕووپێوی كۆمەڵایەتی بەواتای پشكنینی گشتی بۆ كۆمەڵێك لە كۆمەڵەكان (الحسن و الحسین، ١٩٨١، ص١٥٦).

**دووەم/ كۆمەڵگا و نموونەی توێژینەوەكە:**

كۆمەڵگای توێژینەوە: گشت قوتابیانی پۆلی یانزەمی ئامادەیی (وێژەیی، زانستی) لە سنووری قەزای سۆران دەگرێتەوە كە ژمارەیان (١٩١٠) قوتابییە كە (٩٥٤)یان نێرن وە(٩٥٦)یان لە ڕەگەزی مێن و دابەش دەبن بەسەر (٢٤) قوتابخانە.

نموونەی توێژینەوە: لەم توێژینەوەیە نموونەی هەڕەمەكی سادە بەكار هاتووە، قەبارەی نموونەی توێژینەوەش (١٦٠) قوتابییە كە لە (٢٤) قوتابخانەی ئامادەیی چوار قوتابخانە (ئا. بناری هەندرێنی كوڕان/ زانستی، ئا. ئەستێرەی كچان/زانستی، ئا. شەهید د. عبدالرحمانی كوران/وێژەیی، ئا. دیلمانی كچان/ وێژەیی) بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠١٤-٢٠١٥ز) بەشێوەی هەڕەمەكی لە سەنتەری شار هەڵبژاردراون و لەو چوار قوتابخانەیەش (١٦٠) قوتابی وەرگیراوە بەڕێژەی (٨٪) لە پۆلی یانزەمی ئامادەیی (وێژەیی و زانستی) لە هەردوو ڕەگەز بەشێوەی هەڕەمەكیی سادە.

**سێیەم/ سنووری توێژینەوەكە:** توێژینەوەكە لەسەر قوتابیانی پۆلی (١١) ئامادەیی قەزای سۆران لەساڵی خوێندنی ٢٠١٤/٢٠١٥ ئەنجامدراوە.

**چوارەم/ بوارەكانی توێژینەوەكە:**

١- بواری مرۆیی: قوتابیانی پۆلی یانزەمی ئامادەیی (زانستی و وێژەیی) قوتابخانەكانی سنووری قەزای سۆران دەگرێتەوە.

٢ـ بواری شوێنی: قوتابخانە ئامادەییەکانی (ئا.بناری هەندرێنی کوڕان/ زانستی، ئا. ئەستێرەی کچان/ زانستی، ئا. شەهید د.عبدالرحمانی کوڕان/ وێژەیی، ئا. دیلمانی کچان/ وێژەیی) بۆ ساڵی خوێندنی ( ٢٠١٤ – ٢٠١٥ز)ی قەزای سۆران دەگرێتەوە.

٣– بواری کاتی: تێکڕای ئەو ماوە دەگرێتەوە کە لایەنی مەیدانی توێژینەوەکە خایاندوویەتی لە ٢٠١٤/١٢/١٠ هەتا ٢٠١٥/١/١٠ .

**پێنجەم/ ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری و کەرەستە ئامارییە بەکارهاتووەکان:**

١– ئامرازی کۆکردنەوەی زانیاری: لەم توێژینەوەیە بۆ کۆکردنەوەی داتا فۆرمی ڕاپرسی بەکارهاتووە تیادا فۆرمێکە (٢٢) پرسیار لەخۆ دەگرێت، جێگیرکردنی ئەم پرسیارانە دەرئەنجامی گەڕانی توێژەر بە نێو توێژینەوەکانی پێشوو سەرچاوەکانی تایبەت بەم بوارە و ڕاوێژ کردن بووە بە کەسانی شارەزا.

٢– ئامرازی ئاماری بەکارهاتوو بریتییە لەڕێژەی سەدی (٪)

$$٪ = \frac{\text{بەش}}{\text{کۆی گشتی}} \times ١٠٠$$

**بەشی پێنجەم/ خستنەڕوو شیکردنەوەی زانیارییەکان:**

١– ڕەگەز: خشتەی (١)

| ڕەگەز | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| نێر | ٨٠ | ٪٥٠ |
| مێ | ٨٠ | ٪٥٠ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

خشتەی (١) پێکهاتەی نموونەی توێژینەوەکە لە ڕووی ڕەگەزەوە دەردەخات کە ڕێژەی (٪٥٠) لە ڕەگەزی نێرن وە هەمان ڕێژەش بۆ ڕەگەزی مێ نموونەی توێژینەوە پێکدەهێنن.

٢- باری دارایی خشتەی (٢)

| باری دارایی | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| خراپ | ١٠ | ٦,٣٪ |
| ناوەند | ١٠٩ | ٦٨,١٪ |
| باش | ٤١ | ٢٥,٦٪ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ١٠٠٪ |

لە خشتەی (٢) دا دەردەکەوێت ڕێژەی (٦٨,١٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە باری داراییان لە ئاستێکی ناوەندایە وە ڕێژەی (٢٥,٦٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە باری داراییان باشە و ڕێژەی (٦,٣٪) تاکەکانیش باری داراییان خراپە.

٣- بوونی دایك و باوك لە ناو خێزاندا:

خشتەی (٣): لەگەڵ کێ دەژیت؟

| لەگەڵ کێ دەژیت | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| دایك | ١٣ | ٨,٢٪ |
| باوك | ٢ | ١,٢٪ |
| دایك و باوك | ١٤١ | ٨٨,١٪ |
| کەسی تر | ٤ | ٢,٥٪ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ١٠٠٪ |

دایك و باوك دوو ڕەگەزی سەرەکین لە ناو خێزان و کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان لەسەر بەڕێوەبردنی خێزان و پەروەردەکردنی منداڵ هەیە، لەم خشتەیە دەردەکەوێت زۆربەی تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەڕێژەی (٨٨,١٪) لەگەڵ دایك و باوکیاندا دەژین، و ڕێژەی (٨,٢٪) تەنیا لەگەڵ دایکیان دەژین، و ڕێژەی (٢,٥٪) یەکەکانی نموونەی توێژینەوە لەگەڵ کەسی تر دەژین واتا لەگەڵ دایك و باوکیان ناژین و ڕێژەی (١,٢٪) یەکەکانی نموونەی توێژینەوە لەگەڵ باوکیان دەژین.

خشتەی (٤)

باری دەروونی خۆت لە کام لەم حاڵەتانەی خوارەوە دەبینیتەوە؟

| حاڵەتی دەروونی | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| گەشبین | ٣٧ | ٪٢٣,٣ |
| غەمبار | ١٩ | ٪١٢ |
| دڵەڕاوکێ | ٣١ | ٪١٩,٥ |
| ئاسایی | ٦٥ | ٪٤٠,٨ |
| ڕەشبین | ٧ | ٪٤,٤ |
| کۆی گشتی | ١٥٩ | ٪١٠٠ |

هیچ کەسێك هێندەی خودی خۆی شارەزا نییە لە دونیای ناوەوەی خۆی بۆیە لێرە پرسیارێك ئاڕاستەی تاکەکانی نموونەی توێژینەوە کراوە خۆیان باری دەروونیی خۆیان هەڵبسەنگێنن، لە خشتەی (٤) ئەوە دەردەکەوێت کە ڕێژەی (٪٤٠,٨) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە باری دەروونییان ئاساییە، ڕێژەی (٪٢٣,٣) یان باری دەروونییان گەشبینە، ڕێژەی (٪١٩,٥) باری دەروونیان لە حاڵەتی دڵەڕاوکێیە، ڕێژەی (٪١٢) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە غەمبارن و ڕێژەی (٪٤,٤) شیان ڕەشبینن، هەرسێ حاڵەتی (غەمبار و دڵەڕاوکێ و ڕەشبین) بە نەخۆشی دەروونی دادەنرێن کە ڕێژەی (٪٣٦,٦) کۆی گشتی حاڵەتی دەروونی نموونەی توێژینەوە پێکدەهێنێت.

خشتەی (٥)

بۆ بڕیاردان لەسەر پێشهاتەکانی ژیانی ڕۆژانەت پشت بە کێ دەبەستیت؟

| پشت بە کێ دەبەستیت | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| تەنیا خۆم | ٨٤ | ٪٥٢,٨ |
| ماڵەوە | ٥١ | ٪٣٢,١ |
| هاوڕێکان | ٢١ | ٪١٣,٢ |
| مامۆستا | ٣ | ٪١,٩ |
| کۆی گشتی | ١٥٩ | ٪١٠٠ |

کەسی دەروون نەخۆش توانای بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆی نییە و زۆربەی کات پشت بە کەسانی تر دەبەستێت بۆ بەڕێوەبردن و بڕیاردان لەسەر پێشهاتەکان، خشتەی (٥) ئەوە دەردەخات ڕێژەی (٥٢,٨٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە لە بڕیاردان پشت بە خۆیان دەبەستن، ڕێژەی (٣٢,١٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بۆ بڕیاردان پەیوەستن بە خێزان، ڕێژەی (١٣,٢٪) پشت بە هاوڕێکانیان دەبەستن و ڕێژەی (١,٩٪) بۆ بڕیاردان پشت بە مامۆستا دەبەستن.

تێبینی: فۆرمێکیان ئەم پرسیارەی وەڵام نەدابوویەوە بۆیە کۆی گشتی بریتییە لە (١٥٩) وەڵام.

خشتەی (٦)

ئایا حەز دەکەیت بەردەوام هاوڕێی زیاتر پەیدا بکەیت؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١١٦ | ٧٢,٥٪ |
| نەخێر | ٤٤ | ٢٧,٥٪ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ١٠٠٪ |

بۆ دەرخستنی نیشانەی گۆشەگیری پرسیار لەوە کراوە ئایا حەز دەکەیت بەردەوام پەیوەندیت فراوان بکەیت، لە خشتەی (٦) ئەوە دەردەکەوێت ڕێژەی (٧٢,٥٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە حەزدەکەن پەیوەندییان فراوان بکەن و ڕێژەی (٢٧,٥٪) ی تاکەکانی نموونەی توێژینەوە وەڵامەکانیان بە پێچەوانەوەیە.

خشتەی (٧)

کە لە قوتابخانە دەچیتەوە ماڵ هەست بە چی دەکەیت؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ئاسوودەیی | ١٢١ | ٧٥,٦٪ |
| دڵتەنگی | ١٦ | ١٠٪ |
| نائارامی | ١٥ | ٩,٤٪ |
| هەستێکی ناخۆش | ٨ | ٥٪ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ١٠٠٪ |

لـه خشـته (٧) ئـەوه دەردەکـەوێت ڕێـژەی (٧٥,٦٪) تاکـەکانی نموونـەی توێژینەوه کە له قوتابخانه دەچنەوه ماڵ هەست بە ئاسـوودەیی دەکـەن، ڕێـژەی (١٠٪) هەست بە دڵتەنگی دەکەن و ڕێژەی (٩,٤٪) تاکەکانی نموونـەی توێژینـەوه هەست بە نائارامی دەکـەن و ڕێـژەی (٥٪) تاکـەکانی نموونـەی توێژینـەوەش کـە دەچنەوه مـاڵ هەسـت بـە بیرەوەریـی نـاخۆش دەکـەن، ئـەم ئەنجامانـەش ئـەوه دەردەخات کـە قوتابخانـە نـەیتوانیوه گونجـانی دەروونـی بـۆ قوتابیـان فەراهـەم بکات.

خشتەی (٨)

ئایا کێشەکانی خێزان وای کردووه هەست بە دڵتەنگی و غەمباری بکەیت؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ٥٢ | ٪٣٢,٥ |
| تارادەیەك | ٨٧ | ٪٥٤,٤ |
| نەخێر | ٢١ | ٪١٣,١ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی (٨) دەردەکەوێت ڕێژەی (٥٤,٤٪) تاکەکانی نموونـەی توێژینـەوه تارادەیـەك بـەهۆی کێشـەکانی خێـزان تووشـی دڵتـەنگی بوونەتـەوه ، وه ڕێـژەی (٣٢,٥٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوه بەهۆی کێشەکانی نـاو خێـزان زۆر هەسـت بەدڵتەنگی دەکەن وه ڕێژەی (١٣,١٪)شیان بەهۆی کێشـەی خێزانییـەوه تووشـی دڵتەنگی نەبوونە.

خشتەی (٩)

ئایا مامۆستاکان باسی گرنگیی خوێندنەوه دەکەن؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ٣٣ | ٪٢٠,٦ |
| تارادەیەك | ٧٨ | ٪٤٨,٨ |
| نەخێر | ٤٩ | ٪٣٠,٦ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

لە خشتەی (٩) دەردەکەوێت ڕێژەی (٤٨,٨٪) وەڵامی تاکەکانی نموونەی توێژینەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە مامۆستا تاڕادەیەك باسی گرنگیی خوێندنەوە دەکات و ڕێژەی (٣٠,٦٪) پێیان وایە کە مامۆستا باسی گرنگیی خوێندنەوە ناکات بەڵام ڕێژەی (٢٠,٦٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە پێیان وایە مامۆستا زۆر باسی گرنگیی خوێندنەوەی کتاب و گۆڤارەکان دەکات.

خشتەی (١٠)

لە قۆناغەکانی خوێندن کە تائێستا بڕیوتە ئاسوودە بوویت؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ٥٢ | ٪٣٢,٥ |
| تارادەیەك | ٧٥ | ٪٤٦,٩ |
| نەخێر | ٣٣ | ٪٢٠,٦ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

خشتەی (١٠) باکگراوندی دەروونی قوتابیان بۆ قۆناغەکانی خوێندنی دەردەخات کە ڕێژەی (٤٦,٩٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە تاڕادەیەك هەستیان بە ئاسوودەیی کردووە لەو قۆناغانەی تائێستا بڕیویانە لە قوتابخانە وە ڕێژەی (٣٢,٥٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە زۆر ئاسوودە بوونە لەو قۆناغانەی ڕابردووی خوێندن بەڵام ڕێژەی (٢٠,٦٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە ئاسوودە نەبوونە سەبارەت بە قوتابخانە.

خشتەی (١١)

ئایا ڕەفتاری توندوتیژیی مامۆستاکان

وا بێزاریان کردوویت کە تاقەتی خوێندنت نەمێنێت؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ٥٩ | ٪٣٦,٩ |
| تارادەیەك | ٥٦ | ٪٣٥ |
| نەخێر | ٤٥ | ٪٢٨,١ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

لە خشتەی (١١) بوونی ڕەفتاری توندوتیـژیی لـە قوتابخانـە ڕووندەکاتـەوە دەردەکەوێت ڕێژەی (٣٦,٩٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە ڕەفتاری توندوتیژیی مامۆستاکان بەشێوەیەکی زۆر بێزاریان کردوون کە تاقەتی خوێندنیان نـەمێنێت و ڕێـژەی (٣٥٪) تاکـەکانی نموونـەی توێژینـەوە پێیـان وایـە تاڕادەیـەك ڕەفتـاری توندوتیژی مامۆستاکان وای کـردووە تاقـەتی خوێنـدنیان نـەمێنێت بـەڵام ڕێـژەی (٢٨,١٪)شیان بەپێچەوانەوە ڕایان وایە ئەم ڕەفتارانە وایان نەکردووە بـێ تاقـەت بن لە خوێندن.

خشتەی (١٢)

ئایاحەزدەکەیت ڕۆژانی خوێندن خێرا تەواو بێت؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٥٦ | ٪٣٥ |
| جارجار | ٧٥ | ٪٤٦,٩ |
| نەخێر | ٢٩ | ٪١٨,١ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

خشـتەی (١٢) بێـزاری قوتـابی لـە قوتابخانـە ڕووندەکاتـەوە کـە ڕێـژەی (٤٦,٩٪) وەڵامی تاکەکانی نموونەی توێژینەوە ئاماژەن بۆ ئـەوەی جارجـار حـەز دەکەن خوێندن خێرا تەواو بکەن، وە ڕێژەی (٣٥٪) وەڵامـەکان بـە بەڵێیـە بـەڵام ڕێژەی (١٨,١٪) تاکەکانی نموونەی توێژینـەوە حەزناکـەن ڕۆژانـی خوێنـدن خێـرا تەواو بێت کە ئاماژەیە بۆ ئاسوودەییيان لەگەڵ خوێندن و قوتابخانە.

خشتەی (١٣)

لەکاتی پرسیارکردن لە مامۆستا هەست بە ترس و دڵەڕاوکێ دەکەیت؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٨٨ | ٪٥٥ |
| نەخێر | ٧٢ | ٪٤٥ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

خشتەی (١٣) بوونی ترس و دڵەڕاوکێ لای قوتابیان دەردەخات کـە زۆربـەی تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەڕێـژەی (٥٥٪) لـەکاتی پرسـیارکردن لـە مامۆسـتا

تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دەبنەوە، وە ڕێژەی (٤٥٪)شیان بە پێچەوانەوە هەست بەو حاڵەتە دەروونییە ناکەن.

خشتەی (١٤)

کەسانی دەوروبەرت لەڕووی دەروونییەوە چۆن دەبینی؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| گەشبین | ٧٩ | ٤٩,٤٪ |
| غەمبار | ٣٦ | ٢٢,٥٪ |
| ڕەشبین | ٢٥ | ١٥,٦٪ |
| تێکشکاو | ٢٠ | ١٢,٥٪ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ١٠٠٪ |

خشتەی (١٤) دونیابینیی قوتابی لەلایەنی سایکۆلۆژییەوە دەردەخات کە ڕێژەی (٤٩,٤٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە کەسانی دەوروبەریان بە گەشبین دەبینن بەڵام کۆی وەڵامەکانی تر ئاماژە بە ناتەواوی دەروونی دەکەن بەڕێژەی (٥٠,٦٪) کە بۆ هەریەکە لە حاڵەتی غەمبار ڕێژەی (٢٢,٥٪) و حاڵەتی ڕەشبین ڕێژەی (١٥,٦٪) و حاڵەتی تێکشکاویش (١٢,٥٪)ە، بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی هۆکاری دەروونی بەشێکی کاریگەرە لە دونیابینیی دەرەوەی مرۆڤ.

خشتەی (١٥)

ئایا بەمنداڵی لێدان بەرامبەرت بەکارهاتووە؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ١٩ | ١١,٩٪ |
| جارجار | ٨٠ | ٥٠٪ |
| نەخێر | ٦١ | ٣٨,١٪ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ١٠٠٪ |

لە خشتەی (١٥) ئەوە دەردەکەوێت ڕێژەی (٥٠٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە جارجار لەلایەن خێزانەوە تووشی لێدان بوونەتەوە، وە ڕێژەی (١١,٩٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە زۆر تووشی لێدان بوونەتەوە بەڵام ڕێژەی (٣٨,١٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بە منداڵی لێیان نەدراوە لەلایەن

خێزانــەوە، ئەمــەش ئاماژەیــە بــۆ ئــەوەی پــەروەردەی خێزانــەکانی نموونــەی توێژینەوە ڕەگەزی توندوتیژی لەخۆ دەگرێت.

خشتەی (١٦)

ئایا دایك و باوکت لەبەر چاوت شەڕیان کردووە؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ١٠ | ٪٦,٣ |
| جارجار | ٦٠ | ٪٣٧,٥ |
| نەخێر | ٩٠ | ٪٥٦,٢ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی (١٦) دەردەکەوێت ڕێـژەی (٪٥٦,٢) وەڵامـی تاکـەکانی نموونـەی توێژینەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات دایك و باوکیان لەبەر چاویان شەڕیان نەکردووە، وە ڕێژەی (٪٣٧,٥) دەڵێن جارجار دایك و باوکیان لەبەرچاویان شـەڕیان کـردووە وەڕێـژەی (٪٦,٣)یـش و زۆر ئـەم حاڵەتـەیان بینیوە،کەواتـە ڕێـژەی (٪٤٣,٨)ی وەڵامەکان ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـەن کـە شـەڕی دایـك و باوکیـان بینیـوە ئەمـەش ئاکامێکی خراپ لە نەستی منداڵ جێدەهێڵێت.

خشتەی (١٧)

ئایا حەزت لە کەرەستەیەکی یاریکردن بێت بۆت کڕاوە؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٨٥ | ٪٥٣,٢ |
| تارادەیەك | ٥٠ | ٪٣١,٢ |
| نەخێر | ٢٥ | ٪١٥,٦ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی (١٧) ئەوە دەردەکەوێت کە ڕێژەی (٪٥٣,٢) تاکـەکانی نموونـەی توێژینەوە وەڵامیـان بـە بەڵێیـە بـۆ ئـەوەی کـە حـەزیان لـە کەرەسـتەیەکی یـاری کردبێت بۆیان کراوە و ڕێژەی (٪٣١,٢) دەڵێن تاڕادەیـەك بـەڵام ڕێـژەی (٪١٥,٦) تاکـەکانی نموونـەی توێژینـەوە لـە تەمـەنی منداڵیـدا حـەزیان لـە کەرەسـتەیەکی یاریکردن بێت بۆیان نەکڕاوە،ئەم حاڵەتە لە تەمەنی منداڵیدا گرنگییـەکی تایبـەتی

هەیە بەجۆرێك کاریگەرییەکی نێگەتیڤ دروست دەکات لەسەر باری دەروونی لە قۆناغەکانی دواتریشدا.

خشتەی (١٨)

ئایا دایك و باوکت زیاد لە پێویست گرنگیت پێدەدەن؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ٩١ | ٪٥٦,٩ |
| تارادەیەك | ٤١ | ٪٢٥,٦ |
| نەخێر | ٢٨ | ٪١٧,٥ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی (١٨) بۆمان دەردەکەوێت ڕێژەی (٪٥٦,٩) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە پێیان وایە دایك و باوکیان زیاد لەپێویست گرنگییان پێدەدەن، ڕێژەی (٪٢٥,٦) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە پێیان وایە دایك و باوکیان تاڕادەیەك زیاد لە پێویست گرنگییان پێدەدەن، وە ڕێژەی (٪١٧,٥) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە پێیان وایە دایك و باوکیان زیاد لەپێویست گرنگیان پێنادەن. نازدار پەروەردەکردن یەکێکە لەو هۆکارانەی کاریگەریی نێگەتیڤی هەیە لەسەر کەسایەتی و دروستبوونی نەخۆشی دەروونی.

خشتەی (١٩)

ئایا دایك و باوکت جیاوازی لەنێوان خوشك و براکانت دەکەن؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ١٥ | ٪٩,٥ |
| تارادەیەك | ٢٤ | ٪١٥ |
| نەخێر | ١٢٠ | ٪٧٥,٥ |
| کۆی گشتی | ١٥٩ | ٪١٠٠ |

خشتەی (١٩) جیاوازیکردنی دایك و باوکان لە نێوان منداڵان ڕوون دەکاتەوە کە ڕێژەی (٪٧٥,٥) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە پێیان وایە کە ئەم جیاوازییە نییە، وە ڕێژەی (٪١٥) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە تاڕادەیەك هەست بەو جیاوازییە دەکەن بەڵام ڕێژەی (٪٩,٥)ی تاکەکانی نموونەی توێژینەوە وای

دەبینن کە ئەم جیاوازییە زۆرە، بوونی ئەم حاڵەتە لە نێو خێزان کاریگەرییەکی نێگەتیڤ جێدەهێڵێت لەسەر باری دەروونی منداڵ و هۆکارێکە بۆ سەرهەڵدانی نەخۆشییە دەروونییەکان، تێبینی: فۆرمێکیان ئەم پرسیارەی بێ وەڵام جێ هێشتبوو.

خشتەی (٢٠)

ئایا مامۆستاکان هەست و سۆزی قوتابیان لەبەرچاو دەگرن؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ٣٥ | ٪٢٢ |
| تارادەیەك | ٧٨ | ٪٤٨,٧ |
| نەخێر | ٤٧ | ٪٢٩,٣ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

لە خشتەی (٢٠) ئەوە دەردەکەوێت ڕێژەی (٪٤٨,٧) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە پێیان وایە مامۆستاکان تارادەیەك هەست و سۆزی قوتابیەکانیان لەبەرچاو دەگرن، و ڕێژەی (٪٢٢)یشیان پێیان وایە مامۆستاکان هەست و سۆزی قوتابیان زۆر لەبەرچاو دەگرن ، و ڕێژەی (٪٢٩,٣) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە پێیان وایە مامۆستاکان لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ قوتابیان هەست و سۆزی قوتابیان لەبەرچاو ناگرن.

خشتەی (٢١)

لەکاتی هەبوونی کێشەیەکی تایبەتی متمانەت بەکێیە لەلای باس بکەی؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| یەکێك لە ئەندامانی ماڵەوە | ٣٠ | ٪١٨,٧ |
| توێژەری کۆمەڵایەتی قوتابخانە | ٣ | ٪١,٨ |
| هاوڕێیەك | ٦٧ | ٪٣٢ |
| لای کەس باسی ناکەم | ٦٠ | ٪٣٧,٥ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ٪١٠٠ |

خشتەی (٢١) بوونی متمانە لە نێوان خێزان و قوتابخانە و قوتابی دەردەخات لەکاتی هەبوونی کێشەیەکی تایبەتی قوتابی متمانەی بە کێیە لەلای

باس بکات کە ڕێژەی (٣٧,٥٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە لەکاتی هەبوونی کێشەیەکدا لەلای کەس باسی ناکەن ئەمەش کاریگەریی خراپ دەکاتە سەر دەروونی و لە ناوەوەی خۆیدا پەنگ دەخواتەوە و ئازار دەچێژێ، وە ڕێژەی (٣٢٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە کێشەکانیان لەلای هاوڕێیەك باس دەکەن و ڕێژەی (١٨,٧٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە کێشەکانیان لەماڵەوە باس دەکەن کەواتە خێزان ریزبەندی سێیەمە بۆ متمانەی قوتابییەکان ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوە خێزان نەیتوانیوە بە شێوەیەکی باش بە ئەرکی دەروونیی خۆی هەڵبستێت، و ڕێژەی (١,٨٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە پەنا بۆ توێژەری کۆمەڵایەتیی قوتابخانە دەبەن لەکاتی هەبوونی کێشەیەکیاندا.

خشتەی (٢٢)

لەکاتی هەبوونی کێشەیەکت لە قوتابخانە لای کێ باسی دەکەیت؟

| وەڵامەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| توێژەری کۆمەڵایەتی | ٢٢ | ١٣,٥٪ |
| مامۆستایەك | ٣١ | ١٩,٥٪ |
| بەڕێوەبەر | ٢ | ١,٥٪ |
| هیچ کامیان | ١٠٥ | ٦٥,٥٪ |
| کۆی گشتی | ١٦٠ | ١٠٠٪ |

خشتەی (٢٢) بوونی متمانە لەنێوان قوتابی و قوتابخانە دەردەخات کە قوتابیان کێشەکانی قوتابخانەیان لەلای کێ باس دەکەن لە قوتابخانە، ڕێژەی (٦٥,٥٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە لەلای کەس باسی ناکەن، ڕێژەی (١٩,٥٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە لەکاتی بوونی کێشەیەك لای مامۆستایەك باسی دەکەن، و ڕێژەی (١٣,٥٪)شیان پەنا بۆ توێژەری کۆمەڵایەتی دەبەن لەکاتی بوونی کێشەیەکدا وە ڕێژەی (١,٥٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە کێشەکانی قوتابخانە لە لای بەڕێوەبەر باس دەکەن، بەپێی دەرئەنجامەکانی ئەم خشتەیە قوتابخانە هەلی گونجانی دەروونی بەشێوەیەك نەڕەخساندووە کە قوتابیان بتوانن بە متمانەوە کێشەکانیان لەلای مامۆستا یاخود بەڕێوەبەر یاخود

توێژەری کۆمەڵایەتی باس بکەن بەدوای ئەمەشدا کێشەکان کپ دەکرێن و ڕەنگە ئاڕاستەیەکی پێچەوانە وەربگرن سەبارەت بە قوتابخانە.

### بەشی شەشەم/ ئەنجامەکانی توێژینەوەکە:

ئەم توێژینەوەیە بەچەند ئەنجامێك گەیشتووە کە بریتین لە مانەی خوارەوە:

– باری دەروونیی قوتابیان بەشێوەیەکی گشتی لە بارێکی ناهاوسەنگدایە و نیشانەکانی نەخۆشی دەروونییان لێ بەدی دەکرێت.

– قوتابخانە نەیتوانیوە لەپاڵ ئەرکە فێرکردنەکەیدا بەشێوەیەکی تەندروست بەئەرکە پەروەردەییەکەی هەڵبستێت، لەڕووی دەروونییەوە و خوێندکاران هەست بە ئاسوودەیی و ئارامی ناکەن لە خوێندنگا.

– بوونی ڕەهەندی توندوتیژی لە قوتابخانەدا هەندێ جار وای کردووە قوتابی هەست بە بێزاربوون بکات لە خوێندن و لەهەمانکاتدا جۆرێك لە ترس و دڵەڕاوکێی لە دەروونی قوتابیان بەرهەم هێناوە.

– کێشەکانی ناو خێزان بەشێوەیەکی بەرچاو بووەتە هۆی ئەوەی منداڵان هەست بە دڵتەنگی و غەمباری بکەن، جگەلەمەش پەروەردەی خێزان توندوتیژیی بەرچاوی لێ بەدی دەکرێت و بەشێوەیەکی تەندروست نییە.

– جیاکاری دایکان و باوکان بۆ منداڵەکانیان هەیە بەڵام بەرێژەیەکی کەم.

– بەشێکی زۆری قوتابیان کێشەکانیان بە کپکراوی دەهێڵنەوە و نە لای خێزان نە لە قوتابخانە باسی ناکەن لەبری ئەوە زیاتر پشت بە هاوڕێکانیان دەبەستن.

### بەشی حەوتەم/ ڕاسپاردە و پێشنیازەکانی توێژینەوەکە:

لەژێر ڕۆشنایی ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە هەندێك ڕاسپاردە و پێشنیاز دەخەینەڕوو کە زیاتر وەکو ڕێگە چارەیەکن بۆ ئەو گرفت و کەم و کوڕیانەی لە بواری پەروەردەدا هەیە:

١– پێویستە لەسەر لایەنە پەیوەندیدارەکان و دەزگا ڕاگەیاندنەکان زیاتر ڕۆڵی هۆشیارکردنەوە ببینن بەتایبەت لە بواری پەروەردەیی خێزان و مەترسیی نەخۆشییە دەروونییەکان و هۆکارەکانی.

٢- پێویستە لەسەر وەزارەتی پەروەردە بەردەوام خولی شیاندن و گەشەپێدانی مرۆیی بۆ مامۆستا و بەڕێوەبەرەکانی بکاتەوە بەئامانجی تێگەیشتنی زیاتر لە فەلسەفەی پەروەردە و فێرکردن، و ڕۆڵی توێژەری کۆمەڵایەتی زیاتر پەرەی پێبدرێت لە خوێندنگاکاندا.

٣- ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پێویستە زیاتر هەوڵەکانیان بخەنەگەڕ بۆ وشیارکردنەوەی دایکان و باوکان لەپێناو وەدیهاتنی خێزانی بەختەوەر و پێگەیاندنی تاکی هوشیار و دەروونت‌روست.

٤- دەکرێت لەڕێگای جێبەجێکردنی پرۆژەیاسایەك لەکاتی مارەبڕیندا خولێکی ڕاهێنان و هوشیاری یاخود پرۆگرامێکی ئامۆژگاری (ارشاد)ی بۆ هاوسەرە تازەکان بکرێتەوە بۆ بونیادنانی خێزانێکی تەندروست.

٥- پێشنیاز دەکەین توێژینەوەی زیاتر لەسەر پەیوەندییەکانی ناو قوتابخانە و ڕۆڵی توێژەری کۆمەڵایەتی بکرێت.

٦- پێشنیاز دەکەین توێژینەوە لەسەر کاریگەریی ئاستی هۆشیاری دایك و باوك لەسەر باری دەروونی منداڵان ئەنجام بدرێت.

**سەرچاوەکان:**

**یەکەم/ سەرچاوە کوردییەکان:**

١. پێندرۆیی، محمد سالح .(٢٠١٢) **ڕۆڵی خێزان و قوتابخانە لە ڕیشەکێشکردنی توندوتیژیدا**. هەولێر: چاپخانەی ڕۆژهەڵات.
٢. خلیل، مەعن. (٢٠٠٧) **کۆمەڵناسی خێزان**. و: ارام امین جلال. دهۆك: چاپخانەی خانی.
٣. ریشاوی، عومەر. (١٩٨٦) **تاوانە دەروونییەکان**. بەغدا: چاپخانەی الحوادث.
٤. ژالەیی، جەلال خەلەف. (١٩٨٦) **گرنگترین نەخۆشییە دەروونییەکان**. بغداد: چاپخانەی جاحظ.
٥. سەمیرە.(٢٠٠٩) **فەرهەنگی زاراوەکانی کۆمەڵناسی**. چ١. سلێمانی: چاپخانەی چوارچرا.
٦. شارون، جۆیل. (٢٠١٠) **دە پرسیاری کۆمەڵناسی**.و: هێمن شریف. چ١. سلێمانی: چوارچرا.
٧. عزیز، عزالدین احمد. (٢٠١٢) **بنەماکانی دەروونزانی گشتی**. چ٤. هەولێر: چاپخانەی ڕۆژهەلات.
٨. قەرەچەتانی، کریم شریف. (١٩٩٩) **هەندێ نەخۆشی دەروونی**: هەولێر.
٩. قەرەچەتانی، کریم شریف. (٢٠٠٧) **سایکۆلۆژیای گشتی**. چ٢. هەولێر: چاپخانەی حاجی هاشم.
١٠. موحسنی، منوچیهر. (٢٠٠٧) **دەروازەکانی کۆمەڵناسی**.و: ڕێبوار سیوەیلی و ئەوانی تر. چ٣. هەولێر: دەزگای ئاراس.

**دووەم/ سەرچاوە عەرەبییەکان:**

١١. ارجايل، ميشيل. (١٩٨٢) **علم النفس ومشكلات الحياة الاجتماعية**. ترجمة: د.عبدالستار ابراهيم. القاهرة: مكتبة مدبولى.
١٢. العزاوى، أياد عبدالكريم. و ابراهيم، مروان عبدالمجيد.(٢٠٠٢) **علم الاجتماع التربوي الرياضي**. ط١. الاردن–عمان: دار العلمية الدولية للنشر والتوزيع و دار لثقافة للنشر والتوزيع.
١٣. الالوسى، جمال حسين. (١٩٩٠) **الصحة النفسية**. بغداد: مطابع التعليم العالي.
١٤. الحسن، احسان محمد. و الحسين، عبدالنعم. (١٩٨١) **طرق البحث الاجتماعي**. بغداد:وزارة التعليم العالي.

١٥. الرفاعی، نعیم.(١٩٨٧) **الصحة النفسية. الطبعة السابعة**. دمشق: جامعة دمشق.
١٦. الزراد، فیصل محمد. (١٩٨٤) **الامراض العصابية والذهانية والاضطرابات السلوكية**. بیروت: دار القلم.
١٧. المعروف،صبحی عبداللطیف.(١٩٨٦) **نظريات الأرشاد النفسي والتوجيه التربوي**. بغداد: مطابع دار القادسية.
١٨. تركية، بهاالدين خليل. (٢٠٠٤) **علم الاجتماع العائلي**. ط١. دمشق: مؤسسة سندباد.
١٩. جلال، سعدون. (١٩٧٠) **في الصحة العقلية**. الاسكندرية: مطبعة المصري.
٢٠. حسن، محمود. (١٩٧٣) **مقدمة الرعاية الاجتماعية**. الجزء الأول. مكتبة القاهرة الحديثة.
٢١. راجع، احمدعزت. (١٩٨٥) **اصول علم النفس**. ط١. لبنان–بیروت: دار القلم.
٢٢. رشوان، حسين عبدالحميد. (٢٠٠٣) **الأسرة والمجتمع**. مصر: مؤسسة شباب الجامعة.
٢٣. زهران، حامد عبدالسلام. (١٩٧٤) **الصحة النفسية والعلاج النفسي**. ط٤. القاهرة: عالم الكتاب.
٢٤. عوض،عباس محمود.(١٩٨٨) **الابعادالسياسية للمشكلات النفسية والاجتماعية للأسرة في مجتمع الحديث**. الاسكندرية: دار المعرفة الاجتماعية.
٢٥. عوض، عباس محمود. (١٩٨٠) **في علم النفس الاجتماعي**. الاسكندرية: دار المعرفة الاجتماعية.
٢٥. غباری، محمد سلامة محمد. (٢٠٠٦) **الدفاع الاجتماعي في مواجهة الجريمة**. الاسكندرية: دار الوفاء لدنيا الطباعية.
٢٦. فهمی، مصطفی.(١٩٧٦) **الصحة النفسية، دراسات في سايكولوجية التكييف**. مكتبة الخانجي بالقاهرة.
٢٧. مغاريوس، صموئيل. (١٩٧٤) **الصحة النفسية والعمل المدرسي**. ط٢. مكتبة النهضة المصرية.

**سێیەم/ سەرچاوە فارسییەكان:**

٢٨. نجاتی، حسین. (١٣٨٨) **روانشناسی رشد (كودك و نوجوان)**.چ:٤، تهران: انتشارات بیكران.

**چوارەم/ توێژینەوەكان:**

٢٩. كريم،نیشتمان حسين. (٢٠٠٧) **بەدیموكراتیكردنی خوێندنگە**. هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

**پێنجەم/ سەرچاوە ئەلیکترونییەکان:**


٣٠. عبدالله، نوری سعدون. (٢٠١١) العوامل الاجتماعية المؤثرة في ارتكاب الجريمة، **مجلة جامعة الانبار للعلوم الانسانية. العدد الاول**، ص ١٣٢ الى ١٦٠،دەست دەکەوێت لە: www.iasj.net/iasj?func=fulltext&ald=14282. رۆژی سەردان ٢٠١٤/١٢/٢٤.

٣١. السهلي،عبدالله بن حميد. (١٤٣١هـ) اساليب مواجهة الضغوط النفسية لدى الشباب من المرضى المترددين على مستشفى الطب النفسي بالمدينة المنورة وغير المرضى، دەست دەکەوێت لە : www.jsai.ten . ڕۆژی سەردان ٢٠١٤/١٢/١٥.

٣٢. اللامى، عبدالعباس مجيد تايە. (٢٠١٠) الضغوط النفسية لدى طلبة الدراسات المسائية، دەست دەکەوێت لە: www.udeocri.loadhgabou.ude.qi. ڕۆژی سەردان ٢٠١٥/٢/٢٨.

٣٣. موسى، ايمان عبدالوهاب، محمد، باسمة فارس. (٢٠٠٥) العوامل الاجتماعية المؤدية لظهور المرض النفسي "الاكتئاب"نموذجاً. **مجلة دراسات موصلية.العدد١٠**، ص١٠٧ الى ١٤٠. دەست دەکەوێت لە: www.jsai.ten. رۆژی سەردان ٢٠١٤/١٢/١٥.

## ملخص البحث

## الدور الاجتماعي للعائلة والمدرسة في نشوء الامراض النفسية لدى طلبة الحادي عشر (بحث ميداني في قضاء سوران)

إن الغرض من هذا البحث هو الاجابة على السؤال التالي ( ما هو دور العائلة والمدرسة في نشوء المشكلات النفسية؟ وكيف تستطيع هاتين المؤسستين من توفير جو نفسي ملائم لاعضائها؟) .

في هذا البحث الميداني تم إستخدام منهج المسح الاجتماعي وهذا البحث أجرى في المدارس الاعدادية في قضاء سوران وكانت عينة البحث طلبة الصف الحادي عشر بفرعيه العلمي والادبي وكان عدد أفراد عينة البحث ١٩١٠ طالب و طالبة وكانت قد جمعت عشوائياً في اربع مدارس في مركز قضاء سوران وحجم العينة كان ١٦٠ طالب وللحصول على المعلومات تم الاعتماد على إستمارة إستبيانية تتضمن من ٢٢ سؤالاً.

وعن نهاية البحث تمكن الوصول الى مجموعة من النتائج المهمة منها أن الحالة النفسية للطلبة غير مستقرة وعلامات الامراض النفسية ظاهرة عليهم. وان المدرسة بالاضافة الى المهام التعليمية لم تستطع أن تقوم بالعناية من الناحية النفسية بالشكل المطلوب، وأن وجود ظاهرة العنف في المدارس ادى الى إبتعاد الطلبة عن الدراسة وزرع الخوف في نفوس الطلاب وأيضا أن المشاكل العائلية لها دور كبير في ذلك وجعلهم يشعرون بالضجر والخمول .

## Abstract:

**The role of social factors, family and school specifically in emerging psychological problems by eleventh grade students**

(An Empirical Research in Soran District)

The objective of this study is to investigate that to what extend both family and school play key role in emerging psychological problems? To what extend school and family have been able to create healthy atmosphere for their beneficiaries? This research was conducted in preparatory schools in Soran district. Research population were eleventh grade students (science and literary branches) overall number of pupils were 1910. The research samples were taken randomly in four schools located in city center and number pupils were taken as research samples were about 160. Questionnaire forms were used to collect required data which contained 22 questions. Additionally social survey method has been used to paradigm the findings of the study.

Throughout the study, the researcher reached to important points; including that pupils in general experience psychological instability and psychological problem symptoms. Schools have not been successful to deliver educational message parallel to learning services. Exercising corporal punishment in schools has led to dis-incentivize pupils from studying and worry them psychologically. Families, domestic issues are generally made pupils to feel depressed and anxious.

# ئایا "کوێر ئۆغڵی" کورد بووە؟

ئەنوەر سوڵتانی

***پێشکەش بە یادی شەهید 'شیرین عەلەم هولی' جەلالی ماکۆیی***

*ئامانج لە نووسینی ئەم وتارە، نە دابەشکردنی بەشەماڵی کورد و غەیرە کوردە، نە سەندنەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی لە کەسایەتییەکی مێژوویی وەک کوێرئۆغڵی. من بە باشی شارەزای جێگە و پێگەی کوێرئۆغڵی لە لای گەلی برای ئازەربایجانی هەم و دەزانم چەندەیان خۆش دەوێت و چۆنی ڕێز لێدەگرن. ئەوەی من دەیکەم، پشکنینی وردی مێژووی کەسایەتییەکە، کە بوون و نەبوونی وەک کاوە و ڕۆستەم و گەلێک قارەمانی دیکەی ئەفسانەیی گەلانی تر لە تەمتومانی ئەفسانە و مێژوودا ونە و تەنانەت ئەگەر کۆدەنگییک لە سەر بوونی هەبێت، دیسان ناتوانرێت شوێن و کاتی ژیانی بە ڕوونی دیاری بکرێت. کوێرئۆغڵی وەک قارەمانی گەلی ئازەربایجانە، قارەمانی گەلانی دیکەی ناوچەکەش هەیە، هەر لە تورکی تورکیاوە تا کورد و تورکمان و ئۆزبەک و تاجیک و هتد. مێژووی گەلانی ناوچە، بە پێچەوانەی ئەو کێشە و هەرا شۆڤینیستییانەی کە ئێستا لە ئارادان، تێکەڵاوییەکی زۆری لەگەڵ یەکتر هەیە و بنەمای هاوبەش لەو مێژووە هاوبەشە گرشەدارەدا گەلێک زیاتر لە جیاوازی و دژایەتییەکانیەتی.*

لەم دواییەدا کتێبێکم سەبارەت بە *'کوێرئۆغڵو'*— قارەمانی مێژوویی/ ئەفسانەیی گەلی ئازەربایجان خوێندەوە: *"کوراوغلو در افسانە و تاریخ"*[1].

کتێبەکە، نووسەری ناوداری ئازەربایجانی- 'ڕەحیم ڕەئیس نیا' بە فارسی نووسیویە و دەیان سەرچاوەی ئازەری و تورکی و تورکمەنی و ئوزبەکی و ئەرمەنی و تەنانەت کوردی[2] و زمانە ئەوروپاییەکانیشی پشکنیوە و خۆی گوتەنی، ویستوویەتی ئەو قارەمانە مەزنەی ئازەربایجان و گەلانی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست "لە بەر ئاوێنەی مێژوو و ئەفسانە دا" سەیر بکات. ناوی

کتێبەکەش هەر ئەو ڕاستییە دەگەیێنێت، واتە گەڕان بە دوای حەقیقەتێکی مێژووییدا کە تێکەڵاوی ئەفسانە بووە، یا ئەفسانەیەکی شیرین کە بەهۆی خۆشەویستیی خەڵکەوە شێوازی مێژووی بەخۆیەوە گرتووە.[٣] پابەندبوونی نووسەر بە ئەسڵی بێ لایەنیی لە لێکۆڵینەوەکەیدا، کارێکی وای کردووە واقیع و ناواقیع یاخود ئەفسانەیی یان مێژوویی بوونی کوێرئۆغڵی لە پرۆپێستدا بمێنێتەوە و دوایین بڕیار لەم بارەیەوە بۆ خوێنەر و بۆ دەسکەوتەکانی دواڕۆژ بەجێ بهێڵرێت.

ئەوە خۆی ڕادەی زۆری پابەندبوونی نووسەر بە ئەمانەتداریی زانستی دەگەیێنێت؛ دەنا خوێنەر دەتوانێت هەست بکات کە نووسەر ئازەربایجانییە و لەگەڵ ئەوەشدایە کە "چەنلی بێل" وەک شوێنی ڕاپەڕینی کوێرئۆغڵو و 'قاچاغ'ەکانی تر، لە ناوچەی 'قوتوور' ی ئازەربایجانی ڕۆژئاوای ئێران بووبێت و بەم پێیە، کوێرئۆغڵوش بە خەڵکی هەمان ناوچە لە قەڵەم بدات[٤]. بەڵام ئەمانەتداری زانستیی نووسەر بە شێوەیەکە، کە خۆ لەو بۆچوونە یەک لایەنانە دەگرێت و وەک مرۆڤێکی بەرپرس، تەنیا بە ڕوونکردنەوەی ڕێگاوە خەریک دەبێت و گەیشتن بە ئاکام بۆ خوێنەر بەجێ دەهێڵێت. ئەو دیاردەیە، بەتایبەت لەم ساڵانەی دواییدا کە هەستی نەتەوایەتی لە ناو گەلی ئازەربایجاندا گەیشتۆتە ڕادەیەکی بەرز و کەم نین ئەوانەی وا کەوتوونەتە شوێن دروشمی کەمالیستەکانی تورکیا و دەستیان بە نیشانەی گورگی بۆر بەرز دەکەنەوە، دەسکەوتێکی گەورەی زانستي و لە هەمان کاتدا سیاسیشە.

خوێنەر هاوڕێ لەگەڵ نووسەری کتێبەکە، سەر بە دەیان کون و کاژێری نادیاری مێژوو و ئەفسانەدا دەکات و لە دەیان سەرچاوە دەکۆڵێتەوە بۆئەوەی بزانێت ئایا کوێرئۆغلی کەسایەتییەکی ڕاستەقینە بووە یان نا و ئەگەر بووە، کەی و لە کوێ ژیاوە، واتە ئەو 'چەنلی بێل' ەی وا لە داستانەکەدا وەک شوێنی ژیانی ئەو و هاوڕێکانی ناو براوە، لە کوێ هەڵکەوتووە و ئایا هەر بە ڕاستی ملە و چیایەک بەو ناوە هەبووە و هەیە یان نا؟ نووسەر سەبارەت بە بوونی کوێرئۆغڵی و هەڵکەوتنی شوێنی ژیانی لە ئازەربایجان هەڵوێستی نەرێیی یا ئینکار و ڕەدکردنەوەی نەگرتووە و ئامانجی لە نووسینی کتێبەکەش

بەرپەرچدانەوەی ئەو بۆچوونانە نەبووە کە کوێرئۆغڵی بە ئازەربایجانی دەزانن. بەپێچەوانە، لە ڕێگایەکی ناڕاستەوخۆوە دەیەوێت هەمان ئەو هەواڵانە بە ڕاست بقەبڵێنێت و بیانگەیێنێتە گوێی خوێنەر، کە کوێرئۆغڵی ئازەربایجانییە نەک تورکی تورکیا، هەر ئەو شێوازە ناڕاستەوخۆیەش بایەخێکی زیاتر بە کارەکەی دەبەخشێت و بۆ نموونە، دووری دەخاتەوە لە هەڵوێست گرتنی ئەوانەی وا بە زۆرەملێ دەیانەوێت کوێرئۆغڵی بکەنە ماڵی لایەنێک و لە لایەنەکانی دیکەی داببڕن یا وەک سیاسەتی دەوڵەتی تورکیا بەڵگە و سەنەد دروست بکەن کە کەسێک بە ناوی کوێرئۆغڵی فلانە ساڵ لە فلانە گوندی شاری 'بولو'[٥] ی تورکیا ژیاوە و تۆمارە فەرمییەکانی ژیانی لە ناوچەکە پارێزراون و گەیشتوونەتە سەردەمی ئێمەش.

### بەلام ئامانجی من لە نووسینی ئام بابەتە؟

ڕەئیس نیا، دوای هەموو وردەکاری و پشکنینێک کە کردوویەتی، ئەوەی بەڕوونی دەربڕیوە کە کوێرئۆغڵی لە هۆزی "جەلالی" یە. ئەو هۆزە باوەکوو ئێستا بەشێک و لقێکی بە تورکیش قسە دەکەن، بەلام ئەگەر مەزندەی ٤٠٠ ساڵێک پێش ئێستا بۆ سەردەمی ژیانی کوێرئۆغڵی بە ڕاست وەربگرین (بڕوانە دواتر)، ئەوانیش وەک دونبولییەکانی شار و ناوچەی 'خۆی'، بە تەواوەتی کورد بوون و بە کوردی دواون.

لە لایەکی دیکەوە، کوێرئۆغڵی بە شایەدیی چیرۆکی "عاشق" ەکانی ئازەربایجان، "قاچاغ" بووە، واتە لەدەست زوڵم و زۆر داویەتە چیا. قاچاغبوون و چوونە چیاش بۆ کورد دیاردەیەکی نامۆ نییە و نەک هەر لە کۆندا بەڵکو تا ئەم سەردەمەی ئێستاش کوردی ئاوارەی دەستی بێدادیی دەرەبەگ و خان و شا و سوڵتان پشتیان بە چیا بەستووە و بە تاکەکەسی وەک حەمەتاڵ و خولەپیزە، لە شێوازی سیاسی و حیزبیشدا وەک پێشمەرگە و گریلا بۆ درێژەی خەبات داویانەتە چیا و لە حکوومەت قاچاغ بوون.

کوێرئۆغڵی و هاوڕێکانی جگە لە چیا، دۆستێکیان نەبووە، ئەوەش دیاردەیەکی ناسیاوی مێژووی کوردە و بۆ نموونە، لە قەلای دمدمی سەردەمی

سەفەوییەکان خەڵکانی گەمارۆدراوی سوپای شاعەبباس تا دواکەس و دوا چەک، بەرگری لە زێدەکەیان دەکەن. یان لە چیای قەندیلی ئەمڕۆدا هێزی باوەڕ بەسەر تانک و تۆپ و تەیارەی تورکیا و سەتەلایتی ئەمریکییەکاندا سەرکەوتووە. بەسەرهاتی کوێرئۆغڵی چ لە زمان عاشقەکانەوە و چ لە چیرۆکی "ئەفسانەی کوێرئۆغڵی" نووسینی یاشار کەماڵدا[٦]، کاتێ بەراورد دەکرێت لەگەڵ ئەو گریلایانەی وا هەرئێستا لە قەندیل و شنگاڵ بەرانبەر هێزی دوژمن داکۆکی لە نەتەوەی خۆیان دەکەن، دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە دەبێ درێژەدەری نەریتێکی کۆن بن — هەر ئەو نەریتە لەم ساڵانەی دواییشدا جارێکی تر لە شۆڕشی ئەیلوول و شۆڕشی نوێی ساڵی ٧٦ ی باشووری وڵاتەکەمان و خەباتی پێشمەرگەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بۆ نموونە، لە کۆبانێی قارەمان سەری هەڵداوەتەوە.

هەروەها کوێرئۆغڵی لە ئەدەبی کوردیدا شوێنێکی تایبەتی هەیە و کوردانی باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان و کوردی کۆمارەکانی پێشووی سۆڤیەت هۆگری کوێرئۆغڵین و ئەو قارەمانە مەزنە لە شیعر و ڕۆمان و گۆرانی کوردیی کرمانجی ژووروودا شوێنێکی بەرچاوی هەیە[٧].

ئەوانە بە سەریەکەوە، گەرای بیرێک دەخەنە مێشکی خوێنەر و بیسەرەوە و 'ئەگەر' ی کوردبوون یا لای کەم، پەیوەندی ئەو قارەمانە مەزنە لەگەڵ کورد، وەک دیاردەیەکی جیددی دەخاتە بەرچاو — دیاردەیەک کە خوازیاری لێکۆڵینەوەی بێ لایەنانەیە.

من نامەوێت بێ مەنتیق و دەمارگیر بم، هیچیش نامەوێت مافێک لە گەلی برای ئازەربایجانی بفەوتێنم، هیچ بەڵگەیەکی سەلماویشم بۆ بۆچوونەکەم نییە، تەنیا چەکێکی بەدەستمەوە بێت ئەو بەرەنجامەیە کە: کاتێ سەروبەری بابەتەکە وێک دەهێنرێتەوە و سەرەتاکان لای یەک دادەنرێن، بە ناچاری ئاکامی ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە لە نێو تەمتومانی مێژوو و ئەفسانەدا و لە ئەگەری حەقیقی بوون و نەبوونی کەسایەتییەک بەناوی کوێرئۆغڵی و ئەگەری ئێرەیی و ئەوێ یی بوون و ئەم سەدە و ئەو سەدەیی بوونیدا، ئەگەرێکی دیکەش هەیە کە ئەگەری کوردبوونی ئەو جەلالییە قاچاغەیە.

جەلالی بوون لە لایەک، ژیان لە ناوچەی "قوتـوور" ی ناوجەرگـەی هـۆزی جەلالی لـە لایـەکی تـر و ئـازایی و قاچـاغ بـوون و ڕێگـری و جوانمێرییەکەشـی لەولاتر- هیچکام لەو تایبەتمەندییانە لە کورد دوور نین، هەر بـۆیەش هیچکـەس بـە تێگەیشـتنێکی بـێ لایەنـەوە، ناتوانێـت خـۆ لـەوە بدزێتـەوە کـە بـۆی هەیـە کوێرئۆغلی کورد بووبێت یـان خـۆی و پاڵەوانـە قاچاغـەکانی دەوروبـەری کـورد بووبێتن.

سەرەتا هەڵبژاردەیەک لە کتێبی ڕێزدار ڕەحیم ڕەئـیس نیـا دەهێـنمەوە کە لە سـەرچاوەی جیـاوازی وەرگرتـوون و ئامـاژەی بە نـاوی نووسەرەکانیشـی کردوون، ئینجا دەگەڕێمەوە سەر باسەکە:

"...کوێرئۆغڵـو قارەمـانێکە لە نێـو خەڵـک هەسـتاوە و پاسـەوانی بەرژەوەندیی خەڵکە؛ عاشقێکە ئازایەتی و جوامێری بە گۆرانی دەڵێـت، خـاوەن زێـڕ و زۆران بە چەتەی دادەنـێن بەڵام خەڵـک بە ڕزگـارکەری خۆیـانی دەزانـن (ل.١٠٢)... بەربڵاویی ناوچەی بڵاوبوونەوەی ڕازەکە [واتە داستانی کوێرئۆغڵی] و هەنـدێک بابـەتی تـر، بـوونەتە هـۆی ئەوەی لێکـۆڵەری جیاجیـا، پێشـینەی مێژوویی ئەو و سازدانی چیرۆکەکەی بگەیێننەوە سەردەمی پێش ئیسلام ... بۆ نموونە وەک بیرەوەریی شـەڕی "گـوک تـورک" ەکـان لەگەڵ ساسـانیان .... یـا شەڕی نێوان تورکانی ئۆغوز لەگەڵ سنوورەوانەکانی ئێران ... (١٠٣) 'ئاغایان' ی ئەرمەنی ڕەگەزی کوێرئۆغڵو دەگەیێنێتەوە سەر ئەرمەنییەکـان و 'بەڕبەڕیـان' لە پەیوەنـدی شـەڕی ئەرمەنـی و ساسـانی و سـەردەمی ئارشـاکی دووهەمیـدا دەیبینێت... 'دومزیلی' فەڕەنسی پێشینەی ئەو ڕازەی کە زاڵمێک چـاوی بـاوکی قارەمـانێکی دەرهێنابێـت دەگەڕێنێـتەوە بـۆ سـەدەی شەشـەمی پـێش زایـین." (١٠٤) ....'خودزکۆ'، کوێرئۆغڵو بە تـورکمەنێکی تـایفەی تەکە دادەنێـت کە لە سەردەمی شاعەبباسی سـەفەوی (١٦٦٦-١٦٤٢ز) دا ژیـاوە و چـۆتە قەڵایەکەوە بە ناوی "چەملی بێل" لە دۆڵی سـەڵماس، و لەسـەر ڕێگـای [شـاری] خـۆی بـۆ ئەرزرۆم چەتەیی کردووە.... هەموو ئەو بابەتانە سەبارەت بە کوێرئۆغڵوویەکن، کە بۆی هەیە وەک کەسایەتییەکی مێژوویی، بوونی بووبێت... ئەگەر مەسـەلەی کۆچکردنی کوێرئۆغڵوی مێژوویی لە خۆراسـانەوە بـۆ ئازەربایجـان ڕاسـت بێـت،

ئەوا دوور نییە یەک لەو 'تەکەلوو' انە بووبێت کە پێشتر لە ڕۆژئاوا و بەتایبەت لە ئازەربایجانەوە کۆچیان کردبێت بۆ خۆراسان... لە ئەنسیکلۆپێدیای ئازەربایجاندا نووسراوە: *"تاقمێک لە __جەلالییەکان__ وا لە ئازەربایجاندا سەرەتا دژ بە داگیرکەرانی عوسمانی و پاشانیش دژ بە سەفەوییەکان و فیئۆداڵە خۆجێییەکان دەجەنگین، کوێرئۆغڵو ڕێبەرایەتی دەکردن..."* (١٠٦ تا ١٠٩)

**ڕەئیس نیا لە درێژەی باسەکەدا دەنووسێت:**

"... 'عەلی ئەوسەت قولییێف' دوای هێنانە گۆڕێ مەسەلەی شەڕی ئێران و عوسمانی و داگیرکاریی خاکی ئازەربایجان لەلایەن عوسمانییەکانەوە و ڕاپەڕینە وەرزێرییەکانی __جەلالی__ لە تورکیا و پەرەسەندنی بۆ __نەخجەوان__، دەڵێ: *"یەک لەو تاقمانەی وا دژ بە داگیرکەرانی تورک دەجەنگین، کوێرئۆغڵو قارەمانی گەل ڕێبەرایەتی دەکرد."* ... زوربەی نووسەرانی تورک بە خەڵکی __ئەناتۆلییان__ زانیوە، بۆنموونە 'کیرزی ئۆغلو' بە قەرەقۆیونلووی پەروەردەکراوی لای ژووری ڕووباری ئاراس و ویلایەتی __قارس__ لەوپەڕی __ڕۆژهەڵاتی تورکیای__ زانیوە... 'ئومید کافتانجی ئۆغڵو' دەڵێ: *"لە ئاقچاکوێی، بەشی ڕیفاهیە ی ئەرزەنجان لەدایک بووە و دواتر چۆتە شوێنێک بەناوی چاملی بێل لە ڕۆژئاوای __سیواس__."* 'فاروق سومەر' پشتی بە دەفتەری گرنگی ئارشیوی سەرەک وەزیرایەتی ئەستەمووڵ بەستووە و دەڵێ: *"کوێرئۆغڵو لە گوندی ساییق لە ئەیالەتی بولو[٨] لەدایک بووە؛ لەوێدا گوتراوە کەسێک بەناوی کوێرئۆغڵو لەو گوندەداماڵی خەڵکی تالان کردووە و دووکەسی بریندار کردووە... و خەڵک لەدەستی هاتوونەتە ئامان، ئیتر گرتوویانە."* ... کوێرئۆغڵوو درەنگتر چۆتە چیاکانی چەملی بێل کە کەوتوونەتە نێوان __سیواس__ و __توقات__... لە ئەنسیکلۆپێدیای ئازەربایجاندا هاتووە: *"عەبباسقوڵی ئاغا باکیخانۆف دەری خستووە کە __جەعفەرقوڵی خانی دونبەڵی__، حاکمی خۆی، [دوای ئەوەی لە سوپای عەبباس میرزای کوڕی فەتحعەلی شا تێک شکا]، ماوەیەک لە __چەنلی بێلی کوێرئۆغڵوو لە نزیک نەخجەوان__ ژیاوە"* ... هۆکاری سەرەکی ڕاپەڕینی هۆزەکانی کوردی دونبەڵی لە خۆی و سەڵماس، زیادبوونی گوشاریماڵیات بوو... ئەوەی کە زوربەی لێکۆڵەران دژایەتییان لەگەڵیدا نییە، بەشداریکردنی کوێرئۆغڵییە لە

<u>ڕاپەڕینەکانی</u> <u>جەلالیدا</u>. ئەو ڕاپەڕینە وەرزێرییانەی وا بە درێژایی سەدەی شازدە و حەڤدە، بەپچڕان و خـوارووژوور کردنـەوە درێژەیـان بووە....<u>کـورد حەیـدەر</u> و <u>جان فولاد</u> لە سەردەستەکانی جەلالی بوون... شاعەبباس لە سەر ڕێگای چوون بۆ تەورێز چاوی بە هەنـدێک لە سـەرانی جەلالـی وەک ...<u>قـوڵی بەگـی کـورد</u> و <u>کوردعەلی</u> کەوت...شاعەبباس هەموو جەلالیانی کۆچ دا بۆ کوردسـتان ... دوای هەڵاتن و پەنابەریەتی جەلالیان لە ئێران، مراد پاشا هەمـوو ئەوکەسـانەی وا لە وڵاتی ڕۆم دا ڕۆژێـک لە ڕۆژان ناسـیاوییەکیان لەگەڵ ئەو تـایفەیە پەیـداکردبوو، نـاردە دیـاری نەبـوون و نـاوی جەلالـی لە سـەر ئـەو وڵاتە پـاک کـردەوە... دەوروبەری ٦٥ هەزار کەسی لێ کوشتن... (١٠٩ تا ١٢٩).

بەگوێرەی ناوەرۆکی ئەو بژارەی سەرەوەی کتێبەکە،

١. ئەگەری ئەوە هەیە کە قارەمـانێکی خەباتکـاری لایەنگـری خەڵـک و دژبەری زۆرداران بە نـاوی کوێرئـۆغڵی کەسـایەتییەکی حەقیقـی بووبێـت و لە دەوروبەری سـەدەی ١٥ و ١٦ ی زایینیـدا ژیابێـت، گەرچـی بـە گـوێرەی زانیارییەکانی ئەمڕۆی ئێمە، مەسەلەکە لە بوومەلێڵی مێژوو و ئەفسانەدایە؛

٢. هـۆزی جەلالـی هـۆزێکی چەوسـاوەی دەسـتی عوسـمانی و ئێرانـی سەفەوی و حکوومەتەکانی دوای ئەوان بـوون و بەهـۆی پێشـینەی شۆڕشـگێڕ و ڕاپەڕینەکـانی هـۆزەکەوە بە تـایبەت دژ بە عوسـمانییەکان، زاراوەی 'جەلالـی بوون' لە خاکی عوسمانی و ناو کۆمەڵانی خەڵکدا واتـای ڕاپەڕیـو و سـەربزێوی بووە؛

٣. ئەنـدامانێکی زۆری هـۆزی جەلالـی داویـانەتە چیـا و لەوێـوە لەگەڵ حاکمانی خـۆجێیی و بەگشـتی لەگەڵ حکـوومەتی عوسـمانی جەنگیـون، لەوانە، کوردعەلی، کوردحەیدەر، جان فولاد و قوڵی بەگی کوردن (بڕوانە سەرەوەتر)؛

٤. جەعفەرقوڵی خانی [کوردی] دونبەڵی- حاکمی خۆی، دوای تێکشـکانی سـوپاکەی لە شاعەبباسـی سـەفەوی، مـاوەیەک لە چەنلـی بێلـی کوێرئـۆغڵی لە نزیک نەخجەوان ژیاوە (سەرەوەتر)؛

٥. ئەگەر ئێمــە، بــوونی کەســایەتییەک بە نــاوی کوێرئــۆغڵی بەڕاســت بزانین، دەبێ یەک لە ئەندامانی هۆزی جەلالی بووبێت یاخود 'بـووبێتە جەلالـی' لەبەر ئەوەی ناوی کوێرئۆغڵی و جەلالی لە سەرچاوەی زۆردا، ئاوێتەی یەکترن؛

٦. گەرچــی شــوێنی لەدایکبــوونی کوێرئــۆغڵی و ئەو چیــایەی و لەوێــوە ڕێبەرایەتی خەباتی کردووە واتە "چەنلی بێل" یا "چەملی بێل" (بە واتای ملەی تەمـاویی[٩])، بەڕوونـی دیـار نیـیە، بەڵام زوربەی لێکـۆڵەران نـاوی ئەم ناوچـانە وەک شـوێنی ژیـان و خەبـاتی کوێرئـۆغڵی دەبەن: " نزیـک سـیواس، ویلایەتـی قـارس لەوپەڕی ڕۆژهەڵاتـی تورکیـا، ئەنـاتۆلی ڕۆژهەڵات، 'نزیـک نەخـجەوان' و دۆڵی سەڵماس لە سەر ڕێگای شـاری خـۆی بـۆ ئەرزڕووم؛ <u>هەمـوو ئەوشـوێنانە، ئەودەمیش و ئێستاش شوێنی ژیانی کورد بوون و هەن</u>؛

٧. هۆزی جەلالـی لە دەیـان سـەرچاوە و کتێبـی مێژووییـدا وەک <u>"هـۆزی کوردی جەلالی</u>" ناسراون.[١٠]

***

نووسەر لە درێژەی باسەکە و لەژێر سەردێڕی "بزووتنەوە وەرزێرییە شـێوە جەلالییەکان لە ئازەربایجان" دا لە هەندێک ڕاپەڕینی وەرزێریی ناوچەکە دەدوێت و لەگەڵ ئەوەدا کە ناوی گەلانی ئازەربایجانی و ئەرمەنی دەهێنێـت، ئامـاژەیەک بە کـورد ناکـات، بە بۆچـوونی مـن، ئەوە سـەرچاوەکانی بەردەسـتی ئەون ئەو خەتایە دەکەن نەک خۆی:

*" بە گوێرەی کتێبی مێژووی ئازەربایجان نووسینی حوسەینۆف و ...'لە ناو دەسـتە جەلالییەکانـدا وەرزێرانـی ئەرمەنـی وئازەربایجـانی شـان بە شـانی <u>ئەو ڕاپەڕیـوانەی وا لە تورکیـاوە هـاتبوون</u>، بەشـداریيان دەکـرد.... سـەرکەوتنی شاعەبباس لەسەر بنەمـای بـزووتنەوەی ئـازادیخوازانەی دژی عوسـمانیی خەڵـک ...بوو. ڕاپەڕینی دژی عوسمانی ناوێکی ئەوتۆی دەرکرد کە <u>داسـتانی حیماسـی و قارەمانانەی شێوە ئەفسانە</u> لە لایەن خەڵکەوە کەوتە سەر زمان، یەک لەوانە، داستانی ئازەریی کوێرئۆغڵییە.'* (١٣٧تا ١٣٩)

ئایـا *'ئەو ڕاپەڕیـوانەی وا لە تورکیـاوە هـاتبوون'*، لەو نـاوچە تـایبەتەدا دەژیان و لەژێر گوشار و کوشت وبڕی مرادپاشادا بوون و هاوخەباتی ئەرمەنی و

ئازەربایجانی بوون، جگە لە کورد کێی دیکەن؟ ئایا هەر ئەو مرادپاشایە نەبوو ئێزەدییە کوردەکانی قەتڵ و عام کرد؟ ئایا حەماسەی 'قەڵای دمدم' ی کوردان هەر لەو سەردەمە و لە ماوەی شەڕی نێوان عوسمانی و ئێراندا نەخوڵقاوە؟ بە دڵنیایی، با! تەنیا بەو جیاوازییەوە کە ئەوی دواییان ڕووی لە شاعەبباسە، کە دەچووە شەڕی عوسمانییەکان. ئایا نووسەرانی مێژووی ئازەربایجان ئەو ڕاستییانە نازانن یان بە دەستەقەسد دەیانخەنە پشت گوێ؟

لە کۆتاییدا دەمەوێت ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ لە بۆچوونەکانی ڕەئیس نیا بکەم کە دەڵێت:

*"ئەو کوێرئۆغڵییەی وا لە چوکوراوا باسی لێ دەکرێت، لەباری زمان، پێکهاتە [ی لۆغەوی]، بینا [ی ڕیزمانەوانی] و جیهان بینییەوە، لەگەڵ کوێرئۆغڵییەک کە لە قارس لە سەر زمانی خەڵکە، جیاوازی هەیە؛ کوێرئۆغڵوی ئازەربایجانیش کوێرئۆغلویەکی دیکەیە..."* (ل. ٤٩).

ئەو بۆچوونە دەکرێ بمانگەیێنێتە ئەنجامی ئەوەی کە دوور نییە لە بیروباوەڕی خەڵکی گوند و شارە کوردنشینەکانی هەمان ناوچەی قارسیشدا کوێرئۆغڵییەک بووبێت و هۆگریی کورد بەو کار و کردەوەی عەداڵەتخوازانەی، لەو سەرچاوەیەوە سەری هەڵدابێت. هەر بەگشتی، گەلانی جیهان هەموویان بۆ مسۆگەربوون و جێگیرکردنی بەرانبەری و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، کەوتوونە شوێن قارەمانێکی ڕاستەقینە، یان تەنانەت لە زیهنیاندا کەسێکی وایان خوڵقاندووە. هیچ بەڵگەیەک بەدەستەوە نییە قارەمانێک بەناوی ڕۆبین هوود لە ناوچەی نۆتینگهام و مانسفیلدی بریتانیا ژیابێت و تەنانەت بوونی بووبێت، بەڵام خەڵکەکە ئەمڕۆش لایان وایە بووە و سەدان کتێبیان لەسەر نووسیوە و دەیان فیلم و شانۆیان لەسەر چێ کردووە. بە هەمان شێوە، دەکرێ کوردی ناوچەی قارسیش لە زیهنی خۆیاندا کوێرئۆغڵوویەکیان لە پەیوەندیی کورددا ئەفراندبێت.

**پاشکۆ :**

گەرچی کوردبوونی هۆزی جەلالی جێگەی گومان نییە، بەڵام من بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە سەبارەت بەوان، سەیری ئینترنێتم کرد و لەوێدا تووشی وتارێک هاتم کە کەسێک بەناوی هاشم فەرهادی نووسیویە، کە وێدەچێت خۆی لە کوردانی خۆراسان بێت. لە وتارەکەدا کوێرئۆغڵیی بە "کوردی جەلالی فیروزە" ناودێر کراوە.(۱۱)

هەروەها گۆرانییەکی دوو هونەرمەندی مەزنی کورد نەمران "مریەم خان" و "ئایشێ شان" هەیە، کە ناوی "بابۆ کۆرئۆغڵی" یە و پەسنی ژیان و خەباتی ئەو دەدات.(۱۲)

بە کورتی، پەیوەندیی کەسایەتی کوێرئۆغڵی و ناوچەی ژیانی لەگەڵ کورد و کوردستان جێگەی سەرنج و ڕامانە و بۆ ئەوە دەبێت دوور لە هەموو دەمارگیری و دژبەرایەتییەکی زمانی و نەتەوەیی، بە هەمان ئەو سینگ فراوانییەوە کە کاک ڕەحیم ڕەئیس نیا بۆ مەسەلەکە چووە، توێژینەوەی لە سەر بکرێت. ئەم وتارەی من تەنیا دەتوانێ سەرەتایەک بێت بۆ کار و ئەرکێکی زانستییانەی ئەوتۆ نەک شەڕەچەقە و من من و تۆ تۆی فەیسبووکی!

<u>چەند سەرچاوەیەک سەبارەت بە 'کوردبوونی جەلالییەکان'</u>

کەم و زۆر لە هەموو کتێبە مێژووییەکانی کورددا، هۆزی جەلالی دانیشتووی ناوچەی ماکۆ و بەری ئەودیوی سنوور لە کوردستانی باکوور، بە کورد ناسراون و وەک هۆزێکی گرنگی کورد ناوبردە کراون، هەر لە مێژووی کورد و کوردستانی ئەمین زەکی بەگەوە (ب.۱، ل.۳۵۲) تا مێژووی مەردوخ (ب. ۱، ل.۸٦) و دەیان کتێبی دیکەی کە مێژوونووسانی کورد لە ساڵانی دواتردا نووسیویانن. ژمارەی ئەو وێبلۆگە کوردی و فارسییانەی وا نووسەرەکانیان کوردن و ئاماژە بە کوردبوونی جەلالییەکان دەکەن، گەلێک زۆرن.

بەکورتی، ئەوەی وا پەیوەندیی بە کورد و نووسەرانی کوردەوە هەیە ڕوونە و کەس نییە جەلالی بە کورد نەزانێت. ئەوە لایەنی کورد، بەڵام با بزانین

غەیرە کورد چۆنیان ڕوانیوەتە ئەو پەیوەندییەی نێوان کورد و جەلالی و لە ڕاستیدا چۆن کوردبوونی 'جەلالی' لە لایەن مێژوونووس و خەڵکانی بیانی شارەزای ناوچەکەوە پشتڕاست کراوەتەوە. ئەوە چەند سەرچاوەی بیانی:

١. لە کتێبی 'مروج الذهب' ی مەسعوودی دا کە لە سەدەی سێزدەیەمی کۆچی نووسراوە (ب. ٣، ل. ٥٣) لیستەیەک لە ناوی ١٦ هۆزی کورد پێک هاتووە کە 'جەلالی' ژمارە دەیەمیەتی.[١٣]

٢. ئەسکەندەربەگی تورکمان لە کتێبی "عالم آرای عباسی" دا ناوی هەندێک لە گەورەپیاوانی جەلالی دەبات وەک 'جان فولاد' و 'کورد حەیدەر' کە ئەمیان هەزار کەسی [شەڕکەر] ی هەبووە، هەروەها قوڵی بەگی کورد بە سەد و چل کەس و کوردعەلی بە سێسەد کەسەوە (ب. ٢. لل. ٧٦٩، ٧٧٤ و ٧٩١).

٣. م. ئا. حەسرەتیان دەنووسێت: "*جەلالییەکان لە بەشدارانی هەمیشەیی ڕاپەڕینی کوردان لە تورکیا بوون.*"[١٤]

٤. ویلیام ئیگڵتن لە کتێبی "کۆماری کوردستانی ١٩٤٦" و دەوری هۆزە کوردەکان لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا دەنووسێت: " لە لای باکووری ڕۆژئاواوە کوردانی جەلالی هێرشیان بردە سەر سنوورەکانی لای خاکی یەکیەتی سۆڤیەتی و..."[١٥]

٥. ئارچی ڕۆزوێڵت لە وتاری "کۆماری مەهاباد" دا کاتێ باس لە 'هۆزە کوردەکانی کوێستانەکانی ڕۆژئاوای ڕەزائیە [ورمێ]' دەکات و دەڵێ بە نەبوونی دەسەڵاتی حکوومەتی ئێران لە ناوچەکە، سۆڤیەتییەکان ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە هۆزەکانەوە دەگرت و دەڵێ ئەو هۆزانە بریتی بوون لە جەلالی لە باکوور، شکاک لە چیاکانی ڕۆژئاوای شاپور و هەرکی لە ڕۆژئاوای ورمێ..."[١٦]

٦. دەیڤید مەکداول لە کتێبی "مێژوویەکی هاوچەرخی کورد" دا (فەسڵی ١٢)، کاتێ باس لە بارودۆخی کوردی ئێران لە ساڵانی دەوروبەری کۆدیتای گەلاوێژی ساڵی ١٣٣٢ (١٩٥٣ز) دەکات دەڵێ: "... لە ڕوانگەی ئینگلیزەکانەوە کوردانی جەلالی لە باکوور [ی ئێران] لایەنگرییان لە دەستدرێژیی یەکیەتی سۆڤیەتی بۆ سەر ئێران دەکرد..."[١٧]

٧. ئەنسیکلۆپێدیای 'ایرانیکا' کە بە زمانی فارسی لە ئەمریکا دەردەچێت، لــە ژێــر نــاوی 'جــەلالی' دا بابــەتێکی دوو لاپــەڕەیی نووســیوە کــە ئــەوە ناوونیشانەکەیەتی: "جەلالی – هۆزێکی کوردی ئەناتۆلیی ڕۆژهــەڵات و بـاکووری ڕۆژئاوای ئێران". نووسەری وتارەکە، 'پیـەر ئۆبرلینـگ' لـە زمـان 'باسـیل نیکـی تین' ەوە دەنووسێت "جەلالییەکان ئەرمەنیی بە کورد کراون".(١٨)

٨. ویکی پێدیای فارسی (دانشنامه آزاد) لـە سـەر ئینترنێـت دەنووسـێت: *"جەلالی" ناوی یەک لە عێلە کوردەکانی ئێرانە لە ئوستانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا و شــاری مــاکۆ، چاڵــدران و خــۆی. زمــانی قســەکردنی عێلەکــە کــوردی کرمانجییە ...."*

من لەوە زیاتر پێویسـت بـە بەڵگـە هێنانـەوە لەمـەڕ پەیوەنـدی جـەلالی و کـورد نـابینم، گـەرچی گـەلێک سـەرچاوەی بێگانـەی دیکـەش هـەن و دەکـرێ پشـتیان لێـرەدا ڕابگـوێزرێن. بـەڵام هـەر لـە باسـی کوێرئـۆغلی و کوردبوونیـدا بابەتێکی فارسیم لە سەر وێبلـۆگی 'کرمانجسـتان' ی ئینترنێت بینـی کـە تێیـدا "روشن جلالی ناسراو بـە کوێرئـۆغلی (کوراوغلـو) بـە کـوردی جـەلالی فیـروزە" ناسێنرابوو. وێدەچێت کوردانی خۆراسان کـە چـوار سـەدەیەک پـێش ئێسـتا لـە هەمان ناوچەکانی ژیانی جەلالییـەکان لـە عوسـمانییەوە هاتوونەتـە ئێـران و بـە لوتفی شاهانی سەفەوی تا قاجار شاربەدەری خۆراسان کراون، بایـەخی زۆر بـە کوێرئۆغلی بدەن و بە هی خۆیانی بزانن. ئەوە ئەدرێسی وێبلۆگەکەیە:

http://www.ellahmezar.ir/?p=2569#more-2569

بە داخەوە من کتێبی جێگەی باسی ئـەو وتـارەم نـەتوانی بدۆزمـەوە؛ ئـەو وتارە کورتەش کە سەبارەت بە کوێرئۆغڵی نووسراوە تـەنیا ئەوەنـدەی گوتـووە کە کوێرئۆغلی لە کوردانی جەلالی فیـروزە بـووە، بـەڵام شـیعرەکانی بـە تـورکی هێناوەتەوە.

لە ماڵپەڕێکی دیکـەی فارسـیدا هەنـدێک کتێبـی سـەبارەت بـە کوێرئـۆغڵی ناسێنراون کە وێنە و پێچ و کڵاوی کوێرئـۆغڵی لەوێدا کوردییـە. هـەر لەوێشـدا ئاماژە بە کتێبێک کراوە کە ناوونیشانەکەی بریتییە لە'کوێرئۆغڵی لە ئـەدەبیاتی گەلاندا'. وێدەچێت زانیارییەکان لە لایەن کوردانی خۆراسانەوە گردوکۆ کرابێتن:

http://www.adinehbook.com/gp/search/406-1394051-3572685?search-alias=books&chooser-sort=relevancerank&field-keywords=%DA%A9%D9%88%D8%B1%D8%A7%D9%88%D8%BA%D9%84%D9%88&Go.x=0&Go.y=0

### تێبینی:

سەرەڕای ئەو سەرچاوە نووسروانەی لەسەرەوە ئاماژەم پێدان، دوای ئامادە بوونی ئەم بابەتە و پێش ناردنی بۆ بڵاوبوونەوە لە گۆڤاری ئەکادێمیای کوردیدا، نوسخەیەکیم نارد بۆ هەندێک برادەری شارەزا و تکام لێکردن بۆچوونی خۆیانم سەبارەت بە ناوەرۆکی وتارەکە پێ ڕابگەیێنن.

برای بەڕێزم مامۆستا "سەربەست کەرکووکی" ئەم خاڵانەی لەسەر نووسیبوو بۆی ناردووم. بە سپاسی زۆرەوە لە مامۆستا سەربەست، وا لێرەدا کورتەی بۆچوونەکانی وەک سەرچاوەیەک بۆ ئاگاداریی خوێنەری وتارەکە ڕادەگەیێنم:

**١- ناوی یەکەمی پاڵەوانی داستانەکە (ڕەوشەن) و ناوی دەسگیرانەکەی (نیگار) کوردین نەک تورکی؛**

**٢- ناسناوی 'دەدە' یان 'دەلی' دەلیلی تورکبوونی کەسەکە نین. ئێمە لە کەرکووک دەیان کەسی ناودارمان هەیە کە بە 'دەدە' بانگ دەکرێن و کوردی تەواو عەیاریشن، تەنانەت لە شاری سلێمانیدا دەدە وەک ناسناو بەکار دەهێنرێت و لە لایەکی ترەوە هەموو پیاوە ئایینییەکانی کاکەیی و عەلەویی کوردیش دەدەیان پێدەگوترێت؛**

**٣- ئێمە لە کەرکووک دەیان خێزانی 'جەلالی'مان هەن کە کوردن و خۆیان بە کورد نەبێت بە هیچیتر نازانن.**

### کوێرئۆغڵی لە مۆسیقای کوردیدا

جگە لە کتێب و شیعر و نووسراوەی کوردی سەبارەت بە کوێرئۆغڵی،[١٩] داستانی کوێریۆغڵی چۆتە ناو مۆسیقای کوردیشەوە و نەمران مریەم خان (١٩٤٩ – ١٩٠٤)[٢٠] و ئایشێ شان (١٩٩٦ – ١٩٣٨) بەندی 'بابۆ کوێرئۆغلی' یا 'باڤێ کوێرئۆغڵی' یان بە دەنگی خۆشی خۆیان تۆمار کردووە.

برای بەڕێزم 'کاکشار ئۆرامار' جگە لە هەندێک تێبینیی ورد لە سەر بابەتەکە و ناوچەی ژیانی کوێرئۆغڵی، شیعری 'بەند' ەکەی مریەم خان و ئایشێ شانی بە پیتی لاتینی نووسیوەتەوە و بۆی ناردووم کە لە خوارەوەدا هەردووکیان دەخەمە بەرچاوتان. هەروەها دوو بەندی دیکەی 'باڤێ کوێرئۆغڵی' ی بە دەنگی دوو هونەرمەندی دیکە بۆ ناردووم کە چەند دێڕێک دواتر ئەوانیش دەخەمە بەرچاو. لە ڕاستیدا کاکشار بە ڕادەی من بەم کارەوە ماندوو بوو، دەستی خۆش بێت و سپاسی گەلێک زۆری دەکەم. هەروەها دەستی ئەو برادەرانە خۆش بێت کە سەبارەت بە بابەتەکە بۆچوونی خۆیان پێ ڕاگەیاندم، بە تایبەت برادەرێکی خۆشەویستم کە لە ناوخۆی ئێرانەوە کە هاوکارییەکی زۆری کردم و هەوڵی لە پێناو سەرچاوە کۆکردنەوە بۆدام.

١. ئەوە گۆرانیی 'بابۆ کوێرئۆغلی' یە بە دەنگی نەمر'مریەم خان' و عوودی نەمر 'محەممەد عارف جزیری' لە سەر یوتیووب:

https://www.youtube.com/watch?v=dYI5f1uf1as

هەمان بەند لە سەر ساوند کلاود:

Babo Kwer-ughli.ram

ئەوەش دەقی گۆرانییەکەی 'مریەم خان' بە تیپی لاتینی:

**Bavê Koroxlî**

De hêê...

wezê bi diyarî Mûşa şewtî ez ketim nav vî dara, de wezê bi diyarî Mûşa şwitî diketim nav vî dara, ax

De bejina babê Koroxlî bejina wê şikan û şapikan û çîtara
De têlxirafekê vî bavê Koroxlî vê sibê hatî çil hezara
Perîşanê bi sê denga li Perîxanê dikir gazî
Digo xweyêkê pora serê min û te bi qur bê
Derbeka lê dane li babê Koroxlî
Ay bi sê gula li binya çiyayê birîndara
Ay de babo, wey babo wey babo

De waxawo tu axayî, tu gula mala E´merî

Ay tu çira mala Temerî, tu berxê mala Xêlidî, tu serkanê peyayî, ay tu berdevkê dewleta Alî Osmanî,

Ax de babo wey babo, wey babo wey babo

De hê, hê ê...
Wezê bi diyarî Mûşa şewitî diketim navî genim
De ezê bi diyarî Mûşa şewitî diketim nav genime
De dibê, têlxirafek ji bavê Koroxilî re vê sibê
hatî wezê nizanim çima
Perîşanê bi sê denga li Perîxanê dikir gazî
Digo xweyêkê pora min û te bi qur bê
De wekî roja li bavê Koroxilî lêdiqewimî
Ay li pêşiya siwarê motka
Mîna serkarê Çengîzxan disekina
Ay babo, wey babo, wey babo, wey babo

٢. نەمر' ئایشێ شان' یش هەمان بەندی مریەم خانی گوتۆتەوە:

https://www.youtube.com/watch?v=jqc98N7Slpw&index=146&list=PLNIHOWeXbOJeJiqcprESkVFrqDe5hyckV

ئەوەش دەقی گۆرانییەکەی ئایشێ شان بە تیپی لاتینی:

**Bavê Koroxlî**
Le hêêê…
Eezê bi diyarî Mûşa şewitî ketim lê nêvî(nava) dara
Wezê bi diyarî Mûşa şewitî ketim nêvî dara
De bejna bavê Koroxlî fena darçinara
Yadê rebenê vê sibekê telxirafek hatî
Ji Bavê Koroxlî nizanim çima?
Minê xeberkê girtî Bavê Şûkrî ji li kozika bilind
Bi sê gulê darê Modelî ye birîndar e
Ax de wey babo, wey babo, wey babo....
Tu gula mala Emer î, tu beranê mala Temer î
Tu dewleta ber destkê Alî Osmanî(3)
Wey de bavo, ay de bavo, ay de bavo

Le hêêê...
Perîxanê bi sê denga dikir gazî, digo:
Xwekê korê, serê min û te bi qûr(kur) bî

De wexta şerê li Babê Koroxlî diqewimî
Fena siwarê Motka(4) li ser darê têlê bi xwe disekinî
Wey bavo(babo), ay de bavo, ay de bavo

له ساڵانی دواتر تا سەردەمی ئێمەش، ناوی کوێرئـۆغڵی و پێداهەڵگوتنی کەسایەتییەکەی، لە ناو کوردانی باکوور و ناوچەی ئاخێوەران بە کرمانجی ژووروودا هەر باو بووه.

٣. ئەوه بەندی باڤێ کوێرئۆغڵی به دەنگی هونەرمەند 'جەمیل':

https://www.youtube.com/watch?v=KCjg6xpkMts

٤. ئەوەش بەندی بابۆ کۆرئۆغڵی به دەنگی هونەرمەند 'مەتین بارلیک' لە سەر تەلەفیزیۆنی تەرەته ٦ ی تورکیا:

https://www.youtube.com/watch?v=GpPpmBpoBK8

کارەکەی من له پەیوەندیی کوێرئۆغڵی و مۆسیقادا، گەلێک ناتەواو دەبێت ئەگەر ئاماژه بە شاکارەکەی ئوستاد 'عوزەیر حاجی بەگۆڤ' هونەرمەندی ناوداری ئازەربایجانی بە ناوی 'ئۆپێرای کوێرئـۆغڵی' نەکەم کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بەرهەمی هێناوه و ناوی کوێرئۆغڵی لە چوارچێوەی بەرتەنگی فۆلکلۆر هێناوەته دەرەوه و ئاوێتەی هونەری مۆدێرن کردووه. سەد بریا هونەرمەندانی مۆسیقاری ئێمەش بۆ بەیتی وەک دمدم و لەشکری و خەج و سیامەند و سەیدەوان و.... کاری هاوچەشنیان بکردایه.

ئەوه ئۆپێرای کوێرئۆغڵی ی عوزەیر حاجی بەگۆڤه لە سەر یوتیووب:

https://www.youtube.com/watch?v=wDgQ6DzCo98

## سەرچاوەیەکی دیکه سەبارەت بە 'کوێرئۆغڵووی کورد'

ئەم وتارەی خوارەوه ڕێزدار د. کامران ئەمین ئاوه بۆی ناردووم و بۆ ئەم کاره باشەی سپاسی زۆری دەکەم. وتارەکە لە بنەڕەتدا بە زمانی ڕووسی نووسراوه و پاشان به هۆی بەرنامەی تەرجەمەی کەمپیوتەرییەوه وەرگەڕاوەته سەر ئینگلیزی. دیاره تەرجەمەی ئینترنێتی زۆر تەواو نییه بەڵام لای کەم کەسێکی ڕووسی نەزانی وەک من کەم و زۆر لە ناوەرۆکی وتارەکە تێدەگات. کاک 'لەتیف مەمەد' ی نووسەری وتار، کە دەبێ لە کوردانی کۆماری

ئازەربایجان یان ئەرمەنستان بێت، لێرەدا هەوڵی داوە کەسایەتی کوێرئۆغلوو لە مێــژووی خــەباتی گــەلی کــورددا بخاتــە بــەر لێکۆڵینــەوە و ئــەوە کــارێکی سەرنجڕاکێشە. نووسەر ئـەو بەڵگەیـەی شـی کردۆتـەوە کـە حکوومـەتی تورکیـا دەڵـێ هـی ناوچـەی 'بۆلـوو' ی تورکیایـە و گوایـە تاڵانچییـەتی کوێرئـۆغلی لـەو هەرێمـە دەردەخـات. بـە بۆچـوونی مـن ئەگـەر ئـەو بەڵگەیـە ڕاسـتیش بێـت و کوێرئۆغڵی لە دەوروبەری ئانکارا شـەڕ و خـەباتی کردبێـت، دیسـانەکە نـاتوانێ پیشاندەری ئەوە بێت کە خەڵکی ئەوێ بووبێت. لەوانە گرنگتـر، لـەتیف مەمـەد 'بزووتنــەوەی جەلالییــەکان' ی وەک بزووتنەوەیـەکی کـوردی ناسـاندووە و لـەم ڕێگەیەوە پەیوەندیی کوێرئۆغڵی و کوردی دەرخستووە¬ ڕاست ئەو کارەی وا من لێرەدا هەوڵمداوە بیکەم.

بە بابەتەکەی کاک لەتیف مەمەد، کۆتایی بە وتارەکـەم دەهێـنم و گـەلێک هیوادارم بەم لێکۆڵینەوە بێ غەرەز و بێلایەنانەی خـۆم هەسـتی کەسـم برینـدار نـەکردبێت و مـافی هـیچ گـەلێکم پێشـێل نـەکردبێت. ئـەوە تـەنیا بۆچوونـە و پێکەوە بەستنی زنجیرەیەک زانیاری و دەرهێنانی سەنتێزێک لەوانە، کە پیشـان دەدات دوور نییە کوێرئۆغڵی و 'دەلی' یان دێوانەکانی دەوروبەری ئـەو، کـوردی جەلالی بـووبێتن و 'چـەنلی بێـل' ی شـوێن و پێگـەی خەباتیشـیان لـە ناوچـەی قوتووری ناوجەرگەی هۆزی جەلالیدا بووبێت:

**On personality of Koroghlu**
**in the national liberation movement of Kurdish people**
**Latif Mammad**

Thus, from original sources and further research of modern historians is clearly seen the obvious fact that all the leaders of the \ "dzhalaliytsev \" among the most famous were just Kurds, among them, and named the eponymous hero of a well-known epic \ "Koroghlu \". It is noteworthy that the name Koroghlu all the sources are closely linked precisely with the movement of \ "Jalal \ 'that is the Kurds, and his own written sources was referred to as Jalali Koroghlu (6, 190-192; 8, 1224 -130, 2, 192-193, 9, 3, 94, 95, 498).

In the Turkish State Archives also remained reliable information about the identity of Koroghlu. The decree of 1560, addressed to Governor Bola (main enemy Koroghlu in all versions of the epic - Bola-bek) and kadiyu Sandzak Gerede said \ "of the atrocities committed by Koroghlu, which should be caught and punished under the law \". This decree also states that Koroghlu \ "led with a beautiful teenager named Eyvaz \". In other archival documents dated 1579-1581 years. There is evidence of that \ "the governor Bola reward the liberation caught Koroghlu \".

The decree of 1581, addressed to the governor Gerede, we are talking about Koroghlu Rovshan to head a \ "gang of robbers, \" which in 989 (1581), the looting between Gerede and Bolu. From these documents it is known that during this period Koroghlu known as \ "Jalali, \" continued its activities in 992 (1584) year, but military officials and Cadia fear hid his case. Finally, in documents from 1593 to 1595 years. Addressed to the governor Ichel, there is information about the rebellions dzhalaliytsev among them to name Koroghlu. All those documents have information on companion Koroghlu: Hasan-bek, Gizir oglu Mustafa Beke, Demirchi oglu and others (8-118). Thus, documents the information Koroghlu as a historical figure from 1560 to 1596 years. Actions Koroghlu did not extend beyond the South-East Anatolia Project (which includes all the northern, Turkish part of Kurdistan) and the territory of Southern Azerbaijan (McHugh, Hoy SALMAST, where the second half of XVI century to the present time the vast majority of the population of these areas are precisely the Kurds .

On the territory of Kurdistan and its surrounding areas with a Kurdish majority, or at locations where once lived the Kurds, and to this day live

popular rumor has kept a lot of homonyms that are directly related to the name of his illustrious son and a favorite character: Mountain Chanlibel (Chamlybel ), which was placed the main headquarters Koroghlu and his squad is near the ancient Kurdish city of Malatya on the main road Tokat, Sivas. There is also a wonderful taste of spring \ "Koroghlu \". Near the town of Kars to the northern Kurdistan region is a mountain \ "Koroghlu \". His name is linked many fortresses near the towns of Maku and SALMAST. On the territory of \ "Red Kurdistan \" (1923-1931 gg.) In Northern Azerbaijan, and to this day are preserved: in the Lachin district in a Kurdish village Zeyva - \ "Rock Koroghlu \"; near the village of Dzhagazur a lump called \ "podkovny stone Gyrata \"; another huge chunk of the plain Azoyug in Zangelan district is also connected with his name and said, \ "Stone Koroghlu \"; in Kalbadzhara near the pass \ "Gyuzgyu \" on the road, Haji-Kent - a Kalbadzhar from the mountains also called \ "Koroghlu \"; in other places of North Azerbaijan are also homonyms, associated with the name Koroghlu, but they are mainly concentrated where it is the Kurds have lived for centuries.

Azerbaijani scientist Mamedov wrote that \ "the names of forts and settlements named Koroghlu likely formed in connection with the placement of one of Selcuk Oguz tribes \" karygly \ "and was seen by the people in connection with the name of national hero Kehr oglu \ "(10-122). Taking into account the fact that the flow in Azerbaijan, the Oghuz Seljuk tribes began in the IX-XI centuries. And Koroghlu lived and worked in the second half of the XVI century, this version Mammadov seems less convincing. The more so because in all versions of \ "Karabahnameler \", written by different authors, none of them mentioned among their tribes, who lived sometime in the Karabakh Khanate, which was part of the territorial and later, \ "Red Kurdistan \" does not list the tribe karygly that, and could in their environment to keep related toponymy. All of the above gives us grounds to conclude that the homonyms, associated with the name Koroghlu are purely Kurdish ethnic origin.

The age-old struggle of the Kurdish people against their oppressors is reflected in the famous epic, the legend of Koroghlu. In it, as in any epic \ "plausible fiction is closely interwoven with artistic and religious rethought historical facts, tribes and nations personified, becomes a significant long time, and place hard - lying on the edge of the world, people and events are often grouped under the laws of artistic creation, designed to identify the

inner meaning of historical processes \ "(11-12). The absence of statehood, poor writing and assimilation processes have led to the fact that Pearl Kurdish folklore shamelessly appropriated and became the property of other nations, and the glorious sons and daughters of the Kurdish people - poets, writers, scientists, military leaders and others, \ "marked \" God, people of Kurdish origin \ "is assigned to \" neighboring nations, or at best, became the \ "people of Kurdish origin \.

And the same fate befell the fate of the Kurdish national epic \ "Koroghlu \". Even in the mythological dictionary (Moscow, 1990) in \ "The Kurds \" mentions only one article (\ "Koroghlu \"), and in the article itself as \ "the hero-warrior, poet, singer, musician, central character of the epic of the same name \ "The Kurds are listed after \" Azeris, Turks, Turkmens, Uzbeks, Kazakhs, Karakalpak, Tajiks, Arabs, Central Asian, Georgian, \ ". Not to mention more about how our Kurdish folk legends and myths are listed in the neighboring nations.

The famous Russian ethnographer I. Chopin from 1828 to 1834 carried out a desk description \ "Armenia and Nakhichevan region, \" as a state councilor, chairman of the management of income and state property of the Armenian region in which he gives details of more than 44 Kurdish tribes (23 ). During his field work among the Kurds, he recorded some of the Rock a few episodes of Koroghlu. Even the name can be judged from the fact that Omar was a Sunni, the Shiites of their children the name of the Arab Caliph Omar ibn al-Khattab (581/591-644), in-law and close friend of the Prophet Muhammad did not call.

And the name is widespread it is among Sunni Muslims, including Kurds. Even the Russian ethnographic tradition XVII-XIX centuries. celebrated the religious affiliation of Kurdish tribes term \ "omarevaya sect \". And among the Azerbaijanis who profess Shi'ism, the name \ "Omar \" - an extremely rare phenomenon. I. Chopin collected materials were published in 1840 in St. Petersburg in the book \ "beacon of modern education and enlightenment \". Preface to the text was written by A. Hodzko. With their light hand song-tales \ "Persian robber \ 'were translated into French by the famous writer George Sand, and then into German, Hungarian and other languages. Both Russian scientists - J. Chopin and A. Hodzko - Taking Koroghlu a historical figure, we have not recognized it, \ "Tatar-Turk \ '. Real name Koroghlu - Rovshan in Kurdish means "Light, Bright, \" and literally, within the meaning is similar to Russian \ "Svyatoslav \" very

widespread among the Kurds their own man's name. Widespread and female names Rushan, Rush, Rushin, Rushirin etc. Many mistaken for Turkic and the word \ "ker \," just not the Kurds. In the Kurdish language, the word \ "mountain \" (\ "core \") means "blind \". \ "Gore \" - also means "grave \", \ "another world \". The dictionary, compiled by the Arab scholar Abu Haiyang XIII century al-Andalus the word \ "blind \" the Turk is listed as \ "kozsyuz \" (12-48). It is well known that the modern Turkish-Azeri language was developed by Iranian (Persian, Kurdish) and Arabic. Russian scientist Vladimir Legkobytov wrote that \ "the language of Transcaucasia is called \" Turkish \ "... has been enriched by Arabic and Persian words (13-305). Therefore, only the prefix \" son \ "nickname Rovshan \" Koroghlu \ "Turk is little reason to assume.

Attract attention and names of famous horses Koroghlu - Gyr-ata and Dur-Ata - who gave them the father Koroghlu - Alo / s. In Kurdish gir (GAD) means "tar, pitch, tar, \" which is in the form of \ "gyr \" passed to the same value in the Azeri language and is widely used in common parlance, although it is absent in three volumes, \ "the Russian-Azerbaijani dictionary \ "(Baku, 1991). For this reason, some Azerbaijani sources under the name of the horse can see his suit and try to translate it as \ "Black Horse \", although in all versions of the epic there is no information about the suit horses. All this is in contradiction with the plot feature film \ "Koroghlu \", shot by Azerbaijani cinematographers, where Koroghlu prance on his horse Gyrate fiery red suit. In all variants of the epic Rovshan-Koroghlu on the instructions of his father's horses, both locked in a dark stable, but the 39-day confinement shows intolerance and violation of this word to his father, punched through a wall slot glanced at the horses. As a result, the penetration of sunlight into the stable one of the horses lost their fiery wings.

This horse subsequently was named \ "Gyrat \". So in the Kurdish language gir means "flame, fire \" (29-548) and in the Kurdish version of the horse named \ "Flame \". Name of the second konya also translated with only a Kurdish: \ "Dur \" (Dur \ ") - means pearl (29-278); duretirs (i) means" courage, fearlessness \ "(29-282), so the correct translation would be \ "brave \". The foregoing gives grounds to conclude that the names of horses Koroghlu have Kurdish names, and translators to distinguish horses from other nouns, have added their names Turkic \ "am \" (the horse).

In all versions of the Azerbaijani version of the epic Koroghlu calls itself the genus (tribe) \ "muradbeklu \", and Azerbaijani scientists by the

word tend to see a particular locality, but can not locate it on some areas. Among the Turkic tribes and there is no tribe of that name. For the Kurds, the characteristic is that they always emphasize their tribal affiliation, or those of others. For example, a great Kurdish poet of XVIII century Heyran Khanum, daughter of Karim Khan Dumbuli, thanks to her surviving poetry, which speaks of her membership in a Kurdish tribe dumbuli been restored, as they say in their national rights.

Murad tribe, they belong to which emphasizes Koroghlu, belonged to the powerful tribal confederation \ "Jaf \ and the area occupied by cities Baneh, Marivan, Senendzh in the Iranian part of Kurdistan and Sulaymaniyah with headquarters in Halabja in the Iraqi part of Kurdistan. Jafar lived in Dzhafanrude, and the very name of the district as etymologized Dzhafanrud (\ "river Jaf \"). This tribe of its power was competing with ardelanskimi princes in their struggle for independence with weapons in the hands of defending their sovereignty and fought with both ardelantsami, and with the Shah regime. On this tribe Kurdish historian beginning of the XIX century Khusraw ibn Muhammad Bani Ardalan wrote as follows: \ "... has raided the Mahidasht, Shahrizur and Arabistan and started looting the head of the tribe Bahram Jafar-bey ... he considered himself the second Rustam, but the world did not put any in that. He did not hide their rebellious ideas, and before him did not see anybody ... (he) lifted its self-will and deeds caught up with the path of obedience valiem ... blocked ... tax collector, he sent, leaving only a small portion of taxes and tributes, until it refused to give and this mallness of divanskih taxes \ "(14-173).

In 1914, Jaf tribe residing in Halabja led famous for its beauty, enlightenment and wisdom Kurdish princess Adil Khanum, which with undisguised admiration wrote many European scientists, including VF Minorsky. Therefore pride Koroghlu for belonging to such tribe, race is an understandable feeling.

Kurdish tribe of Murad (muradbeklu) in the sources found in the form of \ "Muradkhanli \". This is a tribe in 1586 of twenty-four Kurdish birth under the Turkic name \ "Igirma Dort \" lived in the district of Ganja and Barda in northern Azerbaijan, \ "Arranskom Karabag \" - as he wrote SH Bidlisi (7 - 370). Muradkhanli tribe with tribe Sher and other Kurdish clans in 1806 amounted to about 6,000 families, which makes it more or less definite idea of the strength and power of this tribe (21-391).

